# ديموكراسی و فيدراڵيزم

## (كۆمەڵە وتار)

**وەرگێڕان: مهدی مهرپەروەر**

**هەولێر - ٢٠٠٩**

دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی

- **ديموكراسی و فيدراڵيزم (كۆمەڵە وتار)**
- نووسينی: كۆمەڵێك نووسەر
- وەرگێڕانی: مهدی مهرپەروەر
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (٥٢٢)
- نرخ: (٢٠٠٠) دينار
- چاپی يەكەم : ٢٠٠٩
- تيراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی كتێب (٣٧٠)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئيمەيل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# دیموكراسی چییه؟

## -١-

چەمكی دیموكراسی زۆر لەوە ئالۆزترە كە بیری لێ دەكرێتەوە، چونكە مەبەستێك كە بیژەرەكان و نووسەران لە بەكارهێنانی بوویانە و هەیانە، لەگەڵ پێویستی و داخوازییەكانی سەردەم و بارودۆخی هەرقوناغێك جیاواز بووە. دیموكراسی وەك زۆربەی چەمكەكانی دیكە، پێناسەیەكی ئاڵۆزی هەیە، هەربۆیە، پێناسەی هەركەس لە دیموكراسی دەتوانێ جۆری روانگەی ئەو ئاشكرا بكا، "لیپست" سەبارەت بە دیموكراسی پێی وایە :"پێناسەی چەمكێكی ئاڵۆزی وەك دیموكراسی بەناچار بنەمایەكی فەرهەنگی هەیە، ئاشكرایە كە روانگەی لایەنگرێكی یەكیەتی كرێكاران لە ئەوروپای ناوەندی لەگەڵ روانگەی جووتیارێكی باشووری بیابانی ئەفریقیا، كە داهاتێكی نەمرنەژییان هەیە، جیاوازە. ئەم پێناسانە بەستراون بە مێژوو، بۆ وێنە، هاووڵاتییانی ئەو وڵاتانەی كە دوای ١٩٤٥ لە دڵی كۆلۆنیاڵیزم هاتوونەتە دەرێ تێڕوانین و ناسینیان لە دیموكراسی بەجۆرێكە لەگەڵ تێروانین و ناسینی هاووڵاتییانی وڵاتە كۆنەكان جیاوازی هەیە و پێناسەی هەر تاكێك لە دیموكراسی لە چەندین هۆكاری دیكە كاریگەری وەردەگرێ.

دیموكراسی لە وشەی یۆنانی دیموس (واتە گەل، خەڵك) و كراتۆس (واتە دەسەڵات) وەرگیراوە. دیموكراسی یەكێك لە جۆرەكانی دەسەڵاتە و بەرچاوترین خاڵی راگەیاندنی فەرمی ئەسڵی پێرەویكردنی كەمایەتییە لە زۆرینە و بەفەرمی ناسینی ئازادی و مافی بەرانبەری خەڵك و هاووڵاتییان. دیموكراسی لەو كاتەوە كە پریكلس، وەك "حكوومەتی خەڵك" پێناسەی كرد، هەتا ئەمڕۆ كە لە كۆمەڵگای جیاوازی داڕێژەرانی تیوری رۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریكا، پتەوكردن و پەرەپێدانی ئەو وەك كاری



بنەرەتی و تایبەتی دەوڵەت چاوی لێدەكرا، گۆڕانكاری زۆری بەخۆوە بینیوە. ناتوانین دیموكراسی بەجیا لە هەلومەرجی ئابووری و كۆمەڵایەتی ژیان تاوتوێ بكەین، دەبێ بارودۆخی راستەقینە و بەكردەوەی كۆمەڵگا لەبەرچاوبگرین. لەڕاستیدا هەر دیموكراسییەك وەك شێوازێك لە رێكخراوی سیاسی و كۆمەڵایەتی، لە دوایین لێكدانەوەكانیدا خزمەت بەشێوەی بەرهەمهێنانی دیاریكراو دەكا و لەلایەن ئەوەوە دەستنیشان دەكرێ.

ناوەرۆك و شێوازی دیموكراسی بەدرێژایی مێژوو پەرەی ئەستاندووە و بەردەوام و بەتەواوی بەستراوە بە فورماسیۆنی كۆمەڵایەتی ـ ئابووری پەیوەندیدار بووە.

**دیموكراسی چییه؟**

* ئایا دیموكراسی حكوومەتی خەڵكە؟
* ئایا دیموكراسی حكوومەتی نوێنەرانی خەڵكە؟
* ئایا دیموكراسی بڕیاردانی خەڵكە؟

"كارڵ پۆپەر" فەیلەسووفی هاوچەرخ دەڵێ دیموكراسی هیچ كات حكوومەتی خەڵك نەبووە نە دەتوانی ببێ و نە دەبێ ببێ. ئەمە مەترسیدارە كە فێری خەڵك بە تایبەتی منداڵان بكەین كە دیموكراسی بەمانای حكوومەتی خەڵكە، واتە حكوومەتی هەمووڵایەك، كە ئەمە دوورە لە راستی و كاتێك خەڵك لە راستی مەسەلەكان تێدەگەن، هەستدەكەن فریویان خواردووە و ئەم هەستە دەتوانێ تەنانەت تیرۆریزمی لێ بكەوێتەوە.[١]

بەڵام من لەگەڵ بەشی كۆتایی بۆچوونی "كارڵ پۆپەر" فەیلەسووفی هاوچەرخ نیم. ئەگەر وای دابنێین كە تێگەیشتنی راستییەكان لە قۆناغەكانی دوایی ژیاندا، مرۆڤەكان هیوابڕاو دەكا و بەرەو تیروریزم هانیان دەدا، بەم پێیە رێژەی تیرۆریستەكان لە غەیرە تیرۆرستەكان زیاتر دەبێ. چونكە بۆخۆمان، بە كورتی كات و شوێن، بارودۆخ و پێداویستییەكان و راستییەكان هەموویان لە حاڵی گۆڕانكاریدان. مرۆڤی پێگەیشتوو بە كەسێك دەڵێن كە بەردەوام لە رێڕەوی ئاڵوگۆڕ و پەرەسەندن و نوێ بوونەوە نەوەستێ. ئەمە راستە كە دیموكراسی هیچ كات حكوومەتی خەڵك نەبووە و

نە دەتوانێ ببێ و نە دەبێ ببێ. چونکە خەڵك چەمکێکی گشتییە. ئەگەر دیموکراسی حکوومەتی خەڵکە، ئایا نزیك بە یەك ملیارد هیندوستانی لە هیندوستان دەسەڵاتیان بەدەستە؟ ئەم یەك ملیاردە لانیکەم بەسەر کام یەك ملیاردی دیکەدا حکوومەت دەکەن؟ ئایا ئەو خەڵکەی کە حکوومەت هەڵدەبژێرێ دەتوانێ سەبارەت بە مەسەلە گرنگەکان وەك سیاسەتی ناوەکی یا گەلاڵەی درێژخایەنی قەزایی یا پێکهێنانی رایەڵکەی بەربڵاو و پڕهەزینەی هەواڵگری و لەو جۆرە نموونانە بڕیار بدەن؟ بێگومان بەم پێیە دیموکراسی حکوومەتی خەڵك نەبووە بەڵکو حکوومەت نوێنەری بەشێك لە خەڵکە. ئەویش نە حکوومەتی نوێنەرانی هەموو خەڵك، چونکە ئەو پاڵێوراوانەی کە بە نوێنەرایەتی بەشێك لە خەڵکی کۆمەڵگا بە ئەجێندای تایبەتی چوونەتە گۆڕەپانی کێبڕکێوە و نەیانتوانیوە لە هەڵبژاردندا سەرکەون، لە حکوومەتدا بەشدار نین.

لەڕاستی دیموکراسی بە مانای حکوومەتی یاسا و خۆپاراستن لەسەرەڕۆییە، بەڵام حکوومەتی یاسا بەبێ دامەزراوە بڕیاردەرەکانی خەڵك دیموکراسی نییە. بۆ وێنە لەگەڵ ئەوەی کە هیتلەر بە دەنگی دیموکراسی زۆرینە بە دەسەڵات گەیشت، بەڵام کاتێك گرنگترین دامەزراوەی بڕیاردانی خەڵك لە ئەڵمان واتە رایشتاکی داخست، کۆتایی بە دیموکراسی لە ئەڵمان هێنا. خەڵك بەگشتی ئاکامی دژوارترین سیاسەتەکان، پاش ماوەیەك دەبینن، لە سیستمێکدا کە دامەزراوەکانی بڕیاردانی خەڵك دەسەڵاتی هەیە، لە هەڵبژاردنی دواییدا، ئەو سیاسەتانە و بەرپرسانی، دەتوانن دووبارە هەڵبژێردرێن یان رەتبکرێنەوە. لە راستیدا بڕیاردانی خەڵك لەسێ بواری یاسادانان، بەڕێوەبەری و قەزایی، مانا و راستی دیموکراسییە، کە لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەڕلەمان و سەرۆك کۆمارەوە بگرە تا هەڵبژاردنی دادوەر و بەشداری لە ئەنجوومەنەکانی هەڵبژاردن و بڕیاردان لەخۆدەگرێ. بڕیاردانی بەردەوامی خەڵك لە ئاستی جۆراوجۆردایە کە کۆڵەکەی سەرەکی هەموو دیموکراسییە مودێرنەکانە و یاسای بنەرەتی دیموکراسی دەبێ بنەما و بەشەکانی ئازادیی دامەزراوەکانی بڕیاردانی خەڵك دیاری، نیهادینە و پشتیوانی بکا.



سەرەڕای ئەم هەموو جیاوازییە لە پێشکەشکردنی پێناسە، دەتوانین تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی سیستمە دیموکراسیەکان لە سیستمە غەیرە دیموکراسیەکان جیابکەینەوە، لەم پەیوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە سێ تایبەتمەندی بکەین:

١ـ کێبڕکێی ئازاد بۆ وەدەستهێنانی بەرپرسیارەتی و کورسییەکانی هەڵبژاردن (پەڕلەمان و ئەنجوومەنەکان لەوانە ئەنجوومەنی شوێن و ...)

٢ـ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی دادگەرانە، بەبێ بەکارهێنانی زۆر یا ناچارکردن و بێ ئەوەی کە هیچ گرووپێك لە کۆمەڵگا بێبەش بکرێن، کە لە قۆناغی دیاریکراودا، بۆ وەدەستهێنانی بەرپرسیارییەتی بەڕێوەدەچێ.

٣ـ بوونی ئازادییە مەدەنی و سیاسییەکان تا سەلامەتی و بەشداریی رێك و پێك و کێبڕکێی سیاسی گرەنتی بکرێ.

لە چەند دەیەی رابردوو لە رۆژئاوادا لە پاڵ دیموکراسی پەڕلەمانی، دیموکراسی بەشداربوون گەشەی کردووە. یەکێك لە دیارترینی ئەم گۆڕانکارییانە ballot intatives بەم مانایە کە بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی ئیمزا دەتوانن بۆنموونە یاسایەکی نوێ بخەنە دەنگدانەوە. لەئاکامدا بێجگە لە شێوازی پەڕلەمانی، ئەمە رێگای دووەمە بۆ یاسادانان بۆ هەرێمێك یا وڵاتێك. گەشەی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت هەلی پەرەسەندنی دیموکراسی بەشداربوونی زیاتر کردووە. فیدراڵیزم پێکهاتەیەکی دیکەیە کە لە بارودۆخێکی لەباردا هاوکاری گەشەی کۆنترۆڵ و هاوسەنگی هێز و لە ئاکامدا پەرەپێدانی دیموکراسی لە وڵاتدا دەکا.

دیموکراسی فەلسەفەی ئایدیۆلۆژییە یا بابەتێکی سیاسییە؟

**١) دیموکراسی وەك فەلسەفە یا ئایدیۆلۆژی**

دیموکراسی وەك فەلسەفە یا ئایدیۆلۆژیا هەڵگری پەروەردەیی لیبراڵیزمە کە دیموکراسی لانی زۆریشی پێ دەڵێن و لەسەر سێ ئەسڵ دامەزراوە:




* ئۆمانیسیم یا  تاکگەرایی

* ئازادی

* بەرانبەری

لەسەر بناغەی ئەم فەلسەفە سیاسییە نوێیە، بنەما و ئەو پەڕی سەرلەبەری بوون، مرۆڤە و ئـەوەی رەسـەنایەتی هەیـە ئـیرادەی مرۆڤـە و تـەنیا بـە هـۆش و زانـست، بەختەوەری مرۆڤ دابین دەبێ. کارڵ دیمۆند پوپر پێی وایـە، مرۆڤـی رەخنـەگر و ئـازاد لەهەرجۆرە بەربەسـتێکی ئاسمـانی لـە ژیـان، مرۆڤێـك کـە بـۆ ئیـدارەکردنی ژیـانی بەکۆمەڵ، بێجگە لە تاکگـەرایی و قـازانج پەرسـتی بـیر لـە بەرژەوەندییـەکی دیکـە ناکاتەوە و سەرچاوەی رەوایی یان مرۆڤی بۆ گرنگ نییە، بابەتی باسی دیموکراسی یـە. دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانیش تەنیا لە خزمەتکردن بە تاك مانـا پەیـدا دەکـا. لـەم روانگەوە مرۆڤ لە هەموو چالاکییەکانی خۆیدا، چ پەیوەنـدی پێـوە هـەبێ و چ نـەبێ، بەردەوام دەبێ وەك ئەو پەری کۆتایی لەبەرچاوبگیرێ. لەم پەیوەندییـەدا لـە روانگـەی کانت، باوکی مۆدێرینتە، هەموو شتەکان نرخی خۆی هەیە و ئەمە تـەنیا مرۆڤـە کـە خاوەنی رێز و پێگەیە. کانت لەم بارەیەوە دەڵێ: " دەبێ وابیربکەیتەوە کـە گەوهـەری مرۆڤایەتی چ لەلای خۆت و یان لە پەیوەندی لەگـەڵ کەسـانی دیکـەدا بـەردەوام وەك ئارمانجێك چاوی لێ بکەی نەك ئامرازێك".[٢]

کارڵ دیمۆند پۆپەر بە ئامـاژەکردن بـەم رسـتەیەی کانـت بـەو ئاکامـە دەگـا کـە رەسەنایەتی تاکەکەس لەگەڵ ئەویترخوازی، بووەتە بنچینەی شارستانییەتی رۆژئـاوا و نـاوکی ناوەنـدی تـەواوی بیروبۆچـوونە ئەخلاقییـەکان لـە شارسـتانییەتی رۆژئـاواوە سەرچـاوەی گرتــووە.[٣] لێــرەدا ئــەویترخوازی تــەنیا بــەمانای ســەلماندنی



ئیگزیستانسیالیزمە. کە پێ لەسەر پاراسـتنی مافـەکانی کەسـانی دیکـە دادەگـرێ. خاڵی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە تاکێکی دیموکراسی، تاکێکی سەرەرۆ نییە.

یەکێکی دیکە لە بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسی لەڕووی فەلسەفییەوە، ئەسـڵی "بەرانبەری"یە بەرانبەری لە ئەسڵدا بەو مانایەیە کە هـەموو مرۆڤـەکان، بـەحوکمی مرۆڤایـەتی خـۆی، بەرانبـەرن و لەیـەکتر سـەرترنین. بـەڵام لـەڕووی سیاسـییەوە، رەسەنایەتی بەرانبەری بەم مانایەیە کە هاووڵاتییـان لـەلای یاسـا و لـەڕووی یاسـا و ئازادییەکان لەگەڵ یەك بەرانبەرن. لەدیموکراسیدا، هاووڵاتییان لانیکەم دەبـێ لـەڕووی یاسـاییەوە بەرانبـەر بـن. بەرانبـەری لـە دیموکراسـیدا، بەرانبـەری هەلەکانـە نـەك دسکەوتەکان. کەسانێك کـە بەشـێوەی بەرانبـەر لەلایـەن یاسـاوە پـشتیوانی بکـرێن دەتوانن لە هەلەکان کە سیستمی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەیرەخسێنێ کەڵك وەرگرن و بەشداری و کێبڕکێ لە ژیانی سیاسیدا بکەن. بە واتایەکی دیکە بەرانبەری، پێویـستی بە نەهێشتنی هەرجۆرە هەڵاواردنێك لە نێوان تاکەکاندا، بەتایبـەت لـەڕووی نـەژادی، نەتەوەیی، رەگەزی، مەزهەبی و بیروباوەڕی سیاسییە.

ئەسڵێکی گرنگی دیکە لە دیموکراسیدا، ئەسڵی "ئازادی"یە. ئازادی لـە دیموکراسـی فەلسەفی هەمان مانا لە زەینیدا دروستدەکا کە لیبراڵیزم هەڵگری ئەوە، واتە ئازادی مرۆڤ لە پیرۆزکردن و شـتە پیرۆزەکـان. ئاکامەکـەی هومـانیزم یـا تاکگـەرایی، بەرانبـەری و ئازادییە سێ پەلی سێگۆشەی دیموکراسی لەڕووی فەلسەفەوە یا ئایدۆلۆژیایە.

**٢ـ دیموکراسی وەك بابەتێکی سیاسی**

دیموکراسی وەك بابەتێکی سیاسی، هەڵگری وانەگەلێکە کە زیـاتر لەگـەڵ مانـای باوی دیموکراسی سازگارە. لەم مانایەدا دیموکراسی شێوەیەکی عەقڵانی، ئەزموون کراو بەکەڵك و کاریگەر لە ژیانی بەکۆمەڵە کە لەسـەر بنـەمای ئەسـڵی "رەزامەنـدی" و "زۆرینە"دایە و بەردەوام لە چوارچێوەی پەیوەندی دەوڵـەت بەتایبـەتی حکومـەت و نەتەوە دێتە بەرباس. بە وتەیـەکی دیکـە بـاوترین مەبەسـت لـە دیموکراسـی هـەمان دیموکراسی سیاسییە کە سەرەکیترین بنەماکانی بریتییە لە:

* ئازادی (ئازادی رادەربڕین، چاپەمەنی، حیزب و کۆبوونەوەکان)
* هەڵبژاردنی ئازاد
* یاسا
* دابەشکردنی دەسەڵات (یاسادانان، بەڕێوەبەری و قەزایی)
* بەشداری

ئەگەر پێنج ئەسڵی سەرەوە لـە ژیـانی سیاسـی هاووڵاتییـانی کۆمەڵگایەکـدا بەکردەوە بوونی ببێ، دەتوانین باس لە بوونی دیموکراسی لەو کۆمەڵگایەدا بکـەین. بە وتەیەکی دیکە ئەو کۆمەڵگایانەی کە خاوەنی دامەزراوە ئازادییەکانی بڕیاڕدانی خەڵك نییە هیچ کات ناتوانێ باس لە دیموکراسی بکا، ئەگەر باسیـشی بکـا، دوور لە راستییە.

هەندێك لـە بیرمەنـدان، دیموکراسـی وەك هـەلی هێنانـە سـەرکار، رەخنـەگرتن و لابردنی ئاشتیخوازانە (بەبێ توندوتیژی و خوێن رشتن)ی دەسەڵاتداران پێناسە کردووە. ئەم پێناسەیە، پێناسەیەکی روونە، کە لەم پێناسەیەشدا پێـنج تـوخمی ئامـاژەپێکراو هاتووە. لەم روانینە سیاسییەدا بۆ دیموکراسی، دەستاودەستکردنی، ئاشـتی خوازانـەی دەسەڵات و بەرتەسککردنی دەسەڵات بە خواست و ئیرادە و بەرژەوەندی گـشتی دێتـە بەرباس، نە پێناسـەیەکی کلێـشەیی ئابراهـام لینکـۆلن کـە پێـی وابـوو دیموکراسـی "حکوومەتی خەڵك بەسەر خەڵك لەلایەن خەڵك"ەوەیە، چونکە ئەم پێناسەیە تەنیا لە مێژووی یۆنانی کۆن و دیموکراسی راسـتەوخۆی ئـاتن (ئەسـینا)یـی مانـای هـەبووە و لەگەڵ جوغرافیای سیاسیی ئەمڕۆ سازگار نییە و هەلی جێبـەجێکردنی نییـە. ئـەمڕۆ هەرکات باس لە دیموکراسی دەکەین وانە گەلێکی زۆر خۆ دەردەخەن، وانەگەلێك وەك: دەسەڵاتی بەرتەسکی دەسەڵاتداران، پـەیمانیبوونی دەسـەڵاتداری، هەڵبـژاردنی ئـازاد، ئازادییە کۆمەڵایەتییەکان، دابەشکردنی دەسەڵات و دابینکردنی سەربەخۆیی دەزگـای قەزایی، دەسەڵاتی یاسا.(٦)



## سەرچاوەکان

١- کارل پوپەر، درسهای این قرن، ١٩٧٧

٢- بهرام محبی، قانون آزادي، حکومت جمهوری و صلح جاودان (نگاهی به فلسفه سیاسی ایمانوئـل کانت)، سیاست اینترنتی ایران امروز بەنشانی، IRAN EMROOZ. DE مورخ ٨٢/٨/٨

٣- کارل پوپەر، جامعه باز و دوشمنـان آن، ترجمـه عـزت اللـه فولادونـد (تهران،خـوارزمی ١٣٦٤ـ ١٣٦٩)

٤- رامین جهانبگلو، تفاوت و تساهل، (تهران، مرکز،١٣٨٠)

٥- حسین بشیریه، درسهای دیموکراسی برای همـه (مبـانی علـم سیاسـت)، (تهـران: موسـسه پژوهشی نگاه معاصر، ١٣٨٠)، ص ٣٣ و ص٣٤.

٦- امیر دبیری، دیموکراسی از نظر کارڵ پۆپەر، روزنامه همشهری ٨٢/١١/٨

# پێشەکی

ئەگەرچی لە دونیای ئەمڕۆدا "دیموکراسی" وشەیەکی باوە، پێناسەکەی دەتوانێ جێگای راڤەکردن بێ. ئەم زنجیرە بابەتە سەرەتا بە نیشاندانی دیمەنێکی گشتی بە خوێنەر دەستپێدەکا، پاشان پێکهاتە تایبەتییەکانی حکومەتێکی دیموکراسی لە بابەتگەلی جیاوازدا دێنە بەرباس، هەر یەك لەم بابەتانە، رەنگدانەوەی بیروبۆچوونی زۆربەی بیرمەندان و هەروەها شێوازە باوەکان لە زۆربەی کۆمەڵگا ئازادەکانە کە هەر ئێستا لە سایەی سیستمەکانی حکومەتی دیموکراسیدا گەشەیان کردووە.

دیموکراسی لە وشەی یونانیی "دیموس" وەرگیراوە، بە مانای خەڵکە. لە حکوومەتەکانی دیموکراسیدا، ئەوە خەڵکن کە بە سەر یاسادانەر و دەوڵەتدا حکوومەت دەکەن.

ئەگەر چی جیاوازییەکی کەم لە نێوان حکوومەتە دیموکراسیەکاندا دەبینرێ، هێندێك یاساو شێوەی تایبەتی، دەوڵەتە دیموکراسیەکان لە گەڵ دەوڵەتەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

# بنەماکانی دیموکراسی

**دیموکراسی چییە؟**

دیموکراسی لە وشەی یونانی "دیموس" بە مانای خەڵك وەرگیراوە لە حکوومەتە دیموکراسیەکاندا، ئەو خەڵکە بە سەر یاسا دانەرو دەوڵەتدا، حکوومەت دەکا.

ئەگەر چی جیاوازییەکی کەم لە نێوان حکوومەتە دیموکراسیەکاندا دەبینرێ، هێندێك بنەما و شێوەگەلی تایبەت، دەوڵەتە دیموکراسیەکان لە گەڵ دەوڵەتەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

دیموکراسی سیستمێکە کە تەواوی هاووڵاتیانی، چ راستەوخۆ چ ناراستەوخۆ لە رێگایی نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خۆی، لە دەسەڵات کەڵك وەدەگرن و ئەرکی مەدەنی خۆیان بەرێوە دەبەن.

دیموکراسی کۆمەڵێك لە بنەماو شێوازە کە پارێزگاری لە ئازادیی مرۆڤ دەکا، دیموکراسی نیهادینە بوونی ئازادییە.

دیموکراسی لە سەر بناغەی حکوومەتی زۆرینە و پاراستنی مافی تاکەکەسیی و کەمینەدا دامەزراوە.

دیموکراسییەکان سەرەرای رێزدانان بۆ خواست و داوای زۆرینە، پارێزەری بێئەم لاو ئەولای مافی بنچینەیی خەڵك، هەروەها گرووپە کەمینەکانە.

دیموکراسییەکان چاودێری پێکهاتنی دەوڵەتە ناوەندییە بەهێزەکانن و بە ئامانجی کۆ جێنەبوونی دەسەڵات، ئەوان دەگەیەنێتە ئاستی هەرێمەکان و ناوچە خۆجێییەکان بە تێگەیشتن لەوەی کە دەوڵەتە خۆجێییەکان دەبێ بەپێی توانا وەڵامدەری خەڵك بن.



دیموکراسییەکان دەزانن کە یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانیان، پارێزگاری لە مافی سەرەتایی وەك ئازادی رادەربڕین، ئازادی ئایین، مافی سوودمەندبوون لە پشتیوانی یاسا و هەلی رێکخستن و بەشداریی تەواو لە کاروباری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی کۆمەڵگایە.

دیموکراسییەکان بە شێوەی رێك وپێك هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە بەرێوە دەبا کە هەموو هاووڵاتییان مافی بەشداری کردنیان هەیە. لە دیموکراسییەکدا، هەڵبژاردن ناتوانێ روخسارێکی رواڵەتی بێ کە دیکتاتورەکان یان حیزبێکی تایبەت لە پشتیدا خۆبشارێتەوە، بەڵکو هەڵبژاردن کێبەرکێیەکی راستەقینەیە لە سەر پیشتیوانی خەڵك.

دێموکراسی، دەوڵەتەکان ناچار دەکا و دەزگایەکی یاسایی پارێزگاری لە مافەکانیان دەکا.

دیموکراسییەکان جیاواز لە یەکترن و هەریەك لەوانە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی تایبەت بە نەتەوەی خۆی نیشاندەدا. دیموکراسییەکان هەموویان لە سەر بناغەی کۆمەڵێك یاسای بنەرەتی دامەزراوە، نە لە سەر بناغەی شێوەگەلی یەکسان.

لە حکوومەتێکی دیموکراسیدا، هاووڵاتییان نە تەنیا مافیان هەیە، بەڵکو ئەرکی سەر شانیانە کە بەشداری لە سیستمە سیاسییەکاندا بکەن کە لە ماف و ئازادییەکانیان پارێزگاری بکەن.

کۆمەڵگا دیموکراسیەکان پابەندی بایەخەکانی وەك دان بەخۆداگرتن، هاوکاری و بە تەنگەوەهاتنە. دیموکراسییەکان تێگەیشتوون کە دەست راگەیشتن بە رێکەوتن، پێویستی، بە تەنگەوە هاتنە، هەروەها رەنگە هەموو کاتێك رێکەوتن بە ئاکام نەگا، بە وتەی "ماهاتما گاندی، تەحەمموول نەکردن بۆ خۆی جۆرێك توندوتیژییە و کۆسپێکە لە رێگای پێکهاتنی باوەڕێکی دیموکراسیی راستەقینە".

## حیزبە سیاسییەکان

بۆ پارێزگاری و پشتیوانیی لە ماف و ئازادییەکانی تاکەکەس، نەتەوەیەکی دیموکراسی دەبێ بە هاوکاری یەکتر حکوومەتی دڵخوازیان دامەزرێنن و ڕێگای سەرەکی دەستڕاگەیشتن بەو ئامانجە، بۆچوونی حیزبە سیاسییەکانە.

- حیزبە سیاسییەکان، ڕێکخراو گەلێکی خۆبەخشن بۆ پێکهێنانی پەیوەندی نێوان خەڵك و حکوومەت، حیزبەکان، پاڵێوراوانێك لەبەرچاو دەگرن و بۆ هەڵبژیرانیان بۆ پۆستە حکومییەکان خەبات دەکەن و خەڵکیی بۆ هەڵبژاردنی ڕێبەرانی حکوومەتی ئامادە دەکەن.

- حیزبی زۆرینە (یان حیزبێك کە بۆ هەڵسوورانی دەوڵەت هەڵبژێردراوە) تێدەکۆشێ کۆمەڵێك پرۆگرام و سیاسەت بە یاسا زیاد بکا. حیزبە ئۆپۆزیسیۆنەکان دەتوانن ڕەخنە و پێشنیارەکانی خۆیان لە سیاسەتی حیزبی زۆرینە بێننە بەرباس.

- حیزبە سیاسییەکان ڕێگایەك بۆ هاووڵاتییان ئاوەڵا دەکەن تا بتوانن بەرپرسانی حیزبی هەڵبژێردراو بە هۆی هەڵسوکەوتیان لە حکوومەت، بخەنە ژێر پرسیارەوە.

- بڕوای حیزبە سیاسییە دیموکراسیەکان بە بنەماکانی دێموکراسی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بۆ دەوڵەتی هەڵبژێردراو، تەنانەت ئەگەر لە حیزبی خۆیان نەبێ ڕێزدابنێن و بە ڕەسمییەتی بناسن.

- وەك تەواوی حکوومەتە دیموکراسیەکان، ئەندامانی حیزبە جۆراوجۆرەکان، ناسێنەری فەرهەنگە جیاوازەکانن کە لەواندا هەڵقوڵاون. هێندێك لەم حیزبانە بچووکن و بە دەور کۆمەڵێك لە باوەڕە سیاسییەکاندا شکڵیان گرتووە. هێندێکی دیکەش لە سەر بناغەی بەرژەوەندیی ئابووری یان پیشینەی هاوبەش ڕێکخراون. حیزبەکانی دیکەش، کۆمەڵێکی ڕێك نەخراو لە هاووڵاتیانی جیاوازن کە لە وانەیە تەنیا لە کاتی هەڵبژاردندا بە دەوری یەکدا کۆببنەوە.



ئاشتبوونەوە و لە سەر خۆیی، لە بەهاکانی تەواوی حیزبە سیاسییە دیموکراتەکان- چ بزووتنەوەکانی بچووك و چ لە بەرەکانی بەربڵاوی خەڵکی- دێتە ئەژمارە حیزبەکان دەزانن کە تەنیا لە ڕێگای کۆبوونەوە گەورەکان و هاوکاری لە گەڵ حیزبە سیاسی و ڕێکخراوەکانی دیکە دەتوانن ڕێبەریی و ڕوانگەیەکی هاوبەش کە ببێتە هۆی پشتیوانی خەڵکی، بەدەستبێنن.

- حیزبە دیموکراسیەکان لە ناسەقامگیری و گۆڕانکاری باوەڕە سیاسییەکان ئاگادارن و دەزانن کە دەنگی هاوبەش، زۆرتر دەتوانێ لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕوانگە و بایەخەکان و لە دیالۆگی ئارام، ئازاد و خەڵکیدا بەدەستبێ.

- ئۆپۆزیسیۆنی پابەند بە یاسا وەك بەشێك لە چەمکە بنەڕەتییەکان حکوومەتی دیموکراسی سەیری دەکرێ.

ئەمە بەو مانایەیە کە لە سیاسەتدا، تەواوی قۆڵەکان- بە هەموو جیاوازییەکانیانەوە- لە بایەخە بنەڕەتییەکانی ئازادی را دەربڕین و باوەڕ بە یاسای بنەڕەتی و سوودمەند بوونی یەکسانی خەڵك لە پشتیوانیی یاسا، هاوبەشن. قۆڵە شکست خواردووەکانی هەڵبژاردن، لە چوارچێوەی ئۆپۆزیسیوندا درێژە بە تێکۆشانیان دەدەن و دڵنیان کە سیستمی سیاسی لە مافی ئەوان بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوەکان و دەربڕینی نارەزایەتی بە شێوەی ئاشکرا، پشتیوانی دەکا. لە کاتی دیاریکراودا، حیزبی ئەوان هەلی خەبات بۆ ڕوانگەکانیان و ڕاکێشانی دەنگی خەڵك بەدەستدێنن.

- لە حکوومەتی دیموکراسیدا، کێبەرکێی نێوان حیزبە سیاسییەکان، شەڕ نییە بۆ مانەوە بەڵکو کێبەرکێیەکە بۆ خزمەت بە خەڵك.

## مافی ژنان و کچان

قایل بوونی هەڵاواردن دژی ژنان بەو مانایەیە کە یاساکان یان دابونەریتی دیاری کراو، لە سەر بنەمای ڕەگەزی، جیاوازی، ڕیزپەڕ یا بەربەستە.

– حکوومەتە دیموکراسییەکان دەبێ لە پێناوی پاراستنی مافی ژنان تێکۆشن، ژنان هان بدەن بۆ بەشداریکردن لە تەواوی بوارەکانی کۆمەڵگا و حکوومەت و شوێنگەلێکیان بۆ دابینبکەن هەتا بتوانن ئازادانە کۆ ببنەوە و روانگە و بۆچوونەکانی خۆیان راشکاوانە باسبکەن.

– مافی یاسایی ژنان بریتییە لە هەڵسوکەوتی بەرانبەری یاسا لە گەڵ ئەوان و دستراگەیشتن بە سەرچاوە یاساییەکان.

* مافی ژنان دەبێ بە ئاشکرا دیاریبکرێ ـ روون نەبوونەوەی پێگەی یاسایی ژنان هەروا یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی هەژارییە لە ئاستی جیهاندا.

* ژنان دەبێ مافی خاوەندارێتی و میراتیان هەبێ.

* ژنان دەبێ هەلی بەشداریی لە داڕشتن و بەڕێوەبردنی یاسای بنەڕەتی و یاسای دیکەیان هەبێ.

مافی سیاسیی ژنان بریتییە لە مافی بەشداری لە هەڵبژاردن، کارکردن لە پیشە دەوڵەتییەکان، بەشداری لە دەسەڵات و رێکخستنی سیاسی.

* سیستمە دیموکراسیەکان دەبێ پشتیوانی بکا لە گەڵاڵەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ـ چ دەوڵەتی و چ نادەوڵەتی ـ کە ژنان لە بواری چۆنیەتی بەشداری لە هەڵبژاردن و شێوازی کێبەرکێی سیاسی و پرۆسەی داڕشتنی یاسا پەروەردە دەکا.

* ژنان و کچان دەبێ دەستیان بە پەروەردەی سەرەتایی رابگا. ئەوان نابێ لە بەشداری یا وانەوتنەوە لە قوتابخانە یا زانکۆکان بێ بەش بکرێن.

* مافی ئابووری بۆ ژنان هەلی چاودێری بە سەر داراییە ئابوورییەکانیاندا دەرەخسێنێ و یارمەتییان دەدا تا لە پەیوەندی پڕ لە مەترسی رەگەزی و ئەگەری کەڵکی خراپ لێوەرگرتن دووركەونەوە. ئەم مافانە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەخۆدەگرێ:

* بارودۆخ و پێڕەوی وەك یەك بۆ دامەزران لە بەراورد لە گەڵ پیاواندا.

* لە بەرانبەری هەڵوەشانەوەی دامەزرانیان بە هۆی دووگیانی یا پێکەوە ژیانی هاوبەش بپارێزرێن.



* بەشدار بوون لە پروگرامگەلێك وەك وەرگرتن قەرز بە مەبەستی پێکهێنانی کارو پەروەردە کردنیان لەو پیشانەی کە بۆ ژنان هەلی بەدەستهێنانی داهات دەرەخسێنێ.

* مافی بەشداری بوون لە داهات، هەڵسوکەوت و رێزی یەکسان لە شوێنی کاردا. سیستمە دیموکراسیەکان دەبێ بۆ وەدەستهێنانی دڵنیایی لە تەندروستی و ئاسایشی ژنان و کچان و رەخساندنی دەرفەتێکی یەکسان ئەو پروگرامانەی لە خوارەوە هاتووە لە بەرچاوی بگرێ.

* چاودێری تەندروستی گشتیی، پێشگیری لە نەخۆشییەکان و چاودێرییەکان پێش منداڵ بوون.

* پێشگیری لە نەخۆشی ئایدز، باشتر کردنی چاودێری تەندروستی پێشکەشکراو بە تووشبووان و کەمکردنەوەی راگواستنی ئەم نەخۆشییە لە رێگای دایك بە منداڵ.

* خەبات دژی ئەو قاچاخچییانەی کە لە رێگای فریودان و زۆرەوە ژنان و کچان دەخەنە دوای لەشفرۆشی و کۆیلەتی لەنێو بنەماڵەکاندا.

* خەبات لەگەڵ ئەوەی کە پێشتر گەشتوگوزاری رەگەزییان پێ دەگوت کە زۆربەی ژنان و منداڵان دەستدرێژییان دەکرایە سەر.

* پەروەردەکردنی بنەماڵەکان و ئاگادارکردنەوەیان لە ئاسەواری تەندروستی و کۆمەڵایەتی ئەو ژیانە هاوبەشانەی کە زووتر لە کاتی خۆی پێکدێ.

* پشتیوانی لە ناوەندی قوربانییەکان لەوانە ناوەندی توندوتیژی بنەماڵەیی و قەیرانی پێکهاتوو لە دەستدرێژییەکان.

* پەروەردەکردنی پولیس، پارێزەر، دادوەرو ئەنجوومەنەکانی پزیشکی لە پەیوەندی لەگەڵ کەمکردنەوەی توندوتیژی بنەماڵەیی.

* کۆتایی هێنان بە خەتەنەکردنی ژنان.

## هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە

هەڵبژاردنی ئازادو عادیلانە ئیزن بەو خەڵکانە دەدا کە لە دیموکراسییەکی پارلمانیدا دەژین هەتا پێکهاتەی سیاسی و ڕێڕەوی دارِشتنی سیاسەتی دەوڵەتی خۆیان دیاری بکەن.

* هەڵبژاردنی ئازاد و عادیلانە ئەگەری راگواستنی ئاشتی خوازانەی دەسەڵات دەباتە سەرەوە. هەڵبژاردنی ئەوتۆ پالێوراوانی شکست خواردوو، ناچار دەکا، ئاکامی هەڵبژاردن قەبووڵ بکەن و دەسەڵات بداتە دەستی دەوڵەتی نوێ.

* هەڵبژاردن، بەتەنیایی، گرەنتی دیموکراسی ناکا چونکە دیکتاتورەکان دەتوانن لە ئامرازە حکومییەکان بە مەبەستی دەستێوەردان و چەواشەکردنی پرۆسەی هەڵبژاردن کەڵك وەرگرن.

* هەڵبژاردنی ئازاد و عادیلانە پێویستی بەو خاڵانەی خوارەوەیە:

* مافی دەنگدانی گشتی هەیە بۆ تەواوی ژنان و پیاوان کە خاوەن مافی دەنگدانن ـ دیموکراسییەکان ئەم مافە لە کەمایەتییەکان و لە کارکەوتووەکان زەوت ناکا یا تەنیا ئەم مافە بە خویندەوارەکان یا کەسانی دەوڵەمەند نادا.

* ئازادی ناونووس کردن وەك دەنگدەرێك یا پالێوراوێك بۆ وەرگرتنی پۆستی دەوڵەتی.

* ئازادیی رادەربڕین بۆ پالێوراوان و حیزبە سیاسییەکان- دیموکراسییەکان بەربەستێك بۆ پالێوراوان یا حیزبە سیاسییەکان، لە رەخنەگرتن لە هەڵسووکەوتی ئەو بەرپرسانەی کە بەرپرسیارەتیان لەسەرشانە، قایل نابێ.

* هەلی زۆر بۆ ئەو کەسانەی هەڵدەبژێردرێن لە پەیوەندی لە گەڵ وەرگرتنی زانیاری بێ لایەنانە لە چاپەمەنی ئازاد دەرەخسێنێ.

* ئازادیی پێکهێنانی کۆبوونەوە بۆ بەڕێوەبردنی پروگرامەکان و کۆبوونەوە سیاسییەکان.

* ئەو یاسایانەی کە بە پێویستی بزانێ نوێنەری حیزبەکان لە رۆژی هەڵبژاردن، کەسانێك کە خۆبەخشانە لە شوێنەکانی دەنگدان چالاکن و چاودێرانی نێونەتەوەیی



دەتوانن لە پرۆسەی دەنگداندا یارمەتی دەنگدەران بدەن نەك لە هەڵبژاردنی کەسێك کە دەنگی پێ دەدەن.

* سیستمێکی بێلایەن یا هاوسەنگ بۆ بەڕێوە بردنی هەڵبژاردن و دڵنیابوون لە دروستی ئاکامەکانی- کارمەندی پەروەردە کراوی هەڵبژاردن دەبێ لە رووی سیاسییەوە بەستراوە بە حیزبێك نەبێ و کەسانی چاودێر بە سەر هەڵبژاردندا دەبێ نوێنەری حیزبە بەشدار بووەکان لە هەڵبژاردندا بێ.

* شوێنی دەنگدان دەبێ خەڵك دەستی پێ رابگا، شوێنی تایبەتی بۆ دەنگدان، سەندوقەکانی دەنگدان پارێزراو و ژماردنی دەنگەکان شەفاف بێ.

* دەنگدان بە شێوەی نهێنی- دەنگدان لە رێگەی بەرگەی دەنگی نهێنی دەبێتە گرەنتییەك لە هەڵبژاردنی حیزب یا پالێوراوێك لە لایەن کەسێکەوە ناتوانێ بە دژی ئەو کەڵکی لێ وەربگیرێ.

* پێشگیری یاسایی ساختەکاری لە هەڵبژاردن- دەبێ یاسای پێویست بۆ پێشگیری لە دەستکاری لە دەنگدان هەبێ (وەك ژماردنی دووبارە- دەنگدانی کەسانی نارِاست)

* پرۆسەی ژماردنی دووبارە و پێداچوونەوە بە رەخنەکان- دەبێ پرۆسە و میکانیزمەکان بۆ پێداچوونەوەی دووبارەی قۆناغەکانی هەڵبژاردن دیاریبکرێ هەتا بیسەلمێنێ کە هەڵبژاردن بە شێوەیەکی دروست بەڕێوە چووە.

* شێوازەکانی دەنگدان- لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا و تەنانەت لە یەك وڵاتدا بە رێگای جۆراوجۆر بەڕێوە دەچێ کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

* پسولە کاغەزییەکانی دەنگدان- دەنگەکان لە سەر کاغەزێك نیشان دەکرێ یان کون دەکرێن.

* پسولەکانی دەنگدان وێنەی پالێوراو یا حیزبەکانی لە سەرە هەتا هاووڵاتییانی نەخوێندەوار بتوانن بە دروستی دەنگ بدەن.

سیستمی ئەلیکترۆنی- دەنگدەران بە هۆی دەزگایەك لە شاشەی لەمسی لە سەرە یا بە فشاردانی کلیلێك دەنگ دەدا.

* پسولەکانی دەنگی کەسانی ئامادە نەبوون- بەو کەسانەی کە ناتوانن لە رۆژی هەڵبژاردندا بەشداری دەنگدان بن ئیزنیان پێ دەدرێ کە بەرگەکانی دەنگ پێش لە هەڵبژاردن بخەنە سەندووقەکانەوە.

## حکوومەتی زۆرینە، مافی کەمایەتییەکان

بەروالەت، بنەمای حکوومەتی زۆرینە و پارێزگاری لە مافی خەڵك و کەمایەتییەکان دوو شتی دژبەیەك دێتە بەرچاو. بەڵام ئەم بنەمایانە، لەراستیدا دوو کۆڵەکەن کە پایەکانی ئەوەی پێی دەڵێن دەوڵەتی دیموکراسی، راگرتووە.

حکوومەتی زۆرینە ئامرازێکە بۆ رێکخستنی دەوڵەت و بریاردان لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلە گشتییەکاندا، نە رێگایەکی دیکە و زوڵم و چەوسانەوە. هەروەك هیچ گرووپێك مافی ئازاردانی هیچ کەسێ نییە، هیچ زۆرینەیەکیش، تەنانەت لە دیمۆکراسییەکیشدا، نابێ ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی تاکێك یان گرووپێکی کەمینە پێشێل بکا.

کەمایەتییەکان- چ بەهۆی نەتەوەیی، باوەڕە ئایینییەکان، هەڵکەوتی جوگرافیایی، رادەی داهات و یان تەنیا وەك شکست خواردوو لە هەڵبژاردن - لە مافی بنەڕەتی گرەنتیکراو بەشدارن کە هیچ دەوڵەت، یان گرووپی زۆرینەی هەڵبژێردراو و هتد ... مافی پێشێلکردنی نییە.

کەمایەتییەکان دەبێ دڵنیابن کە دەوڵەتەکان لە ماف و پێناسەی ئەوان پارێزگاری دەکا. کاتێك ئەم دڵنیاییە مسۆگەر بوو، ئەم گرووپانە دەتوانن بەشداریی لە دامەزراوە دیمۆکراتیکەکانی وڵاتی خۆیان بکەن و کاریگەریی لەسەر دابنێن.

ئەو مافە بنەرەتییانە کە هەر دەوڵەتێکی دیمۆکراتیك پێویستە پارێزگارییان لێ بکا، دەتوانین ئاماژە بە ئازادیی رادەربڕین، ئازادیی ئایین و باوەڕ، قۆناغەکانی دام و دەستووری یاسایی و مافی سوودمەند بوونی بەرانبەر لە پشتیوانی یاسا و ئازادیی بیروباوەر دەربڕین، دژایەتی و بەشداریی تەواو لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا بکەین.



دیمۆکراسییەکان دەزانن کە پارێزگاری لە مافی کەمایەتییەکان بە مەبەستی پاراستنی پێناسەی فەرهەنگی، داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، هەستی دەروونی تاکەکان و چالاکیی ئایینی، بەشێك لە ئەرکە سەرەتاییەکانیەتی.

وەرگرتنی کەمایەتییەکانی ئەتنیکی‌و فەرهەنگی کە لە روانگەی زۆرینەی کۆمەڵگاوە بێگانەیە، یان لانیکەم سەیر دێتە بەرچاو، لە گەورەترین قەیرانەکانە کە لە دەوڵەتە دیمۆکراتیکەکاندا دەتوانن لەگەڵی بەرەوڕووبن. بەڵام دیمۆکراسییەکان بایەخ بەم خاڵە دەدەن کە جۆراوجۆری دەتوانێ سەرمایەیەکی گەورە بێ. ئەوان ئەم جۆراوجۆرییە فەرهەنگی، پێناسەیی و بایەخییانە وەك کێبڕکێیەك سەیر دەکەن کە ئەوان بەهێزتر و دەوڵەمەندتر دەکا، نە وەك هەڕەشەیەك. هیچ رێگا چارەیەکی تایبەتی ناتوانێ چارەسەری ئەو مەسەلانە بکا کە لە جیاوازی روانگە و بایەخیی گرووپە کەمایەتییەکان دێنە ئاراوە- تەنیا ئەم تێگەیشتنە هەیە کە لە رێگای بنەما دیمۆکراتیکەکان وەك دانبەخۆداگرتن، وتووێژ و بەتەنگەوە هاتنە کە کۆمەڵگای ئازاد بە رێککەوتنێك کە کۆڵەکەکانی حکوومەت واتە زۆرینە و مافی کەمایەتی لەخۆ دەگرێ، دەگەن.

## خوێندن و دیموکراسی

خوێندن مافی جیهانیی مرۆڤە. ئەم مافە هەروەها ئامرازێکە بۆ دەست راگەیشتن بە مافی مرۆڤ و ئامرازێکی بەهێزی کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییە. تەواوی وڵاتانی جیهان لە رێگای راگەیەندراوی جیهانیی مافی مرۆڤەوە رەزامەندی خۆیان لە بەشداربوونی هەموو مرۆڤەکان لە مافی خوێندن راگەیاندووە.

ـ تەواوی کۆمەڵگاکان، نەریتە زەینییەکان، پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان، فەرهەنگ و داواکارییەکانی خۆیان لە نەوەیەك بۆ نەوەی دوای خۆی دەگوازێتەوە. پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان خوێندن و بایەخەکانی دیموکراسیدا هەیە. لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا، بابەت و تەمرینی وانەکان پشتیوانی لە شێوازەکانی دەسەڵاتی دیمۆکراسی دەکا.

ـ ئەم پرۆسەی راگواستنی پەروەردەییە لە حکوومەتێکی دیمۆکراتیکدا پێویستە. چونکە سیستمە دیمۆکراتیکە شوێندانەرەکان، حکوومەتگەلی روو لە گەشەن کە پێویستییان بە بیرکردنەوەی سەربەخۆی هاووڵاتییان هەیە. بارودۆخی گۆرانکارییە ئەرێنییەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە دەستی هاووڵاتیان دایە. حکوومەتەکان نابێ پێیان وابێ خوێندن ئامرازێکە بۆ کۆنترۆڵی زانیاری و شتنەوەی مێشکی قوتابیان و خوێندکاران.

ـ حکوومەتەکان چۆن بۆ پشتیوانیی هاووڵاتییانیان تێدەکۆشن، دەبێ بایەخی تایبەتی بە پەروەردەکردن بدەن و سەرچاوەی پێویستی ئەو دابینبکەن.

خوێندن بۆ خەڵك، هەلی وەدەستهێنانی زانیاری لە رێگای رۆژنامە و کتێبەکان دەرەخسێنێ. هاووڵاتیی تێگەیشتوو بۆ بردنەسەری ئاستی دیمۆکراسی خاوەن پێگەیەکی باشترە.

ـ سیستمی پەروەردەیی حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان، نابنە کۆسپ لە بەردەم فێرکردنی تیۆرییە سیاسییەکانی دیکە یا شێوازەکانی حکوومەتی. حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان قوتابیان و خوێندکاران هان دەدا بۆ خستنەرووی باسگەلی لۆژیکیانە لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەیەکی ورد و تێگەیشتنی تەواوی مێژوو.

ـ گرووپە تایبەتی و ئاینییەکان دەبێ لە دامەزرانی ناوەندی فێرکردن ئازادبن. یا دایکان و باوکان دەتوانن پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لە ماڵەکان هەڵبژێرن.

ـ قوتابخانە دەوڵەتییەکان دەبێ بێ لەبەرچاوگرتنی باری نەتەوەیی یا ئایینی، رەگەزی یا بێتوانایی جەستەیی بە شێوەی یەکسان بۆ هەموو هاووڵاتییان بێ.

ـ خەڵك دەبێ فێری بنەماکانی دیمۆکراسی بن هەتا لە هەل و بەرپرسایەتییەکانی، وەك هاووڵاتییەکی ئازاد ئاگاداربێ و قەدری ئەوانە بزانێ.

ـ فێرکردن بۆ بەدواداچوونی دیمۆکراسی کە بریتییە لە مێژووی وڵات و جیهان و بنەما سەرەکییەکانی دیمۆکراسی.

ـ پرۆگرامی فێرکاریی حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان بریتییە لە مێژوو، جوغرافیا، ئابووری، ئەدەبیات، فەلسەفە، مافەکان، هونەرەکان، زانستی کۆمەڵایەتی، بیرکاری و زانست کە لە ئەستۆی هەموو قوتابیان و خوێندکارانە ـ بە کوروکچەوە.



ـ هەروەها قوتابیان و خوێندکاران دەبێ لە پێکهێنانی ناوەندەکان و بەڕێوەبردنی چالاکی کە بنەماکانی دیمۆکراسی لەودا لەبەرچاو بگرێ ئازادبن بۆ وێنە:

* رێبەرایەتی کردنی قوتابیان و خوێندکاران دەبێتە هۆی وەسەریەك کەوتنی ئەزموونەکانیان لە رەوتی دیمۆکراسیدا.

* هەڵبژاردن بە شێوەی تاقیکاری، فێری قوتابیان و خوێندکاران دەکا لە پەیوەندی لەگەڵ بەشداری هاووڵاتییان، نەریتی دەنگ دانی بەردەوام لەواندا پەروەردە دەبێ.

* رۆژنامەی قوتابخانە قوتابیان فێری رۆڵی راگەیەنی ئازاد و هەواڵنێری بەرپرسانە دەکا.

* ناوەندە مەدەنییەکان دەبێتە هۆی چوونەسەری پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا گەورەکان.

## دەستوور

دەستوور نووسراو بریتییە لە گرنگترین ئەو یاسایانەی کە دانیشتووانی وڵاتێك رەزامەندی خۆیان بۆ پاراستنی ئەوان لەژیانیاندا رادەگەیەنن و نیشاندەری پێکهاتەی بنەڕەتی حکوومەتی ئەوانە. هەربۆیە یاسای بنەڕەتی دیمۆکراسی ـ بەپێی خواستەکانی ئازادیی تاکەکەسی، مافەکانی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی بەرتەسکی حکوومەت ـ چوارچێوەی حکوومەت لە سیستمی دیمۆکراتیکدا پێکدێنێ.

* یاسای بنەڕەتی، پێ لەسەر پێویستی رێکخستنی حکوومەتی دیمۆکراتیك و وەڵامدەر لەگەڵ چوارچێوەی یاسایی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دادەگرێ.

* یاسای بنەڕەتی، ئامانجەکان و خواستە بنەرەتییەکانی کۆمەڵگا لەوانە خۆشگوزەرانی هەموو خەڵك پێناسە دەکا.

* هەموو یاساکان دەبێ هاوچەشن لەگەڵ یاسای بنەڕەتی بنووسرێتەوە. لە حکوومەتی دیمۆکراتیکدا دەزگای قەزایی سەربەخۆ ئیزنی هاووڵاتییان دەدا هەتا

دژایەتی ئەو یاسایانە بکەن کە پێیان وایە هاوچەشنی یاسای بنەڕەتی نین و بۆ هەڵوێستە نایاساییەکانی حکوومەت یا بەرپرسانی داوای ڕێگاچارەیەك لە دادگا بکەن.

* یاسای بنەڕەتی، چوارچێوەی دەسەڵاتی حکوومەت ـ سنووری دەسەڵاتەکەی، شێوەی بەکاربردنی ئەم دەسەڵاتە و ڕەوتی تێپەڕکردنی یاساکانی دوایی ـ دیاریدەکا.

* یاسای بنەڕەتی پێڕەوی کردن پێناسە دەکاو بنەمای هەڵبژاردنی خاوەن مەرجەکانی دەنگدان دیاری دەکا.

* یاسای بنەڕەتی بنەمای دامەزراوە سیاسی، بەڕێوەبەری و قەزاییەکانی وڵات لەوانە پێکهاتەی دەزگای یاسادانان و دادگاکان، بارودۆخی دامەزرانی دەوڵەتی هەڵبژێردراو و مەرجەکانی دەوڵەت بۆ بەرپرسانی هەڵبژێردراو دیاریدەکا.

* یاسای بنەڕەتی ئەرکی وەزارەتخانەکانی دەوڵەتی دەستنیشان دەکاو ئیزن بە خاوەن دەسەڵاتەکان دەدا هەتا هەوڵی کۆکردنەوەی باج و پێکهێنانی هێزێکی پشتیوانی نەتەوەیی بدەن.

* یاسای بنەڕەتی لە سیستمێکی فیدراڵدا دەسەڵات لە نێوان ئاستە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتدا دابەشدەکا.

لەوەی کە یاسای بنەڕەتی لە ساتەوەختێکی تایبەت لەسەردەمدا دەنووسرێ چاکسازی کردنی پێویستە هەتا بتوانرێ لەگەڵ پێداویستە جیاوازەکانی خەڵك لە داهاتوودا هاوچەشن بێ. بەهۆی گرنگی خۆڕێکخستن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە پێشبینی ناکرێ، یاسای بنەڕەتی زۆرجار بە جۆرێك دەنووسرێ کە ئەسڵە گشتییەکانی حکوومەت دیاری بکا.

* یاسای بنەڕەتی زۆرجار بریتییە لە دوو گرووپ لە مافی نەرێنی و ئەرێنی.

* مافەکانی بەرتەسك دەکاتەوە و لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دیاریکراو لەگەڵ خەڵك ئاگادار دەکاتەوە. بۆ وێنە حکوومەت دەبێ لەبەرتەسککردنی ئازادی ڕادەربڕین و توانایی هاووڵاتییان بۆ کۆبوونەوەی ئاشتیخوازانە، هەروەها زیندانی کردنی نایاسایی خۆ ببوێرێ.



* مافەکانی ئەرێنی بە حکوومەت دەڵێ کە دەبێ چ کارێك بکەن و بە هاووڵاتییان دەڵێ کە چ کارێك ڕێدراوە. ئەم "ڕێپێدانە" ڕەنگە بریتی بێ لە مافەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووریی و فەرهەنگی لە چوارچێوەی گرەنتییەکانی حکوومەت لە بەرانبەر ئاستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا. ئەم کارە ڕەنگە گرەنتییەك بێ لە پەیوەندی لەگەڵ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی بۆ تەواوی کوڕان و کچان، "خۆشگوزەرانی" دوای خانەنشین بوون یا بوونی کار و چاودێری تەندروستی بۆ هەموو هاووڵاتییان.

## حکوومەت لە ڕێگای هاوپەیمانی و ڕێککەوتنەوە

هەر کۆمەڵگایەك خاوەنی (یان بریتییە لە) چەند گرووپێك لە خەڵك بە ڕوانگەی جیاوازەوە بەرانبەر بە مەسەلە گرنگەکان بۆ تەواوی هاووڵاتیانە. حکوومەتێکی دیمۆکراتیکی ئازاد ئەم کارە بە قازانجی خەڵك دەزانێ و لە ئاکامدا لە بەرانبەر دان بەخۆداگرتن بەرانبەر بە ڕوانگە جۆراوجۆرەکان پشتیوانی دەکا.

* حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان کاتێك سەرکەوتوو دەبن کە سیاسەتمەداران و دەسەڵاتداران بۆیان دەرکەوێ کە مەسەلە ئاڵۆزەکان کەمتر بە ڕێگاچارەیەك کۆتایی دێ کە بە ئاشکرا "دروست" یا "نادروست" بێ و لێکدانەوەی جۆراوجۆر لە بنەماکانی دیمۆکراسی و دیاردە گرنگە کۆمەڵایەتییەکان لە ئارادا بێ.

* ئازادی کۆبوونەوە و ڕاگەیەنەکان، باسی ئازادو گۆڕینەوەی بیروڕا گەشە پێدەدا. ئەم کراوەییە هەل بۆ حکوومەتەکان دەرەخسێنێ کە کێشەکان دەستنیشان بکەن و ئیزن بە گرووپەکان دەدەن هەتا جیاوازییەکان ببینن و خەریکی دیتنەوەی ڕێگاچارەی بن. (لەکەرتی تایبەتیدا هەر ئەم "بازاڕی بیروبۆچوونانە" هەلی گەشە و وەگەڕخستنی ئەو سەرمایانە دەرەخسێنێ کە حسێبی داینەمۆی گەشەی ئابووری بۆ دەکەن).

* هاوپەیمانی کاتێك پێکدێ کە ئەو گرووپ یا حیزبانە کە قازانجی هاوبەشیان هەیە تەنانەت ئەگەر لەسەر چەندین مەسەلەی دیکە بەتوندی دژی یەك بن، لە بواری

هۆگرییە هاوبەشەکانیان یەکدەگرن. ڕێککەوتن لەگەڵ لە بڕیارە گرنگەکان ئیزن بە حکوومەت دەدا هەتا ڕێبەری بگرێتە ئەستۆ.

* بەشەکانی یاسادانانی حکوومەتەکانی دیمۆکراتیك بۆ تێپەڕکردنی یاساکان پشت بە پێکهاتەی هاوپەیمانی دەبەستن:

* لە سیستمی پارلمانیدا، گرووپە سیاسییەکان شێوە هاوکارییەك لەگەڵ گرووپەکانی دیکە ڕێکدەخەن هەتا خواستەکانی خۆیان ببەنە پێشێ و حکوومەت پێکبێنن.

* لە سیستمی سەرۆك کۆماریدا، هێندێك جار یاسادانەران بۆ دەنگ دان لەسەر مەسەلەی زۆر گرنگ بۆ خۆیان و هەڵبژێردراوەکانیان، سنووری حیزبەکان دەبەزێنن.

* هاوپەیمانان زۆرتر خوازیاری ئەوەن کە حیزبێکی سیاسی بە وەلانانی جیاوازییە دیار و بەرچاوەکان لەگەڵ گرووپەکانی دیکە ڕێکبکەوێ هەتا هەل بۆ دەسڕاگەیشتن بە گرنگترین بەشەکانی پڕۆگرامەکان برەخسێ.

* لەوەی کە حکوومەتە هاوپەیمانەکان لەو حیزبانە پێکدێ کە هێندێك جار خاوەنی ڕوانگەی دژ بەیەکن، ئەگەری لێك ترازانی حکوومەت هەیە. لە هێندێك لە حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان پێکهێنانی هاوپەیمانی و هەڵوەشانەوەی تەنانەت تا چەندجار لەساڵدا بەرچاو دەکەوێ.

## ئازادیی مەزهەب

هەموو هاووڵاتییان دەبێ لە ڕووی باوەڕە مەزهەبییەکانەوە ئازاد بن. ئازادیی مەزهەب بریتییە لە مافی پەرستن بۆ تاك یا گرووپێك، لەنێو کۆمەڵێك خەڵك یا بەتەنیا و بەشداری لە بۆنە مەزهەبییەکان، بەڕێوەبردنی ڕێ و شوێن "مناسك"و پەروەردەی ئایینی بەبێترس لە ئازاری حکوومەت یا گرووپەکانی دیکەی کۆمەڵگا.

* هەموو خەڵك خاوەنی مافی پەرستن یا کۆبوونەوەی پەیوەندیدار بە مەزهەب یا باوەڕێك و دامەزران و پاراستنی شوێنگەلێکن بۆ ئەم مەبەستە.



* ئازادیی مەزهەب وەك باقی مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ لەلایەن وڵاتەوە پێك نەهاتووە و نابەخشرێ، بەڵکو تەواوی وڵاتەکان دەبێ پارێزگاری لێ بکەن. حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان لە پەیوەندی لەگەڵ ئازادی مەزهەبدا زمانیش لە یاسای بنەڕەتییاندا دەگونجێنن.

* سەرەتای ئەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە زۆربەی حکوومەتە دیموکراسیەکان جیاوازن فەرمیی لە نێوان کلێسە و حکوومەت هەڵبژێرن، بایەخەکانی حکوومەت و ئایین دژایەتی بنەرەتییان لەگەڵ یەکتردا نییە.

* حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان زۆرجار بۆ ڕێکخستنی کاروباری مەزهەبی، ئاژانسگەلی دەوڵەتی یا ناوەندی فەرمی دیکە دانامەزرێنن، لەگەڵ ئەمەدا ڕەنگە داوا لە شوێنە پیرۆزەکان و گرووپە مەزهەبییەکان بکا هەتا بۆ کاروباری بەڕێوەبەری و باجی، خۆیان تومار بکەن.

* ئەو حکوومەتانەی کە پشتیوانی لە ئازادی مەزهەب دەکەن زۆرتر سەرنج دەدەنە پاراستنی مافە پێویستەکانی دیکە بۆ ئازادی مەزهەب لە وانە ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی پێکهێنانی کۆبوونەوە.

* حکوومەتە دیموکراسییە ڕاستەقینەکان ئەو دەرك دەکەن کە دەبێ ڕێز لە جیاوازیی مەزهەبیی تاکە کەس بگیرێ و یەکێك لە ڕۆڵە سەرەکییەکانی حکوومەت تەنانەت ئەگەر لە هێندێك ڕووەوە وڵات باوەڕێکی مەزهەبی دیاریکراوی قەدەغە کرد پشتیوانی لە هەڵبژاردنی مەزهەب بکا. حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان هەروەها:

* ناوەرۆکی بڵاوکراوەکان، وانە و وتارە مەزهەبییەکان دیاری ناکا.
* ڕێز لە مافی دایك و باوکان دادەنێ بۆ بەڕێوەبردنی پەروەردەیی مەزهەبی منداڵەکانیان.
* هاندان بە توندوتیژی مەزهەبی بە دژی کەسانی دیکە قەدەغە دەکا.
* پارێزگاری لە ئەندامانی گروپەکانی کەمایەتی قەومی، مەزهەبی یا زمانی دەکا.
* ئیزن بە خەڵك دەدا هەتا ڕۆژانی پشوو کە پەیوەندی بە باوەڕەکانیان هەیە بەڕێوەبەرن و ڕۆژە پیرۆزەکانیان جێژن بگرن.

* لەوەی کە کەسانی خاوەن بیروڕای جۆراوجۆر خوازیاری بواری هاوبەش لە مەسەلە هەمەجۆرەکان و هاوکاری کردن بۆ چارەسەری کێشەکان بۆ هەموو خەڵکن بە رەوتەکانی دیکەش ئیزنی گەشە دەدا.

* بۆ دەوڵەت و بەرپرسانی مەزهەبی، رێکخراوە ناحکوومی و هەواڵنێران، ئازادیی ئامادەکردنی هەواڵ سەبارەت بە ئازاری مەزهەبی دەرەخسێنێ.

* رێز لە مافی بەشداری ئازاد و یارمەتی بە کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگای دامەزرانی ناوەندەکانی بیروباوەر، بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکان و چاودێری لە پیروپەککەوتووەکان و بەڕێوەبردنی پرۆگرام و چالاکی دیکە کە بە قازانجی کۆمەڵگا بێ، دادەنێ.

## دەسەڵاتی بەڕێوەبەری

- رێبەرانی حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان بە رەزامەندی خەڵك فەرمانڕەوایی دەکەن، دەسەڵاتی ئەم رێبەرانە بەهۆی دەستبەسەرداگرتنی سوپاکان یان سەروەتە ئابوورییەکان نییە، هۆی ئەم دەسەڵاتە، رێزدانانە بە سنوورێك کە دەنگدەران لە هەڵبژاردنی ئازادو عادیلانەدا بۆ ئەوانیان دیاریکردووە.

- خەڵك لە حکوومەتە دیمۆکراتیکەکاندا، لە هەڵبژاردنی ئازاددا، ئەو دەسەڵاتانەی کە لەلایەن یاساوە پێناسە کراون بە رێبەرەکانیان دەسپێرن. لە دیمۆکراسی یاساییدا، دەسەڵاتەکان بە شێوەیەك دابەشدەکرێ کە دەزگای یاسا دانان، کاری دانانی یاسا بێ، دەزگای بەڕێوەبەری ئەو یاسایانە بەکار بێنێ و بیگەیەنێتە قۆناغی بەڕێوەبردن و دەزگای قەزایی بە شێوەی سەربەخۆ ئەرکەکانی بەڕێوە دەبا.

- بەرپرسانی حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان چەوسێنەرانی هەڵبژێردراو نین و ئەو سەرۆکانە نین کە هەتا زیندوون دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە. ئەوان بۆ کاتێکی دیاریکراو خاوەن دەسەڵاتن و ئاکامی هەڵبژاردنی ئازاد یان تەنانەت ئەگەر بەمانای وەلانانیان لە دەسەڵاتی حکوومەتیدا بێ، قەبوولی دەکەن.

- لە حکوومەتە یاساییە دیمۆکراتیکەکاندا، چوارچێوەی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری وەك باو بووە بە سێ رێگا دیاریکراوە: لەلایەن سیستمێکی هەڵسەنگاندن و بەراووردکردن



کە دەزگاکانی بەڕێوەبەری، یاسا دانان و قەزایی لەیەکتر جیا دەکاتەوە، لەلایەن فیدرالیزم کە دەسەڵات لەنێوان حکوومەتی سەرتاسەری و حکوومەتی هەرێمەکان دابەشدەکا و لەلایەن گرەنتیی یاسایی مافی بنەرەتییەوە.

- چوارچێوەی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە ئاستی وڵاتدا لەلایەن باوەڕ پێکراوێکی یاسایی کە لە لقی یاسا داناندا دانراوە، هەروەها دەزگایەکی قەزایی سەربەخۆ، دیاری دەکرێ.

- دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە حکوومەتە دیمۆکراتیکەکانی ئەمڕۆیدا وەك باوە بەم دوو شێوەیە رێکدەخرێن:

سیستمی ئەنجوومەنی یان سیستمی سەرۆك کۆماریی

* لە سیستمی ئەنجوومەنیدا، حیزبی زۆرینەی پارلمان، بەشی بەڕێوەبەری حکوومەت بە سەرۆکایەتی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، پێکدێنێ.

* لە سیستمی ئەنجوومەنیدا، بەشەکانی یاسادانان و بەڕێوەبەری بەتەواوی لە یەکتر جیا نین، چونکە سەرۆك وەزیرو ئەندامانی کابینە لەنێو پارلماندا هەڵدەبژێردرێن. لە سیستمێکی ئەوتۆدا، ئۆپۆزسیۆن سیاسی وەك ئامرازێکی سەرەکیی بەرتەسککردن یان چاودێری بەسەر کردەوەکانی دەزگای بەڕێوەبەری چاو لێ دەکرێ.

* لە سیستمی سەرۆك کۆماریدا، سەرۆك کۆمار جیا لە ئەندامانی ئەنجوومەنی یاسادانان هەڵدەبژێردرێ.

* لە سیستمی سەرۆك کۆماریدا، سەرۆك کۆمار و ئەنجوومەنی یاسادانان، هەرکام خاوەنی بنەماکانی دەسەڵات و چوارچێوەی سیاسی خۆیانن هەتا بتوانن لەکاتی خزمەتدا، یەکتری هەڵسەنگێنن.

- حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان، تەنیا خوازیاری ئەو دەوڵەتانەن کە سنووری دەسەڵاتەکەی دیاریکراوە نەك دەوڵەتێکی لاواز. لەئاکامدا رێککەوتن لەسەر مەسەلەکانی وڵات لەوانەیە بە لەسەرەخۆیی بەڕێوەبچێ، بەڵام کاتێك کە دەستبەر دەبێ، رێبەرەکانی ئەم حکوومەتانە دەتوانن بە دەسەڵات و دڵنیایی زیاترەوە، دەستبەکاربن.

- ڕێبەرانی حکوومەتە دیمۆکراتیکەکان تێکۆشانیان هەمووکاتێك لە چوارچێوەی یاسا کە دەسەڵاتەکەیانی پێناسە و سنووردار کردووە، دەگونجێنن.

## مافی مرۆڤ

تەواوی مرۆڤەکان بە مافێکی قەبووڵکراو دێنە دونیاوە. ئەم مافەی مرۆڤ، ئیزن بە خەڵك دەدا کە ژیانێکی شەرافەتمەندانە بگرنە پێش، هەر بۆیە هیچ حکوومەتێك ناتوانێ ئەم مافە ببەخشێ، بەڵام تەواوی دەوڵەتەکان بەرپرسن لەپاراستنیدا، ئازادی لەسەر بناغەی داد، ئارامی، شەرافەت و ڕێزلێنان- بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەز، مەزهەب، پەیوەندیی سیاسی یا هەڵکەوتووی کۆمەڵایەتی- شکڵ دەگر، ئیزن بە خەڵك دەدا هەتا بەدوای ئەم مافە بنەڕەتییەوە بن. لەحاڵێکدا کە سیستمە سەرەڕۆکان مافی مرۆڤ ڕەت دەکەنەوە، کۆمەڵگای ئازاد بۆ وەدەستهێنانی بەردەوام لە تێکۆشان دایە.

تەواوی خاڵەکانی مافی مرۆڤ بەستراوە بە یەکترین و لێك جیاناکرێنەوە، ئەوان لایەنە بێئەژمارەکانی بوونی مرۆڤ بۆ وێنە مەسەلە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەکانی لە خۆ دەگرێ. لە نێوان قەبووڵکراوترینیان دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانەی خوارەوە بکەین.

- هەموو خەڵك دەبێ مافی هەبوونی بیروباوەڕ و رادەربڕین بە شێوەی تاکەکەسی، یان لە ڕێگای ئەنجومەنە ئاشتیخوازانەکانەوە ببێ. کۆمەڵگای ئازاد "بازاڕی چاودێری" پێکدێنێ کە لەودا خەڵك سەبارەت بە هەر بابەتێك کە پێیان خۆش بێ، بیرورا بگۆڕنەوە.
- تەواوی خەڵك دەبێ مافی بەشداری کردنیان لەحکوومەتدا ببێ. حکوومەتەکان دەبێ یاساگەلێك لە پشتیوانی لە مافی مرۆڤ دیاریبکەن و لە هەمان کاتدا دەزگا قەزاییەکان دەبێ ئەم یاسایانە بە شێوەی یەکسان بۆ خەڵك بەڕێوە بەرن.



- ئازادیی لە گیرانی سەرەڕۆیانە، بەندکردن و ئەشکەنجە - چ کەسی دیاریکراو دژی حیزبی دەسەڵاتدار بێ، چ کەمایەتی ئەتنیکی و چ تاونبارێکی ئاسایی بێ - لە مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ دێتە ئەژمار.
- هێزی پۆلیس کار لێهاتوو لە هەمان کاتدا کە ڕێز لە تەواوی هاووڵاتییان دەگرێ، یاساکانی وڵات بەڕێوە دەبا.
- لەو وڵاتانەی کە چەندین نەتەوەی جۆراوجۆر تێیدا دەژین، کەمایەتییە مەزهەبی و نەتەوەییەکان دەبێ بە بێ دڵەڕاوکێ لە بووختانەکانی زۆرینەی خەڵك، ئازاد بن لە کەڵك وەرگرتن لە زمان و پاراستنی داب و نەریتەکانیان. حکوومەتەکان دەبێ لە کاتی ڕێزدانان بۆ خواستنی زۆرینە، بایەخ بە مافی کەمایەتییەکانیش بدەن.
- تەواوی خەڵك دەبێ خاوەنی هەلی کار، پەیدا کردنی بژێوی و پشتیوانی کردن لە بنەماڵەکانیان بن.
- پێویستە کە لە منداڵان پشتیوانییەکی تایبەتی بکرێ. ئەوان دەبێ لانیکەم دەبێ دەستیان بە پەروەردە کردنی سەرەتایی، خۆراکی پێویست و تەندروستی ڕابگا.

بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ پێویستە کە هاووڵاتییانی هەر کۆمەڵگایەکی ئازاد، وشیار بن. بەرپرسایەتی هاووڵاتییان - وەك هێندێك لە چالاکییەکانی بەشدار بوو - زامنی وەڵامدەر مانەوەی حکوومەتە بە خەڵك. بنەماڵەی وڵاتانی ئازاد پابەندن بە چالاکی لە بوارەکانی پاراستنی مافی مرۆڤ دا. ئەوان لە ڕێگای چەندین ڕێککەوتننامە و پەیماننامەی نێونەتەوەیی سەبارەت بە مافی مرۆڤ ڕەسمییەت (فەرمی کردن) بەم بەڵێنییە، دەدەن.

## ڕۆڵی ڕێکخراوە ناحکوومییەکان

لە دیموکراسییەکاندا، هاووڵاتیانی ئاسایی دەتوانن گرووپ گەلی سەربەخۆ ڕێکبخەن کە لە خزمەتی پێویستییەکانی کۆمەڵگا یان وڵاتێکدا بێ کە تێیدا دەژی، کاروبارەکانی دەوڵەت تەواو دەکاو کەمووکوڕییەکانی قەرەبوو دەکاتەوە و تەنانەت ئەم کاروبارانەش

دەباتە ژێر پرسیارەوە. زۆرتر بەو جۆرە ڕێکخراوانە، ڕێکخراوی ناحکوومی (NGO)دەڵێن، چونکە ئەوان لە ژێر چاودێری داموودەزگای دەوڵەتیدا نین.

NGOکان بە پەروەردە کردن و پشتیوانی لە بەها کۆمەڵایەتییەکان و بایەخ دان بەو مەسەلانە، هەروەها بە چاودێریکردن شێوەی هەڵسووکەوتی دەوڵەت و دامەزراوە ئابوورییەکانی کەرتی تایبەت ئیزن بە هاوڵاتییان دەدا هەتا کۆمەڵگای خۆیان باشتر بکەن.

NGOکان ئەو هاوڵاتییانە کە هەرکامیان سەربە ناوچەیەکن و لە دەوری یەك کۆبوونەتەوە، ئەو هەلەیان بۆ دەرەخسێنێ هەتا فێری پێکەوە کارکردن و هەروەها کارامەیی، پەیوەندی و دڵنیایی کە پێویستی دەوڵەتێکی باش، بن.

NGOکان لە زۆر بواردا لە خزمەتی بەژەوەندی هاوڵاتییان دایە. ئەوان دەتوانن وەك پێشکەشکاری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، پارێزەرانی ژینگە یا ستانداردەکانی ژیان و ستانداردەکانی کارکردن یا وەك کاتالیزۆرێك لە ئاڵوگۆڕە دیموکراسیەکاندا هەڵسووکەوت بکەن.

NGOکان زۆرجار نوێنەری بەرژەوەندی هاوڵاتییانن بێجگە لەوەی کە لە ڕووبەڕووبوونەوە سیاسی میللییەکان خۆیان دەپارێزن. باس و بیروڕا گۆڕینەوە گشتییەکان بە ئاگاداری هەموو خەڵك لەهەر چینێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بن، هەروەها ژنان و کەمایەتییەکان دەگەیەنێ.

بودجەیNGO کان لە ڕێگای یارمەتی بێبەرانبەری خەڵك، چەکی تایبەتی و یارمەتی کەسانی مرۆڤ دۆست، کۆمپانیاکان، دامەزراوە مەزهەبییەکان، دامەزاروە نێونەتەوەییەکان، (NGO)کانی دیکە، فرۆشتنی کاڵاکان و تەنانەت دەوڵەتەکان دابیندەکرێ.

دەوڵەتەکان و (NGO) کان زۆرجار وەك شەریك پێکەوە کار دەکەن. NGOکان دەتوانن بەڕێوەبردنی پرۆژەگەلێك بە وەگەڕخستنی سەرمایەی دەوڵەتی، لە نێو خەڵکی ئاسایدا، لێهاتووییەکان و کارمەندی خۆجێی و ناوچەیی دەستەبەر بکا. NGO کان



دەتوانن لە ڕووی سیاسییەوە بەستراوە نەبن، یا ڕەنگە بیرۆکەی حیزبی دامەزرابێ و بیانهەوێ ئامانجێکی دیاریکراو لەگەڵ ئامانجی دیکە لە پێناوی قازانجی گشتییدا بەرەو پێش بەرن. بەهەر شێوازێك بێ، خاڵی سەرەکی ئەمەیە کە NGOکان دەبێ کەمتر لە ژێر چاودێری سیاسی دەوڵەتدا کار بکا.

NGO کان پرۆگرامی خۆجێی و نێونەتەوەیی، لانیکەم لە تەواوی بوارەکاندا کە یارمەتی بە بڵاوبوونەوەی بنەماکانی دێموکراسی دەکا، دادەمەزرێنێ. ئەم پرۆگرامانە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

* مافی مرۆڤ ـ لە ڕێگای پەرەپێدانی ستاندارده نێونەتەوەییەکان و چاودێرکردن بەسەر کردەوەی ناشیرین و دەستدرێژی بە مافی یەکسانی دیکە.

* حکوومەتی یاسا- لە ڕێگای یارمەتییە یاساییەکان بە خۆڕایی یا بە تێچووی کەمتر، ئاگادار کردنەوەی هەموو هاوڵاتییان لە مافەکانیان و لایەنگریکردن لە چاکسازی یاسایی.

* بەشداری ژنان- لە ڕێگای ئامادەکردنیان بۆ بەشداری لە بوارەکانی سیاسی و پشتیوانی کردنیان لە بەرانبەر هەڵاواردنە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکان.

* پەروەردەی مەدەنی- لە ڕێگای فێرکردنی ئەو پرۆگرامانەی کە پێ لەسەر ڕۆڵی هاوڵاتییان لە کۆمەڵگایەکی هەمەجۆرو دیموکرات دا دادەگرێ.

* چاپەمەنی ئازاد- لە ڕێگای پشتیوانی و بڵاوبوونەوەی ڕاگەێندراوە گشتییە سەربەخۆکان، پەروەردەکردنی ڕۆژنامەنووسان و بەکارهێنانی ستاندارگەلێك بۆ ڕۆژنامەنووسی ئەخلاقی.

* دامەزرانی حیزبی سیاسی- لە ڕێگای هەڵبژاردنێك کە بە هۆی چاودێری فێرکراوی هەمان وڵات چاودێری دەکرێ و پێکهێنانی ئەنگیزە بۆ تۆمارکردنی ناوی دەنگدەرە ناحیزبییەکان.

* وەڵامدەریی دەوڵەت- لە ڕێگای ڕاڤەکردنی سیاسەتەکانی دەوڵەت و خستنە ژێر چاودێری وردی کاروباری دەوڵەت.

## دەزگای یاسادانان

نوێنەرانی هەڵبژێردارو لە حکوومەتێکی دیموکراسیدا- ئەندامانی پارلمان، ئەنجوومەنەکان یان کونگرە- ئەرکیان ئەوەیە کە خزمەتی خەڵك بکەن. ئەونا ئەو ئەرکانەیان لەسەر شانە کە بۆ سەلامەتی حکوومەتێکی دیموکراسی پێویستە.

- لە حکوومەتێکی دێمکراتیکی نموونەییدا، دەزگای یاسادانی هەڵبژێردراو، شوێنی سەرەکی بیرورا گۆڕینەوە، لێکۆڵینەوە و تێپەڕاندنی یاسایە. ئەم پارلمانانە ئامرازی ئەو پشتیوانی کردنانە نین کە تەنیا بڕیاراتی ڕێبەرێکی سەرەڕۆ بە پەسەند بگەیەنی.

- دەسەڵاتی چاودێری و پشکنین ئیزن بە دەزگای یاسادانان دەدا کە بەرپرسانی حکوومەتی بە هۆی کردەوە و بڕیارەکانیان بخاتە ژێر پرسیارەوە و سەرەڕای ئەوەش بەسەر هەڵسووکەوتی وەزارەتە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتی ـ بەتایبەت لە سیستمی سەرۆك کۆماریدا کە دەزگای یاسادانان جیا لە دەزگای بەڕێوەبەری ـ چاودێری دەکا.

- ئەنجوومەنەکانی یاسادانان دەتوانن بودجەکانی ولات بە پەسەند بگەیەنن، لە کاتی پێویستدا کۆبوونەوەی نا فەرمیی بەڕێوە ببا و لە خاوەن پلەوپایەکانی بەڕێوەبەری لە دادگاکان و وەزارەتخانەکان پشتیوانی بکا. لە هێندێك لە حکوومەتە دیموکراتەکاندا، کۆمیتەکانی یاسادانان بۆ یاسادانەران هەلی لێکدانەوەی ئاشکرای مەسەلەکانی ولات دەرەخسێنێ.

- ئەنجوومەنەکانی یاسادانان لەوانەیە پشتیوانی بە حکوومەت بکەن یان ببنە ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی کە سیاسەت و بەرنامەی جیاواز پێشنیار بکا

- ئەرکی یاسادانەران ئەوەیە بۆچوونەکانیان بە لێهاتووترین شێوە و بە ڕاشکاوانە باس بکەن. بەڵام ئەوان دەبێ بەلەسەر خۆیی و ڕێزدانان کە لە بنەما ئەخلاقییەکانی دیموکراسییە، پابەندبن و بۆ گەیشتن بەو ڕێککەوتنامانە کە بە قازانجی ئاسایشی هەموو خەڵکە ـ نەتەنیا پارێزەرانی سیاسییان ـ پێکبێنن. هەر ئەندامێکی ئەنجوومەنی یاسادانان دەبێ بە تەنیایی بڕیاربدا کە چۆن هاوسەنگی لە نێوان قازانجی خەڵکی ناوچەکەی دروست بکا.



ـــ یاسادانەران، زۆربەیان بۆ دەنگدەرانیان کۆبونەوە پێکدێنن و کێشە و نارەزایەتییە تایەبتییەکانیان لە پێناوی هاوکاری کردنیان- هەروەها بۆ یارمەتی وەرگرتن لە کەسایەتییە حکوومەتییەکان- دێنە بەرباس. ئەوان زۆرتر بۆ ئەم مەبەستە خاوەنی دەستەیەك لە راوێژکارانی پەروەردەکراون.

- یاسادانەرانی ولات وەك باوە بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە هەڵدەبژێردرێن. لە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ[1] کە هێندێك جار "زۆرینەی ڕێژەیی"[2] پێدەڵێن، پاڵێوراو کە زۆرترین دەنگ بەدەستبێنێ، هەڵدەبژێردرێ. لە شێوەی هەڵبژاردنی حیزبەکاندا[3] کە زۆرتر بۆ هەڵبژاردنی پارلمان بەکار دەبردرێ، دەنگدەران وەك باوە دەنگ بە حیزبەکان دەدەن نەك بە تاکەکەس و نوێنەران لەسەر بنەمای ڕێژەی دەنگ بەدەست هاتووی حیزبەکان دیاریدەکرێن.

- شێوەی هەڵبژاردنی حیزبەکان، بوار بۆ ئەو حیزبە بچووکانە کە زۆر بەباشی خۆیان ڕێکخستووە دەرەخسێنێ. هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ سیستم بەرەو ناتەبایی‌و دوو حیزبی پاڵ پێوە دەنێ. لەهەردوو شێوەدا، نوێنەران لە باسەکان، وتووێژەکان، پێکهێنانی بەرە و ئاشتبوونەوە کە لە تایبەتمەندی بەرچاوی دەزگای یاسادانانی حکوومەتە دیموکراتەکانە، بەشداریدەکەن.

- دەزگای یاسادانان زۆرتر دوو پارلمانییە و خاوەنی دوو بەشن و یاسای نوێ دەبێ هەر دوو پارلمانی سەرەوەتر و خوارەوەتر تێپەڕ بێ.

1. Ppluralirty.
2. First past the post.
3. Proporhnal.

# فیدرالیزم

کاتێك کە گرووپە جیاوازەکان لە خەڵکی ئازاد ـ بە زمان، باوەڕی مەزهەبی یان پێوانە فەرهەنگییە جیاوازەکان ـ هەڵدەبژێرن کە لە چوارچێوەی یاسایەکی بنەڕەتیدا بژین، چاوەڕوانییان ئەوەیە لە سەربەخۆیی ناوچەیی و ئیمکاناتی بەرانبەری ئابووری و کۆمەڵایەتی بەشداربن. لە سیستمی حکوومەتی فیدراڵدا- کە دەسەڵات لە ئاستی ناوچە، هەرێم و وڵات دابەش دەبێ- دەسەڵات بە دەستی بەرپرسانی هەڵبژێردراو دەسپێردرێ کە سیاسەتگەلێکی گونجاو لە گەڵ پێویستییەکانی ناوچەیی و هەرێمی دەگرنەبەرو بە کاری دەبەن. ئەوان لەگەڵ حکوومەتی وڵات و یەکتر هاوکاری دەکەن هەتا کێشەکانی وڵات لە سەر رێگا لابەرن.

ـ فیدرالیزم سیستمی دابەشکردنی دەسەڵات و بڕیاردانی نێوان دوو یان چەند حکوومەتە کە بەشێوەی ئازاد هەڵبژێردراون و چوارچێوەی دەسەڵاتەکەیان، خەڵك و ناوچەی جوغرافیایی هاوبەش لەخۆدەگرێ. ئەم سیستمە هەلی بڕیاردانی لە هێندێك بواردا کە ئاکامەکەی یەکجار پێویست بووە ـ هەم لە کۆبوونەوە ناوچەییەکان و هەم لە ئاستێکی سەرتری حکوومەتی پێکهێناوە و پشتیوانی لێکراوە.

ـ فیدرالیزم وەڵامدەربوونی حکوومەت لە بەرانبەر خەڵکدا دەباتە سەرێ و دابین کردنی ئیمکانی گەڵاڵە و بەڕێوە بردنی یاسایی ناوچەیی، یارمەتی بە بەشداری خەڵك و قەبووڵکردنی بەرپرسایەتی ئەوان دەدا.

ـ سیستمی فیدرالیزم، لە لایەن یاسایەکی بنەڕەتی نووسراوی دەسەڵاتدەرو دیاریکەری بەرپرسایەتییە هاوبەشەکانی پەیوەندیدار بە هەر ئاستێك لە حکوومەتدا بەهێز دەبێ.

ـ لە هەمان کاتدا وەك باو بووە لەبەر هێنانەدی پێویستییەکانی ناوچەیی لە لایەن حکوومەتی ناوچەییەوە، رێکەوتن هەیە، باشترین رێگای رووبەڕووبوونەوە لە گەڵ هێندێك لە مەسەلەکان، سپاردنی ئەوانە بە حکوومەتی وڵات. بۆ وێنە دەتوانین



ئاماژە بە مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە بەرگری، رێکەوتننامە نێونەتەوەییەکان، بودجەکانی فیدراڵ و خزمەتگوزاری پۆستی (پۆستە وگەیاندن) بکەین.

ـــ فەرمانە ناوچەییەکان، نیشاندەری مەسەلە گرنگەکانی کۆبوونەوە ناوچەییەکانە بۆ کاروباری ژیانیان. پۆلیس و ئاگرکوژێنەوە، ئیدارەی قوتابخانە و یاسای تەندروستی و بیناسازی ئەو نموونانەن کە زۆرتر بە شێوەی ناوچەیی دێتە بەرباس و بەڕێوە دەچێ.

ـ لە سیستمی فیدراڵدا پەیوەندی نێوان حکوومەت بەو مانایە کە حکوومەتە جۆراوجۆرەکانی (وڵات، هەرێم و ناوچە) لە کاتی پێویستدا لە بەشداری کردنی لە مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە دەسەڵاتە یاساییەکان، لەگەڵ یەکتر هاوکاری دەکەن. نێوبژیوانی لە کێشەکانی نێوان هەرێمەکان، زۆرتر لە ئەستۆی حکوومەتی وڵاتە.

ـ لە وڵاتێکدا کە لە بواری جوغرافیاییەوە بەربڵاوە و خاوەن ئابوورییەکی جۆراوجۆرە، نابەرانبەرییەکان لە داهات و دابینکردنی کۆمەڵایەتی دەتوانێ لە رێگای گرتنەبەری رێوشوێنی دابەشکردنی سەر لە نوێی باجەکان بە هۆی حکوومەتی وڵاتەوە، نەمێنێ.

ـ سیستمی فیدراڵ، وەڵامدەرو هەمەلایەنەیە. هاوڵاتییانی لە تەواوی ئاستەکاندا دەتوانن خۆیان بۆوەرگرتنی بەرپرسایەتی حکوومەتی بپاڵێون. حکوومەتەکانی ناوچەیی و هەرێمی زۆرترین بەرپرسایەتی و رەنگە لەبارترین بارودۆخ بۆ پێکهێنانی وەرچەرخان لە کۆمەڵگاکەیاندا دەرەخسێنن.

ـ فیدرالیزم ئیمکاناتێکی زۆر بۆ حیزبە سیاسییەکان لە پێناوی خزمەتکردنی ئەو کەسانەی هەڵیان بژاردوون دەرەخسێنێ. تەنانەت ئەگەر حیزبێك لە بەشەکانی یاسادانان و بەڕێوەبەری وڵاتدا، خاوەنی زۆرینە نەبێ، ئیزنی بەشداری لە ئاستەکانی ناوچەیی و هەرێمیدا هەیە.

## چاپەمەنیی ئازاد

لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا، چاپەمەنی نابێ لە ژێر چاودێری حکوومەتدا کار بکا. لە دەوڵەتە دیموکراسیەکاندا، نە وەزارەتی زانیاری بۆ چاودێری کردنی بابەتی رۆژنامەکان یان چالاکیی پەیامنێران هەیە، نە مەرج بۆ لێکدانەوەی دەسەڵاتی هەواڵنێران و نە گوشارێك بۆ ئەوەی کە هەواڵنێران پەیوەست بن بە ئەنجوومەنەکانی ژێر چاودێری حکوومەتەوە هەیە. چاپەمەنی ئازاد، زانیاری بە خەڵك دەدا، هەڵسووڕاوان دەخاتە ژێر پرسیارەوە و بارودۆخێك بۆ لێدوان و هەڤپەیڤینی ناوچەیی و سەرانسەری دەرەخسێنێ.

ـ حکوومەتە دیموکراسیەکان بایەخ بە چاپەمەنی ئازاد دەدەن. سیستمی قەزایی سەربەخۆ، کۆمەڵگای مەدەنی ژێر دەسەڵاتی یاساو رادەربڕینی ئازاد هەموویان پشتیوانی لە چاپەمەنی ئازاد دەکەن. چاپەمەنی ئازاد دەبێ پشتیوانی یاسایی لێبکرێ.

ـ لە حکوومەتە دیموکراسیەکاندا، دەوڵەت بەرپرسی کردەوەکانیەتی. لە بەر ئەم هۆیە هاووڵاتییان چاوەروانن لە بڕیارگەلێك کە دەوڵەت بە نوێنەرایەتی ئەوان دەیگرێ ئاگادار بکرێن.

ـ چاپەمەنی بە چاودێری کردنی دەوڵەت، "مافی زانیاری" خەڵك بۆ رەخساندنی دەرفەتی بردنە ژێر پرسیاری دەوڵەت و سیاسەتەکانی دابینندەکا. حکوومەتە دیموکراسیەکان بۆ رۆژنامەنووسان هەلی دەسڕاگەیشتن بە کۆبوونەوە گشتییەکان بەڵگە میللییەکان دەرەخسێنێ. ئەوان بەربەستی لە پێشدا دیاریکراو بۆ وتەکان و نووسراەکانی رۆژنامەنووسان قایل نابن.

ـ پێویست دەکا چاپەمەنی لە بەرانبەر خۆیدا بەرپرسانە هەڵسووکەوتی هەبێ. چاپەمەنی لە رێگای ئەنجوومەنە پیشەییەکان، ئەنجوومەنەکانی سەربەخۆی چاپەمەنی و "نوێنەرانی تایبەتی" یان رەخنەگرانی نێو رێکخراوەکان کە سکاڵاکانی خەڵك تاوتوێ دەکەن، بەرپرسی لێکدانەوەی سکاڵاکان پەیوەندیدار بە زیادە رەوییەکانیانن و بەم شێوەیە بەرپرسایەتی وەڵامدانەوەی ئەوان لە نێوخۆدا، دەپارێزێ.



ـ دیموکراسی پێویستی بە هەڵبژاردن و بڕیاردانی خەڵکە. بۆ راکێشانی متمانەی خەڵك بەرانبەر بە چاپەمەنی، رۆژنامەنووسان دەبێ راپۆرتی درووست لە سەر بنەمای سەرچاوە باوەڕ پێکراو و زانیاری بەبەڵگە ئامادە بکەن. دزینی ئەدەبی یان راپۆرتی دوور لە راستی، دژایەتی لە گەڵ بونیاتنانەوەی چاپەمەنی ئازادە.

ـ چاپەمەنی بۆ جیا کردنەوەی زانیارییە کۆکراوەکان و بڵاوکردنەوەیان لە پرۆسەکانی نووسین و دارشتندا دەبێ دەستەی نووسەران بە دوورلە کاریگەریی حکوومەت ببێ.

ـ رۆژنامەنووس نابێ بکەوێتە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی خەڵك و پێویستە هەتا دەتوانێ دوای راستییەکان بکەوێ. دیموکراسی ئیزن بە چاپەمەنی دەدا هەتا بەبێ ترس لە دەوڵەت یان بە قازانجی، دەست بکا بە کۆکردنەوەی هەواڵ و بڵاوکردنەوەی زانیاری.

ـ لە حکوومەتە دیموکراسیەکاندا کێبەرکێیەکی بێ کۆتایی لە نێوان دوو مافی گرنگدا هەیە. یەکێك لەم مافانە ئەرکی دەوڵەت لە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئەوەی دیکە مافی زانیاری خەڵکە بە پشت بەستن بە لێهاتوویی رۆژنامەنووسان لە دەسراگەیشتن بە زانیاری. پێویستە کە حکوومەتەکان ناوە ناوە دەسڕاگەیشتن بە هێندێك لە زانیارییەکان کە بۆ بڵاوبوونەوەی گشتی زۆر حەساسە بەرتەسك بکاتەوە. بەڵام رۆژنامەنووسان لە حکوومەتە دیموکراسیەکاندا بە تەواوی مافی ئەوەیان هەیە کە بە دوای ئەم مەسەلانە بکەون.

## پەیوەندی مەدەنی - سەربازی

مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە شەڕ و ئاشتی گرنگترین مەسەلەکانی نەتەوەیەك دەتوانێ لە گەڵی بەرەوڕوو بێ و لە کاتی قەیراندا، زۆربەی نەتەوەکان بۆ رێبەرایەتی کردن، روو لە هێزە سەربازییەکان دەکەن، بەڵام لە دیموکراسییەکاندا بەم جۆرە نییە.

لەدیموکراسییەکاندا، شەڕ و ئاشتی و هەڕەشەکانی دیکەی دژی ئاسایشی نەتەوەیی، گرنگترین مەسەلەیە کە کۆمەڵگایەك لە گەڵی بەرەوڕوو دەبێ و لە ئاکامدا، خەڵك دەبێ لە ڕێگای نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خۆیەوە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو جۆرە مەسەلانە بڕیار بدەن. سوپایەکی دیموکراسی، نەتەوەی خۆی رێبەری ناکا، بەڵکو خزمەتی پێ دەکا. رێبەرانی سەربازی راوێژ لەگەڵ رێبەرانی هەڵبژێردراو دەکەن و بڕیارەکانیان بەڕێوە دەبەن. تەنیا ئەوانەی کە هەڵبژێردراوی گەلن، بەرپرسایەتی بڕیاردان لە پەیوەندی لەگەڵ چارەنووسی نەتەوەیان هەیە.

لە ئاکامدا تێروانینی رێبەرایەتی غەیرە سەربازی بە سەرهێزە سەربازییەکاندا پێویستییەکی بنەڕەتییە بۆ دیموکراسی.

غەیرە سەربازییەکان دەبێ رێبەرایەتی هێزە سەربازییەکانی وڵاتی خۆیان بکەن و سەبارەت بە مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە بەرگری نیشتمانی بڕیار بدەن. نە لەبەرئەوەی لە هێزە سەربازییەکان بە تەگبیرترن، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوان نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵکن و لە بەر ئەم هۆیە، بەرپرسی گرتنەبەری بڕیارێکی ئەوتۆن و لە بەرانبەر خەڵکدا وەڵامدەرن.

لە دیموکراسیدا، کاروئەرکی هێزە سەربازییەکان پارێزگاری لە وڵات و ئازادییەکانی نەتەوە و نوێنەر، یان پشتیوانی هیچ روانگەیەکی سیاسی، یان قەومی یان گرووپێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی نین. وەفاداری ئەو بەرانبەر بە ئامانج و ئاواتی زۆربەی نەتەوە، بەڕێوە بردنی یاسا، خودی بنەمای دیموکراسییە.

دەسەڵاتی غەیرە سەربازییەکان، گرەنتییەکە بۆ بایەخەکان، دامەزراوەکان و سیاسەتەکانی وڵات کە خەڵك ئازادانە هەڵیدەبژێرن، نە هێزە سەربازییەکان. ئامانجی هێزە سەربازییەکان پارێزگاری لە کۆمەڵگایە، نەك پێناسەکردنی.

هەر دەوڵەتێکی دیموکراسی بۆ پسپۆڕیی و راوێژی هێزە سەربازییەکانی خۆی بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە سیاسەتەکانی پارێزگاری و ئاسایشی نەتەوەیی بایەخێکی زۆر دادەنێ. بەرپرسانی غەیرە سەربازی بۆ راوێژکردنی پسپۆڕانە لەکاروباری سەربازی



و بەڕێوەبردنی بڕیارەکانی دەوڵەت، بەستراوە بە هێزە سەربازییەکان. بەڵام ئەمە تەنیا رێبەرانی هەڵبژێردراوی غەیرە سەربازین کە دەبێ بڕیاری کۆتایی بدەن کە ئەم بڕیارانە هێزە سەربازییەکان لەچوارچێوەی ئەرکەکانیاندا بەڕێوەی دەبەن.

دیارە سیما سەربازییەکان دەتوانن وەك هەر هاوڵاتییەکی دیکە، لە کاروباری سیاسی وڵاتی خۆی بەشدار بێ- بەڵام تەنیا وەك دەنگدەرێك- هێزەسەربازییەکان دەبێ پێش دەست بەکاربوون لە کاروباری سیاسیدا لە خزمەتی سەربازی خانەنشین بکرێن، هێزە چەکدارەکان دەبێ تێکەڵی سیاسەت نەکرێن. هێزە سەربازییەکان خزمەتکاری بێ لایەنی وڵات و پارێزەرانی کۆمەڵگان.

لە کۆتاییدا، دەسەڵاتی غەیرە سەربازییەکان بەسەر هێزەسەربازییەکانی وڵات، گرەنتییەکە بۆ ئەوەی مەسەلەکانی پارێزگاری و ئاسایشی نەتەوەیی وڵات، بایەخە بنەڕەتییەکانی دیموکراسی وەك حکوومەتی زۆرینە، مافی کەمایەتییەکان، ئازادی رادەربڕین، ئازادی ئایین و قۆناغەکانی رێوشوێنی یاسایی نەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە و نەبێتە مەترسییەك بۆی. هەموو رێبەرانی سیاسی بەرپرسایەتییان هەیە کە دەسەڵاتیان بە سەر غەیرە سەربازییەکاندا بەکار بێنن و هەموو هێزە سەربازییەکان بەرپرسن کە مل بۆ فەرمانە یاساییەکانی دەسەڵاتە غەیرە سەربازییەکان راکێشن

## دەزگایەکی دادوەریی سەربەخۆ

دادوەری سەربەخۆ و بە ئەزموون، کۆڵەکە و بناغەی سیستمێك لە دادگاگەلی یاسایی، عادیلانە، بێلایەن و گرەنتی کراو لە لایەن دەستوورێکەوەیە کە وەك دەزگای دادوەری ناسراوە. ئەم سەربەخۆییە بەو مانایە نییە کە دادوەرەکان دەتوانن بڕیارەکانیان بە پێی ئارەزووی تاکەکەسیی خۆیان بگرن بەڵکو ئەوان سەربەستن لەوەی کە بڕیاراتی یاسایی شکڵ پێ بدەن تەنانەت ئەگەر ئەو بڕیارە بە پێچەوانەی ویستی دەوڵەت یان گرووپە دەسەڵاتدارەکان بێ.

* له دیموکراسییەکاندا، سەربەخۆیی بەرانبەر بە فشاری سیاسی کە لە لایەن بەرپرسانی هەڵبژێردراو و یاسادانەران دێتە ئاراوە دەگەڕێتەوە بۆ بێ لایەنی دادوەرەکان. حوکمی دادوەری دەبێ بێ لایەنانە بێ و بەپێی ڕاستییەکان، لێوەشاوەیی تاکەکان و بەڵگەهێنانەوەی یاسایی و یاساگەلی پەیوەندیدار دەر بچێ، بەبێ هیچ جۆرە بەربەستێك یان دەستێوردانی ناشایەستی لایەنەکان، ئەم بنەمایە یەکسانی تاکەکان لە بەرانبەر یاسادا گرەنتی دەکات.

* دەسەڵاتی دادوەرەکان لە لێکۆڵینەوەی یاسا گشتییەکان و ڕاگەیاندنی پێشێل کردنی دەستوور لە لایەن ئەوانەوە، دەبێتە کۆسپێکی سەرەکی لە سەر ڕێگای ئەگەری کەڵکی خراپ وەرگرتن لە دەسەڵات لە لایەن دەوڵەتەوە- تەنانەت ئەگەر دەوڵەتیش بە دەنگی زۆرینەی خەڵك هەڵبژێردرابێ. کە وا بوو ئەم دەسەڵاتە پێویستی بەوە هەیە کە دادگاکان سەربەخۆ بمێننەوە و بتوانن بڕیارەکانی خۆیان لە سەر بنەمای یاسا، نە بە پێی تێبینییە سیاسییەکان دەربکەن.

* دادوەرەکان چ هەڵبژێردراو بن یان دیاریکراو دەبێت ئەمنییەتی شوغلی و خولی خزمەتی گرەنتی کراویان لە لایەن یاساوە هەبێت هەتا بتوانن بە بێ نیگەرانی لە فشاری ئەو کەسانەی کە خاوەن دەسەڵاتن و بڕیار بدەن. کۆمەڵگایەکی مەدەنی بە دابینکردنی بارهێنان و مافی پێویست دەریدەخات کە ئاگاداری گرنگیی دادوەری بە ئەزموونە.

* باوەڕ بوون بە بێلایەنی سیستمی دادگاکان- لەوەی کە وەك بەشێکی "ناسیاسی" لە دەوڵەت چاو لێ دەکرێت- سەرچاوەی سەرەکی هێز و ڕەوایی ئەوانە.

* له گەڵ ئەمەشدا دادگاکانی وڵاتێك دروست بە قەد دامەزاوەکانی دیکە دەخرێنە بەر شیکردنەوە و ڕەخنەی خەڵك، هەر بۆیە لەو سۆنگەیەوە دادگاکان لە لێپێچینەوە بێبەری نابن.



* بنەمای ئەخلاقی دادوەری بە مەبەستی دڵنیا بوون لە بێلایەنی دادوەرەکان، لەوان دەخوازێ لە بڕیاردان سەبارەت بە مەسەلەگەلێك کە تووشی دژبەری بەرژەوەندی دەبن خۆ بپارێزن (یان خۆیان "ڕزگار بکەن").

* له دیموکراسیدا ناتوانرێ بە هۆی سکاڵایەکی بچووك یان لە وەڵامی ڕەخنەیەکی سیاسی، دادوەر لە سەر کار لابردرێ. تەنیا بە هۆی تاوانی جیددی یان سەرپێچی، لە ڕێگای قۆناغی دوورودرێژ و ئاڵۆزی بانگهێشتن بۆ دادگا (ڕاگەیاندنی تاوان)و موحاکمە- چ لە بەرانبەر یاسادانەران و چ لە بەرانبەر داواکاری گشتیی دادگایەکی جیاواز، دەتوانرێ دادوەر لە سەر کار لاببرێت.

* دەزگایەکی دادوەریی سەربەخۆ خەڵك دڵنیا دەکاتەوە کە بڕیارەکانی دادگاکان لە سەر بنەمای یاساکانی وڵات و دەستووره و پەیوەندی بە ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی سیاسی یان فشار لە لایەن زۆرینەیەکی کاتییەوە نییە. بە بەخشینی سەربەخۆییەکی ئەوتۆ، سیستمی دادوەری لە وڵاتێکی دیموکراسیدا وەك پارێزەری مافی مرۆڤ و ئازادی هەڵسوکەوت دەکات.

**سەرچاوە** : VOA

# تایبەتمەندییەکانی سیستمی دیموکراسی

**سەرچاوە: بەشی فارسیی رادیۆی ئەڵمانیا:**

تێکۆشان بۆ بەدەستهێنانی سیستمی سیاسی ئارمانی، لە مێژوودا بووەتە کێشەی فیکری مرۆڤەکان. یۆنانییە کۆنەکان یەکەمین کەسانێك بوون کە پێویستیی دەست راگەیشتن بە سیستمێکی سیاسی خوازراویان بۆ ژیانی مرۆڤەکان سەلماند. پرسیارێك کە بۆ ئەوان هاتە پێش، ئەمە بوو کە کام نیزامی سیاسی و کام جۆر حکوومەت، باشترین و لەبارترینن؟ ئەم پرسیارە بە رواڵەت سادەیە، بوو بە گرنگترین پرسیاری هەموو فەلسەفە سیاسییەکان لە ڕێڕەوی مێژوودا. ئایا دەتوانین بڵێین کە ئەمڕۆ واتە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم، بەدواداچوونێکی دژوار و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆ گەیشتن بە وەڵامێکی شیاو بۆ پرسیاری ئاماژەپێکراو، لە سەرکەوتن نزیك بۆتەوە؟ بۆ شیکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە، دەبێ وەبیربێنینەوە کە لە هەر کوێ مرۆڤەکان لە پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکە هێزبەکاردەبەن ـ واتە بە کردەوە لە هەموو سیستمە سیاسییەکاندا- پرسیاری رەوایی ئەم دەسەڵاتە، دەبێتە پرسیارێکی بنەڕەتی.

بێگومان دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی، یان بەو جۆرەی کە لە زمانی فارسیدا باوە (گەل سالاری)، تەنیا سیستمێکی سیاسی لە جیهان دا کە وەڵامی شیاو بە پرسیاری پەیوەندیدار بە رەوایی دەسەڵات دەداتەوە. لەم بارەیەوە ئەگەر چی ئەم شکڵە حکوومەتییە، تەنیا لە چەندین وڵات لە جیهاندا سەقامگیر بووە، بەڵام وەك سیمبولێکی خوازراو بۆ شێوازی بەڕێوەبەریی وڵات، بە جۆرێکی سەرسورهێنەر جێگای خۆی لەبیروڕای گشتی جیهاندا کردۆتەوە، کەم نین ئەو وڵاتانەی لە جیهاندا کە ئەمڕۆ سەرەڕای کێشە و لەمپەرەکان لە هەموو بوارەکانی سیاسی، ئابووری کۆمەڵایەتی، لە



پێناو گەیشتن بە دیموکراسی تێدەکۆشن. لەلایەکی دیکەوە هیچ سیستمێکی سیاسی و تەنانەت بێزراوترین حکوومەتە سەرەڕۆ و دیکتاتۆرەکان لە جیهان ناتوانین ببینینەوە کە خۆیان بە سیستمێکی غەیرە دیموکراسی بزانن. ئایا ئەمە بۆ خۆی نیشانەی راستی و دروستی دیموکراسی نییە! دیارە ئەم باسە بەو مانایە نییە کە دیموکراسی سیستمێکی بێ کەم و کوورییە. روون و ئاشکرایە کە هەتا ئەمڕۆ تەنانەت سیستمە سیاسییە دیموکراسیەکان نەیانتوانیوە بە هەموو قەیرانەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەندی بە عەدالەتی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، وەڵامێکی تەواو بدەنەوە. بەڵام دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان سیستمێکی سیاسی دروشمی و ئیدەئاڵ و باشترین سیستمی سیاسی ئێستا، واتە ئەوەی کە دەبێ ببێ و ئەوەی کە بە راستی بە باشترین شێوە هەیە. زێدەباری کێشەکانی پەیوەندیدار بە دابەشکردنی خێروبێرە ماددییەکان، هەلی کەڵکی خراپ وەرگرتن لە دەسەڵات لە هەموو سیستمە سیاسییەکان، بۆ وێنە لە دیموکراسیشدا هەیە. بەڵام دەبێ لەبەرچاو بگرین کە دیموکراسی تەنیا سیستمێکە کە لە رێگای دانانی رێ و شوێنی دیاریکراو لە ئیدارەی کاروباری وڵاتدا، بۆ پێشگیری لە کەڵکی خراپ وەرگرتنی ئەوتۆ، دەستی بە شێلگیرترین کردەوەی پێویست راگەیشتووە. ئەم رێ و شوێنانە کامانەن! دەسەڵات بە پێی سروشتی خۆی، پێی خۆشە بەرەو کۆکرانەوە و زیادبوون بڕوا، هەربۆیە جەوهەری هەر دەوڵەتێك پەرەپێدانی چوارچێوەی کۆنترۆڵی لەنێوخۆ و دەرەوەدایە- راست لەبەر ئەم هۆیە، دەسەڵات هەموو کاتێك پێویستی بە کۆنترۆڵ و دیاریکردنی سنوور هەیە. سنووری هەموو دەوڵەت و حکوومەتەکان، لەوەدایە کە لەگەڵ پلە و پایە و پیرۆزی مرۆڤەکاندا لە پەیوەندیدایە. ئەم شتە بە ناچار پەیوەندییەکی ئالۆزی لەنێوان مافی مرۆڤەکان و شێوازی رێکخستنی دەوڵەت پێکهێناوە، هەر بۆیە سەهوومان نەکردووە ئەگەر بڵێین کە سەرەکیترین قەیرانی سیستمێکی سیاسی دیموکراسی، رێکخستنی وشیارانەی پەیوەندی ئالۆزی نێوان ئازادی تاکەکەس لەگەڵ کۆمەڵگا و دەوڵەتە. ئەو رێ و شوێنانەی کە دیموکراسی بۆ ئامانجێکی ئەوتۆ دەیگرێتەبەر، جۆراوجۆرە و وەك بنەما و فاکتەری پێکهێنانی لێك دەدرێتەوە. گرنگترین تەوەرەکانی دیموکراسی دەتوانین لەم بنەمایانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

- پاراستنی پیرۆزی مرۆڤ و مافی مرۆڤ وەك بایەخە سەرەکییەکان.
- قبوولکردنی پلۆرالیزم و شەفافییەت وەك کۆڵەکەیەکی پێویست بۆ کۆمەڵگا.
- دەسەڵاتی خەڵك لە ڕێگای بەشداری سیاسیی ئەوان لە بەڕێوەبردنی کار و بارەکان و هەڵبژاردن و ڕەواییدان بە دامەزراوەکانی دەسەڵات.
- وەڵامدانەوەی دامەزراوەکانی دەسەڵات لەبەرانبەر خەڵکدا.
- ئازادیی حیزب و ڕێکخراو و ئەنجوومەنەکان وەك کارتێکی گوشار بەڕێوەبردنی ئیدارەی خەڵك و هەلی پێکهێنانی ئەلتەرناتیڤ بۆ حکوومەت.
- ئازادیی ئەندێشە، ڕادەربڕین و قەڵەم وەك شکڵ گرتنی ژیانی دیموکراسی لە کۆمەڵدا.
- دابەشکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی وەك وەك کارتێکی گوشار بۆ گرەنتیکردنی ئازادی و کۆنترۆڵی دەسەڵات.
- حکوومەتی یاسا، واتە یەکسانی هەموو لە بەرانبەر یاسا و پاراستنی ئەو لەلایەن هەموو دامەزراوە حکوومەتییەکان و هاووڵاتییان.
- شەفافییەت لە بوارەکانی سیاسییەتی دەرەوە بۆ داڕشتنی پەیوەندی عەقڵانی لەگەڵ وڵاتانی دیکە لە بواری نێونەتەوەییدا.

دەتوانین بڵێین کە ئەو بنەمایانە وەك ئەو خشتانە وایە کە بینای دیمۆکراسی سازدەکەن.

**- ریزی مرۆڤ**

لە وتاری پێشوودا، وێڕای باسکردنی تایبەتمەندییە سەرکییەکانی دیموکراسی، ئاماژەمان بە چەمکی "ڕێزی مرۆڤ" وەك سەرەکیترین بەهای سیستمی دیموکراسی کرد. ئێستاش بە شێوەیەکی روونتر باسی ئەم چەمکە دەکەین.

دیموکراسی لە دیاریکردنی سیستمی بەهایی خۆیدا، پشت بە روانگەیەکی تایبەت لە مرۆڤ دەبەستێ. بەپێی ئەم روانگەیە مرۆڤ دەبێ ئازاد بێ، بە واتایەکی دیکە بتوانێ کەسایەتیی خۆی بە بڕیارگەلی سەربەخۆ گەشە پێبدا. بەپێی ئەم روانگەیە بۆ مرۆڤ، هەموو تاکێك خاوەنی ڕێزی مرۆڤە. ئێستا بزانین ڕێزی مرۆڤ یانی چی؟



ئەوە کە مرۆڤ لە مرۆڤ و ئاژەڵ جیادەکاتەوە، تەنیا هێز بیر و ئاوەزی و بەتایبەت تێگەیشتنی بەرانبەر بە مرۆڤایەتیی خۆیەتی. لە حاڵێکدا ئاژەڵەکان بەستراوە بە سروشت و بە شێوەی خۆرسك هەڵسوکەوت دەکەن. مرۆڤ بە پشت بەستن بە بیرکردنەوە دەتوانێ خۆی لە سروشت جیابکاتەوە و بەسەریدا زاڵبێ.

لە پانتایی هۆش و ڕەوانی مرۆڤەکە کەسایەتی و بوونی ئەو شکڵ دەگرێ و نەتەنیا لەگەڵ سرۆشت و جیهانی ماددی بەڵکو پەیوەندی دەکات بە باوەڕ و جیهانی واتاییەوە. تەنیا ئەم تایبەتمەندییە تاقانە و تایبەتییەیە کە دەتوانێ ڕەفتاری خۆی بە ئامانجێکی دیاریکراو و بەرنامەداڕێژراو بەرەو پێشەوە بەرێ. بە واتایەکی دیکە، ڕێزی مرۆڤ بەمانای توانایی بیرکردنەوەی ئەو بۆ تێگەیشتنی خۆی و قبوولکردنی بەرپرسیارەتی لە هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی خۆیەتی. هەر بۆیە ئەگەر بڕیارە مرۆڤ وەك مرۆڤ بژی، پێویستە ڕێز و پلە و پایەی تاکەکەسیی ئەو خەوشدار نەبێ و دەستدرێژی نەکرێتە سەری. ئەمە بەو مانایەیە کە دەسەڵاتداران ئیزنیان نییە لە پێناوی ئامانجە سیاسی، ئابووری و یان ئایدولوژیکەکانیان، وەك ئامراز کەڵکی لێوەربگرن. هەر بۆیە ڕێزگرتن لە ڕێزی مرۆڤ، لە سیستمێکی دیموکراتیدا، بەشێوەی دیار بە مانای سوودمەندبوونی مرۆڤ لە مافی ئازادیی تاکەکەسییە کە ئەو لە توانای دایە تا لە بارودۆخێکی دیاریکراو و بوونی ئیمکاناتێکی جۆراوجۆر، بڕیارێکی سەربەخۆ و ئازاد، لەمەڕ هەڵسوکەوتی بدا. هەر بۆیە مرۆڤ کاتێك بەشێوەی دیار، بەمانای ئازادیی دیاریکردنی شێوەی ژیان، ئازادیی ئایین و مەزهەب و جیهان بینی و ئازادیی هەڵبژاردنی کار و ڕەفتاری ئازادانە بەرانبەر بە خاوەنداریەتی تایبەتی و شتی دیکەی لەو بابەتەیە. زێدەباری ئەوەش، ئازادی لێرەدا بەمانای خەوشدارنەبوونی سنوری تاکەکەسی و ئەمنییەت لە بەرانبەر کردەوەی سەرەڕۆیانەی دامەزراوە دەوڵەتییەکانیشە. تەنیا حکوومەتێك کە بە سەرنجدان بە ڕێزی مرۆڤەکان، باوەڕی بەم جۆرە ئازادییانە هەیە، مافی ئازادیی مرۆڤەکانیش لەبەرچاو دەگرێ.

لە وێنەیەکی ئەوتۆ لە مرۆڤە کە خواستەکانی ئازادیی تاکەکەسی و مافی گەشەی کەسایەتیی مرۆڤ و بەرانبەریی هەموو مرۆڤەکان لە بەرانبەر قانووندا سەرچاوە دەگرێ.

بەڵام دەبێ بڵێین کە ئازادییە تاکەکەسییەکان ناتوانن ببنە قانوونگەلێکی رەها، ئازادییەکان سنووردارن.

سنوورەکانی ئازادی لەوەدایە کە ئازادیی بەرانبەر بۆ هاووڵاتییانی کۆمەڵگایەك کە لە خواستە حاشا هەڵنەگرەکانی دیموکراسییە و سیستمێکی دیمۆکراتیك بەم پێوانەیە دەپێودرێ تا چەند توانیویەتی، ئازادییە تاکەکەسییەکان بۆ هەمووان رەچاو و دابین بکا.

بە سەرنجدان بە روانگەیەکی تر لە مرۆڤ، کە تێگەیشتن لە زات و جەوهەری دیموکراسی ئاسانتر دەبێ. بەم پێیە، دەتوانین بە سیستمێك بڵێین دیموکراسی کە لەگەڵ بە فەرمی ناسینی رێزی مرۆڤ وەك سەرەکیترین بەها، بە دوای ئەم ئامانجەدا دەڕوا کە بۆ هەموو هاووڵاتییانی خۆی، بەشێوەیەکی یەکسان، ئازادی و گەشەی کەسایەتی بۆ هاتنەدیی بەرپرسانەی ژیان دەرەخسێنێ و پێش مەرجە کۆمەڵاتییەکانیشی دابین دەکا. هەر بۆیە دیموکراسی تەنیا بریتی نییە لە بڕیاری رووت بەڵکو بایەخ و ناوەرۆك لەوەدا دەرکەوێ کە تا چەندە لە بارودۆخێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆردا، بەرزترین پلە لە ئازادی، بەپرسیارەتی تاکەکەسی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی دێنێتە دی. ئەزموونە مێژووییەکان نیشانیان داوە کە بێسنوورکردنی هێندێك لە واتاکانی دیموکراسی وەك "دەسەڵاتی زۆرینە" دەتوانێ ئامانجی دیموکراسی بخاتە مەترسییەوە. لەبەرئەوی کە زۆرینەش هەڵە دەکا. هەربۆیە، پێویستە رێزی مرۆڤ وەك بەهای سەرەکیی دیموکراسی، تەنانەت لەلایەن گەورەترین حکوومەتەکانی زۆرینەشەوە لەبەرچاو بگیرێ.



## فرەیی خوازی (پلۆرالیزم)

هەروەك باسمانکرد، لە دیموکراسیدا دان بە ئازادیی تاکەکەسیدا دەنرێ. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کە لە سیستمێکی دیموکراسیدا چی دیکە تەنیا یەك یەکی هاووڵاتییان ئەکتەری سەرەکی نین، بەڵکو بە گشتی ئەوە گرووپە کۆمەڵایەتییەکانن کە لە چوارچێوەی ئەنجوومەنەکان، رێکخراوەکان و حیزبەکاندا، بە رێکخستنی تاکەکان لە ریزەکانی خۆیاندا، دەکەونە شوێن کۆمەڵێك ویست و ئامانجی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو. کەوابوو دەکرێ، ئەم جۆرە گرووپە کۆمەڵاتییە وەك ئامرازگەلێگ لەبەرچاوبگرین کە هاوکاریی تاکەکانی کۆمەڵ دەکەن تا لە رێگای هاوبەندیی بە کۆمەڵەوە، بەسەر لاوازیی تاکەکەسیی خۆیان لە پانتایی کۆمەڵایەتییەدا زاڵبن و بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندی هاوبەشی خۆیان تێبکۆشن. جۆراوجۆریی رێکخراوە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی، هەروەها کۆڕ و کۆمەڵە جۆراوجۆرە مەزهەبییەکان لەکۆمەڵگا دیموکراسیەکاندا، رەنگدانەوەی ویست وباوەڕە مرۆڤایەتییەکانی لەم کۆمەڵگایانەدا.

هەر بۆیە بە پێچەوانەی کۆمەڵگایەکی تەڤخواز و تاکدەنگ و دژی ئازادی، کۆمەڵگایەك کە ئازادی دەخوازێ، پێویستە کۆمەڵگایەکی فرەڕەنگ و پلۆرالیستی بێ. فرەیی تەنیا بوارگەلی کۆمەڵایەتی و ئابووری ناگرێتەوە. بەڵکو لە کۆمەڵگەیەکی مۆدێرندا، وێناگەلی بەهایی مرۆڤەکانیش دەگرێتەوە. گرنگایەتیی ئازادیی تاکەکەسی لە نیزامێکی دیموکراسیدا، بە مانای کارنەکردن بە قانوونە ئاسمانییەکان، یان حوکمە سوننەتییەکانە کە رێگا نادەن بڕیارگەلی ویژدانیی تاکەکەس لەسەر بناغەی هەڵوێستی بەهایی ئەو دابڕێژنەوە.

کەوابوو ئازادیی تاکەکەسی لە چوارچێوەی قانووندا، بوار بە فرەجۆریی باوەڕەکان و باوەڕە مەزهەبی و سیکۆلارەکان دەرەخسێنێ. رەنگە زۆرکەس ئەم فرەییەیان پێ باش نەبێ. لەبەرئەوەی کە فرەیی دەبێتە مایەی کێشەی بەردەوام لە نێوان بەرژەوەندی و باوەڕە جۆراوجۆرە تاکەکەسییەکان و گرووپە کۆمەڵاتییەکاندا.

له کۆمەڵگایەکی پلۆرالیستیدا، هەر کەس یا گرووپێکی کۆمەڵایەتی، لە کێبڕکێیەکی بەردەوام دایە. بەڵام دیموکراسی ناچارە ئەم ململانێ و کێبڕکێیانەی نێوان بەرژەوەندی و باوەڕە جۆراوجۆرەکان قبوول بکا. بۆ ئەوەی کە کارێکی ئەوتۆ ئاسەواری سروشتیی مافی دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤ لە سیستمێك دایە کە لەگەڵ پاوانخوازیدا هەڵناکا.

هەوڵدان بۆ یەکدەستکردنی خەڵك و باوەڕەکان و بەرژەوەندییەکانیان ئەوە دەگەیەنێ کە هەر تاقە رێگایەکی نەگۆڕ بۆ رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەیە. بەڵام ئیددیعایەکی ئەوتۆ بنەمایەکی نییە. هەر جۆرە هەوڵدانێك لە پێناوی سەپاندنی ئیرادەیەکی دیاریکراو بەبێ لەبەرچاوگرتنی فرەیی کۆمەڵایەتی، لەبنەڕەتدا دژایەتیی لەگەڵ ئازادیی مرۆڤ هەیە و کۆمەڵگا نەخۆش و تووشی ئافات و دەردی پاوانخوازی دەکا. هەر بۆیە لە کۆمەڵگایەکی فرەڕەنگدا ئەگەر چی ململانێیەکی بەردەوام لەنێوان باوەڕەجۆراوجۆرەکان، روانگە سیاسییە جیاجیاکان و بەرژەوەندی ئابووری دژ بە یەك لە ئارادایە، بەڵام نیزامی دیموکراسی ئەم دیاردەیە نە وەك شەڕ بەڵکو وەك هێزێکی گەشە و پێشڤەچوون چاو لێ دەکا، رێگا بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی خۆش دەکا و ناهێڵێ کۆمەڵگا بچەقێ. ئەم هێزە، کۆمەڵگا زیندوو رادەگرێ و فەزایەك بۆ قبوولکردنی رێگا چارەی نوێ ئاوەڵا دەکا. تەنیا لە کۆمەڵگایەکی نەرمکێش و کراوەدا، ئازادیی مرۆڤ و هاوکاتیش ئافراندنی بەردەوامی مەعریفی و هزریی مرۆڤ گرەنتیی دەکرێ. کۆمەڵگایەك کە دەنگ بە ئازادی دەدا، ناچارە دەبێ ملیش بۆ فرەیی رابکێشێ.

لە سیستمی دیموکراسیدا، دەوڵەت لە سەرووی کۆمەڵگاوە نییە و دانانی دەوڵەت لە سەرووی کۆمەڵگا بە مانای ئەسپاردنی ئەم ئەرکە بە دەوڵەتە کە بەسەر کۆمەڵگا لە سەرەوە و بە شێوەی باوکانە و سەرەڕۆیانە فەرمانڕەوایی بکا. بەواتایەکی روونتر ئەو دیاری بکا کام وێناگەلی بەهایی پۆزەتیڤن و کامانەش نێگەتیڤن. کارێکی ئەوتۆ مافێکی قانوونی وەها دەداتە دەوڵەت تاچۆنی پێخۆش بێ رەفتار بکا. بەڵام لە



کۆمەڵگایەکی پلۆراڵدا ئەندامەکانی دەتوانن لە رێگای رێوشوێنە دیاریکراوەکاندا، باندۆر بکەنە سەر بڕیارەکانی دەوڵەت. دەوڵەت تەنیا دەتوانێ وەك ئامرازێکی لێك گرێدەر و وەدیهێنەری و ئامانجە هاوبەشەکان رۆڵ بگێرێ. هەر بۆیە لە نیزامێکی دیموکراسی و پلۆراڵدا ئەوە دەوڵەت نییە کە ئەرکەکانی دەوڵەت دیارییدەکا.

وتمان لە کۆمەڵگایەکی پلۆراڵدا، ململانێی بەردەوام لە نێوان باوەڕە جۆراوجۆرەکان، روانگە سیاسییە جۆراوجۆرەکان و بەرژەوەندییە ئابوورییە دژبەیەکەکان لە ئارادایە، هەر بۆیە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە لە کۆمەڵگایەکی ئەوتۆدا، رێکخستن و تەزمینی بنەماکان بۆ چارەسەری ململانێ کۆمەڵایەتییەکان و چاودێری بەسەر ئەم بنەمایانەدا، بایەخێکی تایبەتی هەیە. کێبڕکێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ یەکتر بۆ دیاریکردنی رێگایەك بۆ داهاتوو، تەنیا کاتێك دەتوانێ بۆ سەقامگیریی کۆمەڵگا جێگای مەترسی نەبێ کە بنەمای کێبڕکێی ئازاد و دادپەروەرانە و ئاشتیخوازانە تەزمین کرابێ. لێرەدایە کە رۆڵی رێکخستن و تەزمینی دەوڵەت گرنگییەکی تایبەتی پەیدادەکا، بۆ سیستمێکی دیموکراسی بەتەواوی روونە کە ئەمە خودی کۆمەڵگایە کە لە رێگای کەرەستەی دەوڵەتەوە، بەسەر بنەماکانی کێبڕکێی و یارییەکی دیموکراسی چاودێری و بواری بەڕێوەبردنی تەزمین دەکا. کێبڕکێیەك کە ئامانجی ئەو رێکوپێکی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و رێکوپێکییەك کە هەموو کاتێك ئامانجی ئازادی تاقیب دەکا، نەك ئەوەی کە تەنیا خۆی ئامانج بێ.

**ـ جودایی ئایین لە سیاسەت**

له نیزامێکی دیموکراسیدا کە لەسەر بناغەی فرەیی دامەزراوە، پێکهاتەی دەوڵەت، چوارچێوەیەکی گەورەیە کە دەبێ کار و بارە جیاوازەکان، روانگە و مەیل، بۆچوونە جۆراوجۆرە باوەڕی و مەزهەبییەکان لەخۆ بگرێ و باڵبکێشێ بەسەر هەموو هاوولاتییاندا، بەڵام کەشێکی ئەوتۆ، تەنیا کاتێك پێکدێ کە خودی دەوڵەت بێلایەن بێ، واتە هیچ چەشنە مەیلی مەزهەبی و ئایدولۆژیکی تایبەتی نەبێ.

دەوڵەت بە چەمکە مۆدێرنەکەی، بەشێکی گەورەی لە رەوایی خۆی هەر لە رێگەی بێلایەنیی ئایینی و ئایدیۆلۆژیکی، هەروەها قەبوولکردنی فیکری و

عەقیدەییەوە بەدەستدێنێ. هەر بۆیە دەوڵەتێك کە دەبێ کار و باری کۆمەڵگایەك هەڵسوورێنێ و کێشە سیاسی و بیرییەکان چارەسەر بکا. سنووری ئەرکە گشتییەکان داڕێژێ و لە ئاکامدا، پەیوەندی نێوان هاووڵاتییانی خۆی ڕێك بخا. پێویستە بێلایەن بێ چونکە بێجگە لەم حاڵەتە، بۆخۆی دەبێتە لایەنێکی کێشەکە. هەربۆیە دەتوانین بڵێین کە جیایی ئایین و ئایدۆلۆژیا لە سیاسەت، یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دیموکراسیگەلی مۆدێرنە کە لە خوارەوە بە وردی باسی دەکەین.

ئایین و مەزهەبەکان، بەپێی سروشتی خۆیان، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕاستییە ڕەها و نەگۆڕ و جیهانییەکانیان لەلایە. بەڵام دەوڵەت لەچوارچێوەی ئەرکی خۆیدا، بە سیاسەت کردن، واتە هەڵسووڕاندنی کاروباری جیهان بەشێوەیەکی ڕێژەیی، کاتی تێپەڕ ئیش دەکا. لە کار وباری سیاسیدا، هیچ شتێکی هەتایی و نەگۆڕ نابینرێ. سیاسەت گۆڕپانی ئاڵووێر، گەنگەشەی ڕێککەوتن و ئاشتەواییە و لەو چوارچێوەیەدا ناکرێ پشت بە ناوەرۆك خوازی ببەسترێ و دوگم بیر بکرێتەوە. تێکەڵ کردنی ئایین لەگەڵ سیاسەتدا ڕەها و نەگۆڕە، نەگونجاوە، هەر بۆیە ئەگەر ئایین بیهەوێ لە دەوڵەتدا جێگای خۆی بکاتەوە، بێگومان ئەرکی خۆی دەخاتە مەترسییەوە. لەبەر ئەوەی دەوڵەت دەوێ چارەسەری کێشەکان و پێکەوەژیانی جیاوازییەکان بەشێویەکی بەرین بکا، لە حاڵێکدا کە ئایین، لە هەموو بوارێك تەڤخوازیی بەسەر ڕوانگەکانیدا زاڵە و هەر بۆیە دەوڵەتێك کە ببێتە ئامرازێك لە خزمەت ڕوانگە ئایینی و ئایدیۆلۆژییەکاندا، بەناچار پەنا بۆ کردەوەگەلێك دەبا کە لە بارودۆخی بێلایەنیدا، هیچکات پەنایان بۆ نابا. ئەزموونی مێژوویی فێرمان دەکا کە تێکەڵکردنی ئایین و سیاسەت، ئازادیی هەردوولا بەرتەسك دەکاتەوە و زیانێکی جیددیش بە هەردوولا دەگەیەنێ.

جیایی دەوڵەت لە ئایین بە مانای وەلانانی ئایین لە گۆڕەپانی کۆمەڵایەتیدا نییە. دەوڵەتی دیموکراسی نایەوێ، کۆمەڵگا لەلایەنە ڕۆحی و بایەخە ئەخلاقییەکان بەتاڵ



بکاتەوە. مەسەلەکە تەنیا لەسەر جیاکردنەوەی نیهادە دەوڵەتییەکان لە باوەڕەکان و کاروبارە مەعنەوییەکانە و بایەخەکان ناخاتە مەترسییەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە داکۆکییان لێ دەکا.

لە دیموکراسیدا، جیایی دین لە دەوڵەت، لە ڕەوتێکی مێژوویی دووردرێژ و سەختدا وەدی هاتووە. چەندین سەدە درێژەی کێشا تا کۆمەڵگای پێشکەوتوو بەو ئاستە بگا کە پشوودرێژی و نەوی کێشان بەرانبەر بە جودابیران، بە تەنیا بەئازادیی بێ ئەملا و ئەولای مەزهەبی دابین نابێ و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ نیزامێکی یاسایی ئەوتۆ پێك بێ کە لە قەوارەکەیدا، ئایین بە تەواوی لە سیاسەت جیابێ. هەڵبەت لە مێژوودا دەتوانین نموونەی دەوڵەتگەلێك بێنینەوە کە بەرانبەر بە ئایین و مەزهەبە جۆراوجۆرەکان زۆر بەنەرمی جووڵاونەتەوە، بەڵام ئەمڕۆ بەپێی بڕیارنامەی جیهانی مافی مرۆڤ، چی دیکە ناتوانن ئازادیی تەواوی مەزهەبی هەتا پلەی ئارامی و لەسەرخۆیی مەزهەبی کەم بکەنەوە. ئازادیی تەواوی مەزهەب بەپێی بڕیارنامەی جیهانی مافی مرۆڤ لە هەمان کاتدا، بە مانای ڕێزگرتنی یەکسان لە ئایین و مەزهەبە جۆراوجۆرەکانیشە. بەڵام لەسەرەخۆیی و نەرمی نواندن بەرانبەر بە کەمایەتییەکی مەزهەبی، تەنانەت لە باشترین شکڵی خۆیدا، نیشانەی جۆرێك لە نابەرانبەریی مەزهەبییە. دەوڵەتێکی ئایینی یا مەزهەبی، تەنانەت ئەگەر بیهەوێ ـ ڕەنگە بتوانێ بەرانبەر بەو دەستە لە هاووڵاتییانی خۆی کە سەر بە ئایین و مەزهەبێکی دیکەن، نەرمی نیشان بدا، بەڵام هیچ کات ناتوانێ کێشەی بەرانبەری بەتەواوی لە نێوان ئایین و مەزهەبە جۆراوجۆرەکاندا چارەسەر بکا.

# تیۆری دیموکراتیزەیشن

نووسین: ئەحمەد ئیشکەوەری

**پێشەکی:**

هەموو کەس پێیان وایە، کە دیموکراسی بەرهەمی خۆشگوزەرانییە. ولاّتانی دەوڵەمەند کەم تا زۆر بە شێوەی دیموکراسی بەڕێوە دەچن و لە زۆربەی ولاّتانی هەژاردا دیکتاتۆری حاکمە. بە ئاوڕدانەوەیەك لە گۆی زەوی وادێتە بەرچاو کە ئەم بۆچوونە دروستبێ، بەلاّم سەرەڕای چەند ریزپەڕێك لە دەیەی دواییدا، دەتوانین گومان لە دروستیی ئەم بۆچوونە بکەین.

دوای جەنگی جیهانی دووەم بیرمەندانی بواری پەرەسەندن رایانگەیاندووە، کە ڕێگای گەشە و پەرەسەندنی جیهانی سێیەم مۆدێڕنیزەکردنە. ئەوان پێیان وابوو کە ولاّتانی جیهان دەبێ لە یەکەمین هەنگاودا ئابووری مۆدێڕنیزە بکەن و سەرمایە بەدەست بێنن و لە هەنگاوەکانی دواییدا دەتوانن دەوڵەت و کۆمەڵگا مۆدێڕنیزە بکەن (Parsons / List). لەم رووەوە بەردی بناغەی تیۆری مۆدێڕنیزاسیۆن لە روانگەی پارێزگارانەوە ئەمە بوو کە گەشەسەندنی خۆشگوزەرانی دەبێتە هۆی دیموکراسی و ئەوەی کە دیموکراسی دەوێ دەبێ پشت لە دیکتاتۆری بکا، چونکە پەرەسەندنی ئابووری و سیاسی هاوکات بەڕێوە ناچێ، پەرەسەندنی ئابووری دەبێ پێش پەرەسەندنی سیاسی بێ. ئەم تیۆرییە رێنوێنی پراکتیکی لایەنگرانی گەشە و پەرەسەندن بوو لە روانگەی سەرمایەداری لە دەیەکانی ٥٠ — ٦٠دا. بەلاّم لە بەرامبەر ئەم روانگەیەدا، قۆڵی چەپ بە تایبەت لە ئەمریکای لاتین تیۆرییەکی دیکەی مۆدێڕنیزەکردنیان



پێشنیاز کرد. تیۆری بەڵێنی نەدان یان بەستراوە نەبوون، لەم تیۆرییەدا پارامەترەکانی دواکەوتوویی ولاّتانی جیهانی سێیەم دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی دەرەوە و نێونەتەوەیی ئەوان، ڕێگەی گەشە و پەرەسەندن بە گشتی لەسەر بنەمای پارامێترە نێوخۆییەکان هەڵدەسەنگێندرێ.

سوودمەندبوونی ولاّتانی سەرمایەداری لە سەرچاوەکانی کەرەستەی خاوی جیهانی سێیەم و پشتیوانی ئەم ولاّتانە لە رژێمە دیکتاتۆرەکان بە هۆکاری سەرەکی پەرەنەگرتوویی لێك دەدرایەوە و خاڵی سەرەکی ئەم تیۆرییە: بەستراوە نەبوون بە ولاّتانی سەرمایەداری جیهانییەوە.

پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەکان لە کۆمەڵناسی سیاسی و ئاکامی تاقیکراوەی ئەو ئەمڕۆ نیشانیداوە، پەیوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان مۆدێڕنیزاسیۆن و دیموکراتیزەیشندا هەیە، بەلاّم ئەم پەیوەندییە لەسەر بنەمای چ جۆرە میکانیزمێکە، بۆچوونەکان یەکجار زۆرن.

سەرن جڕاکێشترین بۆچوون دەگەڕێتەوە بۆ (Peirson- 2003) کە بۆ شیکردنەوەی ئاکامی مۆدێڕنیزاسیۆن لە کۆمەڵگایەك، بوومەلەرزە بە نموونە دێنێتەوە. کە ئاڵوگۆڕی لەسەرخۆ و درێژخایەن کە لە ژێر زەویدا روو دەدا نابینرێ، بەلاّم ئەنجامەکەی دەتوانین بە رووخانی لەنەکاو ببینین.

ئێستا زۆرتر مۆدێڕنیزاسیۆن وەك مەرجێك یا تەنیا پێش مەرجێك ئەویش لە قۆناغی سەقامگیری و جێگیربوونی پرۆسەی دیموکراسی بایەخی پێ دەدرێ. (Diamond ١٣٧،١٩٩٢) بە پێی ئەزموونی دیتراو لە راستیدا تا ئێستا دوو حاڵەت رووی داوە: مۆدێڕنیزاسیۆن بەبێ دیموکراتیزەیشن، نموونەیەکی دیار و بەرچاو لە بارەیەوە ولاّتانی سەنگاپوور، کوێت، عەرەبستانی سعوودی، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبییە کە بە پێی زانیاری بانکی جیهانی داهاتی سەرانەی ساڵانەیان زیاتر لە ١٠٠٠٠ دۆلارە. حاڵەتی دووەم دیموکراسییە بە پلەی خوارتر لە مۆدێڕنیزاسیۆن، نموونەی بەرچاو ولاّتانی مالی، نیگاراگوا، بۆلیوی، مەغولستانە کە بە پێی بۆچوونەکانی (ماڵی ئازاد) وەك دیموکراسی چاوی لێ دەکرێ و داهاتی

سەرانەیان کەمتر لە ٨٥٢ دۆلارە. لەگەڵ ئەم دوو حاڵەتەدا دەتوانین چەند ریزپەڕێك ببینینەوە کە لە پرۆسەی پەرەسەندنی ناسەقامگیرا بە دیموکراسی گەیشتوون، دەتوانین ئاماژە بە کۆریای باشوور و تایوان بکەین. مۆدێرنیزاسیۆن بە بێ مۆدێرنیتە بەم واتایەیە کە بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەوڵدەدرێ، بەڵام هاوکات حزبێك هەموو شتێك لەسەرەوە دەسەپێنێ (چین)، دیالێکتیکی مۆدێرنی ئەوتۆ هەڵگری قەیرانە و ئاکامێکی جگە لە ناسەقامگیریی سیستەم چاوەڕوانی نییە. بە گۆڕینی رژێمی پورتوگال (سێیەمین شەپۆل)ی دیموکراتیزەیشن دەستیپێکرد. بە دوای ئەودا، ئەم شەپۆلە رژێمەکانی ئەمریکای لاتینی گرتەوە و بە گۆڕینی رژیمە سۆسیالیستییەکان لە ئەوروپای رۆژهەڵات پەرەی ئەستاند. ئەمڕۆ وشەی دیموکراسی یەکێکە لە وشە هەرە باوەکانی ئەدەبیاتی سیاسی جیهانی سیاسەت. پێویست ناکا بیرۆکەی فۆکۆیاما بە ناونیشانی "کۆتایی مێژوو" قبووڵبکەین تا بیسەلمێنین کە گرنگترین ململانێی جیهانی سیاسەت لە نێوان رژێمە توتالیتر و سەرەڕۆکان لە لایەك و دیموکراسی لە لایەکی دیکەوەیە، گەشەسەندنی شەپۆلی سێیەمی دیموکراتیزەیشن وا دێتە بەرچاو کە لەم ململانێیەدا دیموکراسی وەك براوە و سەرکەوتوو دەردەکەوێ. ئەمڕۆ ئەم بیرۆکەیە لایەنگری زۆرە کە بە پەرەسەندنی ئابووری پشت بەستوو بە بازاڕ، پەرەسەندنی بازرگانی جیهانی و پلۆرالیزم، سەرئەنجام دیموکراسی سەردەکەوێ و دەبیاتەوە. بەڵام لە بەرامبەردا، کەسانێك پێیان وایە ئەم بیرۆکەیە خۆشبینانەیە و لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەمڕۆ فاکتەرگەلی دیکە وەك فەرهەنگ و پێش لە هەموو شتێك، ئایینەکان رۆڵێکی دیاریکراویان هەیە، بەم جۆرە بەرگری فەرهەنگیی جیهانی ئیسلام و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە بەرامبەر شێوازەکانی دیموکراسی رۆژئاوایی روون دەکەنەوە.

بەڵام شەپۆلی سێیەم بە پێی بیرۆکەی لاری دیامۆند (Larry Diamond) شەپۆلێکی گەڕانەوەی (reverse wave) هەیە. Gullermoo Donex لە پەیوەندی لەگەڵ رووسیا باس لە "چوارچێوەیەك لە دیموکراسی" دەکا و یان Merkel باسی دیموکراسی نەگونجاو دەکا.



خاڵی جێگای سەرەنج ئەمەیە: لە زۆربەی گۆڕانکاریی سیستەمەکانی دوای ١٩٨٩ کە پەیوەندییان بە شەپۆلی سێیەمەوە هەیە، کۆمەڵگای مەدەنی رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە. بە گوتەی دیامۆند لە راستیدا کۆمەڵگای مەدەنی فاکتەری سەرەکی دەستپێکردنی هەرەوەزی گرووپە بێ لایەنەکان و رێکخراوە سەرەکییەکان بووە. کۆمەڵگای مەدەنی بە کەڵك وەرگرتن لە هاندانی بەربڵاوی هەڵسووڕاوان، رژێمی خستۆتە ژێر فشار و پرۆسەی گۆڕانی ئاسان کردووە.

## میتاتیۆری گۆڕینی سیستەم (دیموکراتیزەیشن)

شەپۆلی یەکەمی دیموکراسی لەگەڵ شۆڕشەکانی فەرەنسا و ئەمریکا دەستیپێکرد و بووە هۆی دیموکراسی لە بەریتانیا، ئەمریکا و فەرەنسا (هانتینگتۆن). لە نێوان ساڵەکانی ١٨٢٦ – ١٩٢٦ لە ناو زیاتر لە سی وڵاتی جیهان دیموکراسی سەقامگیر بووە.

بە پێکهێنانی سیستەمی سیاسیی فاشیستی، توتالیتار و دیکتاتۆر، لە ئەوروپا و ئەمریکای لاتین بۆ ماوەیەك پەرەسەندنی دیموکراسی راوەستا.

دووەمین شەپۆلی پەرەسەندنی دیموکراسی دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی دەستیپێکرد. لەم قۆناغەدا لە وڵاتانی شکست خواردووی شەڕ، واتە ئەڵمانیا، ژاپۆن، ئیتاڵیا، نەمسا بە رێبەرایەتی وڵاتانی سەرکەوتووی شەڕ پرۆسەی دیموکراتیزەیشن دەستیپێکرد. ئەم شەپۆلەش بەشێك لە وڵاتانی ئەمریکای لاتینی گرتەوە، بەڵام پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە زۆربەی ئەم وڵاتانە نەیتوانی پێش بکەوێ و بە دامەزرانی سیستەمی دیکتاتۆری سەربازی، راوەستا.

شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی بە دەستپێکردنی ساڵەکانی ٧٠ لە وڵاتانی باشووری ئەوروپا (یۆنان، پورتوگال و ئیسپانیا) دەستیپێکرد و لە ساڵەکانی ٨٠ بەشێك لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین و وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (تایوان، فیلیپین، کۆریا، تایلەند)ی گرتەوە.

بەهەرەسهێنانی (سۆسیالیزمی باو) شەپۆلی سێیەمی پەرەسەندنی دیموکراسی ئەوروپای رۆژهەڵاتیشی گرتەوە و لە درێژەی ئەوەدا لە ساڵەکانی ٩٠ بەشێك لە وڵاتانی ئەفریقیاش کەوتنە سەر رێڕەوی گۆڕانکارییە دیموکراتییەکان. گرنگترین تایبەتمەندی شەپۆلی سێیەمی دیموکراتیزەیشن لەمەدایە: کۆمەڵێك وڵاتی جۆراوجۆری لە کیشوەرە جیاوازەکاندا گرتۆتەوە کە ئاستی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆریان هەیە.

چەندین خاڵی هاوبەشی دیاریکراو لە پرۆسەی گۆڕینی سیستەم لە نێوان ئەوروپای رۆژهەڵات و ئەوروپای رۆژئاوا و ئەمریکای لاتیندا هەیە. بەڵام جیاوازییەکی بێ ئەژماریش دەتوانین دەستنیشان بکەین. باس و شرۆڤەی ئەم خاڵە هاوبەش و جیاوازانەی شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی، پانتاییەکی بەربڵاوی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسیی سیاسی بەخۆوە گرتووە، کە دەتوانین لە ژێر ناوی جۆراوجۆر: (سیستەمی ترانسفۆرمەیشن)، (گۆڕینی سیستەم)، (گۆڕینی رژێم)، (قۆناغی تێپەڕبوون)، (ئاڵوگۆڕی رژێم)، وەرچەرخانی رژێم) کە لە ئەدەبیاتی کۆمەڵناسیی سیاسیدا بەرچاو دەکەون. لەم بابەتەدا سیستەمی ترانسفۆرماسیۆن پێناسەی مێرکێل وەك گۆڕینی سیستەم لەبەرچاو گیراوە: بەو مانایە کە بە گۆڕینی پێکهاتەی سیستەمی کۆن، سیستەمێکی نوێ بە پێناسەی نوێ دادەمەزرێ، لەوێوە کە گۆڕینی سیستەمی کۆن بۆ سیستەمی نوێ قۆناغێکی تێپەڕبوونی بەدوادا دێ، لێرەدا (Transtion) هەر وەك لە وەرگێڕانی ئینگلیزی یان ریشەی سەرەکیی ئیسپانییەکەی، مانای"قۆناغی تێپەڕبوون" دەگەیەنێ، وەك گۆڕین لە سیستەمێکی دەسەڵاتخواز بۆ سیستەمێکی دیموکراسی کەڵکی لێ وەردەگیرێ. لەبەر ئەوەی بابەتی دیموکراسی ناوەندی قورسایی ئەم لێکۆڵینەوەیە، گۆڕینی سیستەمیش بە تیۆری دیموکراتیزەیشن ناودێر دەکرێ.

تیۆری گۆڕینی سیستەم لە رووی پێناسەوە ماناکەی گۆڕینی پێکهاتەی دەسەڵاتی سیاسییە. مەبەستی ئەم تیۆرییە لێکدانەوەی هۆکار و پرۆسە و ئاکامی گۆڕانی ئەم



پێکهاتەیەیە. بابەتی لێکۆڵینەوەکان دۆزینەوەی هۆکارەکانی هەرەسهێنانی سیستەمی کۆن و پرسە پەیوەندیدارەکان بە قۆناغی گواستنەوە بۆ سیستەمی نوێ، هەروەها جێگیربوونی دیموکراسی لە سیستەمی نوێدایە.

بە پێی روانگەی هانتینگتۆن لە پرۆسەی گۆڕینی سیستەمدا سێ شێوازی جیاواز لە پرسەکان سەرهەڵدەدا:

پرسی سیستەم: لێرەدا بە مانای کارکردی سیستەمێکە (دەسەڵاتخواز یان دیموکرات)

پرسی پەیوەندیدار بە قۆناغی تێپەڕبوون: مەبەست لێرەدا ئەو کێشە و گیروگرفتەیە کە بە هۆی گواستنەوەی سیستەم بۆ سیستەمێکی دیکە دێنە گۆڕێ.

ئەم پرسە گشتییانە کە پەیوەندییان پێکەوە هەیە: ئەم پرسانەن کە بەستراوە بە سیستەمی سیاسی نین، بەڵکو پەیوەندییان بە بارودۆخی تایبەتی کۆمەڵگا و فەرهەنگ و مێژووی هەر وڵاتێکەوە هەیە. لە خشتەی خوارەوە هانتینگتۆن ئەم پەیوەندییانە بەمجۆرە رەسم کردووە.

| دیموکراسی | پەرەسەندنی سیاسی قۆناغی تێپەڕبوون | سیستەمی دەسەڵاتخواز | جۆراوجۆریی پرسەکان |
|---|---|---|---|
| | | | تایبەتمەندییە گشتییەکانی تایبەت بە قۆناغی تێپەڕبوون |
| | | | مەسەلەکانی سیستەم |

به گشتی تیۆری گۆڕان (دیموکراتیزەیشن) سێ قۆناغی لە خۆگرتووە:

١- گۆڕینی سیاسی لە رژێمێکی سەرەڕۆ بۆ سیستەمێکی دیموکراسی.

٢- گۆڕینی ئابووری لە ئابوورییەکی دارێژراو و دەوڵەتی و داخراو بۆ ئابوورییەکی پشت بەستوو بە بازاڕی ئازاد.

٣- گۆڕینی کۆمەڵایەتی لە سیستەمێکی داخراو و رێنوێنی کراو لە سەرەوە بۆ سیستەمێکی کراوە و پلۆرالیستی.

سەرەڕای ئەوەی کە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن راستەقینەن، بەڵام بە کردەوە جۆرە یەکتر داپۆشینێك دەبینرێ و تایبەتمەندییەکانی هەر قۆناغێکی تێپەڕبوو هەمەچەشنییەك لەم یەکترداپۆشینە نیشاندەدا.

## گۆڕینی سیستەم

تیۆری گۆڕینی سیستەم لە لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵناسیدا بە دوو لقی سەرەکی: تیۆری سیستەم و تیۆری هەڵسووراوان (ئەکتۆر) یان بە واتایەکی دیکە تیۆری پێکهاتە و کارکرد دابەش دەبێ. پەرەسەندنی لایەنەکانی ئەم پەرەسەندنانە دوای دەستپێکردنی شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی پەرەسەندی سەرەکی گۆڕینی سیستەمی لێکەوتووەتەوە. ئێستا لەم پەیوەندییەدا چوار تیۆری جیا لەیەکتر هاتوونەتە بەر باس کە بریتین لە: تیۆری سیستەم، تیۆری پێکهاتە، تیۆری فەرهەنگ و تیۆری هەڵسووراوان.

لە رووی مێژووییەوە لقە جیاوازەکانی ئەم تیۆرییانە لە سەردەمە جیاوازەکاندا کەم تا زۆر بایەخیان پێدراوە. لە دەیەکانی ٥٠ — ٦٠ هەر دوو تیۆری سیستەم و پێکهاتە پتر بایەخیان پێدرا، لە ساڵەکانی ٨٠ تیۆری ئەکتۆر بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدرا لە درێژەی ساڵەکانی ٩٠ تیۆری فەرهەنگ سەرنجی زیاتری پێدرا.

لە بارودۆخی ئێستادا بە کردەوە لقە جیاوازەکانی تیۆری سیستەم گۆڕینی سیستەم، وەك یەك بایەخیان هەیە (Merkel 2000). ئەرکی ئەم تیۆرییانە



روونکردنەوەی هۆکار و پرۆسەکان، شکست و سەرکەوتنەکانی قۆناغی تێپەڕبوونە بەرەو سیستەمی نوێ لە بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا. لە تیۆری سیستەمدا بە تایبەتی لایەنگرانی تیۆری مۆدێرنیزاسیۆن هەوڵدەدن پەیوەندی نێوان گەشەی ئابووری و گەشەی سیاسی لە قۆناغی تێپەڕبووندا شی بکەنەوە. تیۆری پێکهاتە پێدادەگرێ لەسەر رۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکان و دەوڵەت و ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لە قۆناغی تێپەڕبوون، لایەنگرانی تیۆری فەرهەنگ پێیوایە بەرگرییەکان، کێشەکان و هێندێك جار هاوڕێیەتی فەرهەنگی و دینی و نەریتی لە رێڕەوی تێپەڕبوون چارەنووسسازە و لە تیۆری ئەکتۆر وەك فاکتەرێکی دیاریکەر، جەخت لەسەر رۆڵی هەڵسووڕاوان و بژاردە سیاسییەکان دەکرێ.

بێگومان هیچ کام لەم تیۆرییانە سەربەخۆ لە (کات و شوێن) بە تەنیایی توانایی وەڵامدانەوەی پرسی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی پرۆسەی دیموکراتیزەیشنیان نییە. ئەگەر وردتر لە شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی بڕوانین، دەبینین هۆکار و رەوتەکانی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە ئەورووپای رۆژئاوا و ئەمریکای لاتین پتر بە هۆی تیۆری بژاردە و هەڵسووڕاوانی سیاسی روون دەکرێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەوە دەتوانین هەرەسهێنانی (سۆسیالیزمی باو) و پرۆسەی دیموکراتیزەیشنی رۆژهەڵاتی ئەورووپا بە هۆی تیۆری پێکهاتە، وردتر شی بکەینەوە.

## تیۆری سیستەم

لە هەر سیستەمێکدا کۆمەڵە بەشێك پەیوەندییەکی دیاریکراویان پێکەوە هەیە، جۆری پەیوەندی ئەم بەشانە پێکهاتەی ئەو سیستەمە دەستنیشان دەکا، هەر سیستەمێك بۆ مانەوەی خۆی خاوەنی فۆنکسیۆن گەلێکی روونە.

تیۆری مۆدێرنی سیستەم لە لایەن Parsans بە شیکرنەوەی جیاوازیی فۆنکسیۆنەکان شکڵی گرت. بەم تیۆرییە دەتوانین پەرەسەندنی کۆمەڵگای نەریتی بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن روون بکەینەوە.

لەسەر بنەمای جیاوازیی فۆنکسیۆنەکان، کۆمەڵگا خاوەنی چەند بەشێکی جیاوازی ئابووری، سیاسەت، فەرهەنگی و هتد... لە پاڵ جیاوازیی فۆنکسیۆنەکان، جیاوازیی پێکهاتەی کۆمەڵگای مۆدێرن شکڵ دەگرێ و مرۆڤەکان بە کاراکتری جیاوازەوە بەرێوەبردنی ئەرکی جیاواز دەگرنە ئەستۆ، لە ئاکامدا بە شێوازی جۆراوجۆر پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا دەگرن. بە نموونەیەك دەتوانین ئەم بابەتە روونتر بکەینەوە: بۆ وێنە بوونی تاعوون لە سەدەی ناوەڕاست لە کۆمەڵگای نەریتی بە (سزای خواوەند) لێك دەدرایەوە و بۆ پێشگیریکردنی هیچ کاردانەوەیەك یان فۆنکسیۆنێك نەهاتە ئاراوە، بەڵام ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای مۆدێرندا لەمەڕ ئایدز جۆرێکی دیکە هەڵسوکەوت دەکرێ. بۆ وێنە لە بواری سیاسەتدا تێدەکۆشن بە گرتنەبەری چەندین رێوشوێن پێش بە پەرەسەندنی بگیرێ، هەوڵدەدەن نیشانەکانی باسبکەن. لە ئاستی پەروەردەییدا مەبەست ئەمەیە کە هۆکارەکانی شیبکرێتەوە و لە ئاستی زانستیدا هەوڵدەدرێ دەرمانێکی بۆ بدۆزنەوە، لە سیستەمی یاساییدا مەسەلەی یاسایی و کۆمەڵایەتی توشبووان دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لێرەدا دەبینین هەر بەشێك لە سیستەم بە پێکهاتەیەکی دیاریکراو، فۆنکسیۆنێکی دەستنیشانکراو دەگرێتە ئەستۆ. تیۆری سیستەم پەیوەندی نێوان پێداویستیی فۆنکسیۆنەکان و پێکهاتەی پێویست بۆ جێبەجێکردنی ئەم پێداویستییانە شیدەکاتەوە. لە روانگەی ئەم تیۆرییەوە پەرەسەندنی سەرکەوتووانەی جیاوازیی فۆنکسیۆنەکان یان بە واتایەکی دیکە مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگا دەبێتە هۆی گۆڕینی سیستەمی سیاسی. لەو رووەوە تیۆری کلاسیکی مۆدێرنیزاسیۆن پرۆسەی دیموکراتیزەیشن بەمجۆرە دادەرێژێ:

١- مۆدێرنیزاسیۆن دەبێتە هۆی بەدەسەڵات گەیشتنی چینی نێونجی. بۆ چوونە سەری ئاستی پەروەردە و فێرکردن و ئاسایشی گشتی، ناکۆکی چینایەتی بەرەبەرە کەم دەبێتەوە و هەوڵی بەشداری کۆمەڵایەتی پەرەدەستێنێ.



٢- بە پەرەسەندنی گەشەی ئابووری، رژێمی دەسەڵاتخواز بەرە و قۆناغێکی ناسەقامگیر دەڕوا.

٣- گەشە و پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی پەرەسەندنی داخوازیی گشتی و داوای بەشێك لە دەسەڵات لە لایەن نەیارانی سیستەمی دەسەڵاتخواز بەوپەڕی خۆی دەگا. رژێمیش توانای ئەنجامدانی نابێ مەگەر کاتێك چاوپۆشی لە مانەوەی خۆی بکا.

٤- ئۆرگانیزەکردنی دیموکراسی بەستراوەتەوە بە ئاستی بەرزی مۆدێرنیزەکردنی ئابووری. دەتوانین بنەماکانی کارپێکردنی تیۆری سیستەم لە ئاستێکی بەریندا بەمجۆرەی خوارەوە رەسم بکەین:




لە چوارچێوەی تیۆری سیستەمدا دەتوانین لقە فیکرییە جیاوازەکان لە یەکتر جیا بکەینەوە. تیۆری کلاسیکی مۆدێرنیزاسیۆن نوێنەرایەتی گرنگترین لقی فیکری ئەم تیۆرییە دەکا کە پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ Lipsetدا هەیە.

Lipset بە بەراوردکردنی چەند جۆر دەوڵەت لە ئەوروپا و ئەمریکای لاتین بەم ئاکامە گەیشت کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان گەشەی ئابووری (رێژەی شارستانی بوون، پیشەسازی بوون، ئاستی پەروەردەیی، داهاتی سەرانە، پەرەسەندنی راگەیەنە

گشتییەکان) و دیموکراسیدا هەیە. گەیشتە ئەم ئەنجامەی کە بە مۆدێرنیزەکردنی ئابووری لە لایەن دەوڵەتێکی بەهێز، سیستەم بەرەو دیموکراسی دەڕوا.

Parsons کە نوێنەرایەتی لقی فیکری دەکا زۆرتر پێ لەسەر کۆمەڵناسی تیۆری سیستەم دادەگرێ. لەم روانگەیەوە نەبوونی بنەمای گشتی لە سیستەمدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە سیستەم نەتوانێ وەڵامی داخوازییەکان بداتەوە و ناسەقامگیر دەبێ. ناتوانین کۆمەڵگای ئاڵۆزی ئەمڕۆ وەك سیستەمێك بە نۆرمێکی ناچاریی بەڕێوەبەرین، بەڵکو تەنیا بە (هاوپەیوەندی ئۆرگانیك) بەڕێوە دەچێ، (هاوپەیوەندی ئۆرگانیك) تەنیا بە پێکهاتە دیموکراتییەکان و سیستەمی یاسایی مۆدێرن پێکدێ.

Luhmann تیۆری جیاوازیی فۆنکسیۆنەکانی Parsonsی پەرەپێدا و ئەم بیرۆکەیەی Parsonsی رەتکردەوە کە (بەشی سیاسی سیستەم پێش بەشەکانی دیکەیە). ناوبراو شیکردەوە کە بوونی نۆرمە ئایدۆلۆژی، مەزهەبییەکان، هەروەها سەپاندنی سیاسەت لە تێکڕای بەشەکانی دیکەی سیستەمدا لەگەڵ رەوتی پەرەسەندنی جیاوازیی فۆنکسیۆنەکانی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن ناکۆکە، ناوبراو ئەوانی وەك (کۆدە نامۆکان) لە سیستەمدا هەڵدەسەنگێنێ، بۆ وێنە بوونی کۆدی سۆسیالیستی (بەرەی رۆژهەڵات) و مەزهەبیی (ئێران، ئەفغانستان و هتد...) بوو بە هۆی لاوازیی سیستەم و لە کۆتاییدا ناسەقامگیری و هەرەسهێنانی لێکەوتەوە. لە خشتەی پەیوەندداردا پەیوەندیی نێوان گەشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی رەسم کراوە.





## تیۆری پێکهاته

تیۆری پێکهاته بیرۆکەی کامڵبوونی ناچاریی لە تیۆری سیستەم کە "بەرهەمی کۆتایی مۆدێرنیزاسیۆن، گۆڕینی سیستەمە" قبووڵ ناکا. لە روانگەی ئەم تیۆرییەوە گۆڕینی سیستەم دەتوانێ لە رێڕەوە جیاوازەکان و بە پێداویستی جۆراوجۆرەوە دەستەبەر بکرێ.

تیۆری پێکهاته گرنگییەکی تایبەتی دەداتە بابەتی رۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندی ئەوان لەگەڵ دەوڵەت لە پرۆسەی قۆناغی تێپەربووندا. کەوابوو لێرەدا فاکتەری دابەشکردنی دەسەڵات لە چوارچێوەی کۆمەڵگا و سیاسەت کاریگەرییەکی دیاریکراوی لە سەرکەوتن یان شکستی پرۆسەی دیموکراتیزەیشندا هەیە.

لە کۆمەڵگادا دەسەڵات بە شێوەی نایەکسان دابەشبووە هەر بۆیە دەتوانین پلە و چۆنیەتی دیموکراسی لە پەیوەندی لەگەڵ چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵات پێناسە بکەین. لەم روانگەیەوە دیموکراسی ئاکامی رێککەوتنی عەقڵانی لە نێوان گرووپە نەیارەکانن و لە ئاکامدا هەرچی دەسەڵات دابەشبکرێ بە هەمان رێژەش دیموکراسی گەشە و پەرە دەستێنێ.

لەم تیۆرییەدا شێوازێکی دیکە لە تیۆری مۆدێرنیزاسیۆن پێکدێ کە بە پێداگرتن لەسەر پەرەسەندنی ئابووری — کۆمەڵایەتی، پەرەسەندنی پێکهاتەیی — کۆمەڵایەتی لە ناوەندی قورساییدا رادەگرێ. بەناوبانگترین نوێنەری ئەم تیۆرییە "moore"ە. ناوبراو بە خوێندنەوەی رێکخستن — مێژوویی رێگاکانی پەرەسەندنی لە پێش پیشەسازی بوون تالا جیهانی مۆدێرن، بە پێچەوانەی بانگەشەی تیۆرییەکانی کلاسیکی مۆدێرنیزاسیۆن کە بڕوایان بە پەیوەندییەکی هێڵیی راستەوخۆ لە نێوان پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بوو، چەندین رێڕەوی جیاواز لە پێناو مۆدێرنیزاسیۆنی کۆمەڵگا نیشاندا. یەکەم: شۆڕشی هاووڵاتیان بووە هۆی دیموکراسی بورژوازی (بەریتانیا، ئەمەریکا، فەڕەنسا). دووەم: شۆڕشەکانی "جووتیاری — کۆمۆنیستی" کە بووە هۆی پێکهێنانی دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکان (رووسیا و چین). بە



پێی بیرۆکەکانی moore پێنج فاکتەر کاریگەرییەکی بەرچاویان لە رێڕەوی دیموکراتیزەیشندا هەیە.

دابەشکردنی دەسەڵات لە ئاستی بژاردەکاندا.

هەڵکەوتی چینە کۆمەڵایەتییەکان (بورژوازی، خاوەن زەوییەکان).

پێکهاتنی یەکێتی و هاوپەیمانیی گرووپە سیاسییەکان.

دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان و

سەربەخۆیی دەوڵەت لە چینەکان.

لە روانگەی mooreەوە گرنگیی چینەکان بە تایبەت پێکهاتنی چینی سەرمایەدار لە گەیشتن بە دیموکراسی، رۆڵێکی دیار و بەرچاویان هەیە و ئەم رستە بەناوبانگەی mooreە کە دەڵێ: "بە بێ بورژوازی، دیموکراسی بوونی نییە". لەگەڵ ئەوەی کە تیۆری پێکهاتە وەك تیۆری سیستەم پەرەسەندنی ئابووری پێش مەرجێك بۆ پەرەسەندنی سیاسی دەزانێ، بەڵام بە پێچەوانەی تیۆری سیستەم کە پێیوایە هەڵگری سەرەکی دیموکراسی چینی نێونجییە، تیۆری پێکهاتە پێ لەسەر یەکێتییەکان و هاوپەیمانی چینە کۆمەڵایەتییەکان لە پرۆسەی دیموکراتیزەیشندا دادەگرێ.

ئەم روانگەیە بە هۆی Stephans، Rueschemeyer گەشەی پێدراوە و ئەوان سێ فاکتەریان بۆ پرۆسەی سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی دیموکراتیزەیشن زۆر بە گرنگ دەزانی: یەکەم، یەکێتی و هاوپەیمانی چینە کۆمەڵایەتییەکان. دووەم، رۆڵی دیاریکراوی چینی کرێکار. سێیەم، کۆمەڵگای مەدەنی کە لە رۆڵی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەتیدا هاوسەنگییەکی سەقامگیری لە کۆمەڵگا پێکهێناوە.

## تیۆری فەرهەنگ

لە روانگەی تیۆری مودێرنیزاسیۆن، بە پەرەسەندنی ئابووری و گۆڕینی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان، بایەخە سیاسییەکانیش گۆڕانیان بەسەردا دێ. بەرزبوونەوەی ئاستی پەرەسەندنی ئابووری دەبێتە هۆی گەشەی پەروەردە و فەرهەنگیی هەموان و لە ئاکامدا ئەنگیزە و هۆگرییە سیاسییەکان پەرە پێ دەدرێ و لەم پرۆسەیەدا بەشداریی سیاسی دێتە ئاراوە، هەروەها پەرەسەندنی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی ئابووری دەبێتە بناغەیەك بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی فەرهەنگی سیاسی لە کۆمەڵگا و بەردەوامی ئەم رەوتە لە راستیدا بەم شێوەیە دەچێتە پێش کە بە بەرزبوونەوەی ئاستی پەرەسەندنی ئابووری بایەخە مۆدێڕن و پۆست مۆدێڕنەکان پەرە پێ دەدرێ و سەرئەنجام کۆمەڵگاکان لە ئاستێکی فەرهەنگیی تا رادەیەك یەکسان خۆیان دەبیننەوە. بەناوبانگترین نوێنەری ئەم روانگەیە فرانسیس فۆکۆیامایە کە لە نامەی "کۆتایی مێژوو" ئاماژەی بەوە کردووەکە بە هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت گرنگترین کۆسپی دیموکراسی لە نێو چوو و پەرەسەندنی ئایدۆلۆژیا گەیشتووەتە کۆتایی خۆی و تەنیا دیموکراسی دوایین فۆرمی دەوڵەتە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا.

بەڵام لەگەڵ ئەم تیۆرییەدا لە سەرەتای دەیەی ٦٠ تیۆریگەلێك کە فەرهەنگیان وەك فاکتەرێکی تایبەتی لێك دەدایەوە هەبوون (Almond/ verba). شوبێرت بە راڤە و لێکدانەوەی، لێکۆڵینەوەکانی مێژوویی — رێکخستن و ئەو پرسیارنامانەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ بایەخ و بڕوا تاکەکەسی و بە کۆمەڵەکان ئامادە کراون، نامەیەکی لە ژێر ناوی "لێهاتوویی دیموکراسی" هێنایە بەر باس. لەسەر بنەمای ئەم نامەیە هەوڵدەدرێ شیبکرێتەوە کە بۆچی هێندێك وڵات و کۆمەڵگا بە سەرنجدان بە دەستراگەیشتن بە پەرەسەندنی ئابووری، نەگەیشتوونەتە دیموکراسی دڵخواز، هەروەها چۆنە کە هێندێك لە وڵاتانی پەرەنەگرتوو بە هەمان پلەی فەرهەنگی سیاسی توانایی وەرگرتنی دیموکراسیان هەیە.



هانتینگتۆن روونی دەکاتەوە کە فەرهەنگی سیاسی لە فەرهەنگی کۆمەڵایەتی هەڵقوولاوە و ئەویش ریشەی لە مەزهەب لە کۆمەڵگادا هەیە. کەوابوو بەو ئاکامە دەگلا کە بایەخە تاکەکەسییەکان و روانگەکانی مرۆڤ لە پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتخوازی جیاوازە و ئەویش لە جیاوازییە مەزهەبییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ و لەبەر ئەم هۆیە پرۆتستانیزم و هیندوئیزم وەك مەزهەبگەلی پشتیوانی دیموکراسی سەیر دەکرێ، بەڵام پێش هەموو شتێك ئیسلام و بە دوای ئەودا بودائیزم و کۆنفۆسیتیمۆس بە هۆی پێداگرییان لەسەر ژیانی باشتر لە جیهانی کۆتایی و قبووڵکردنی دەسەڵاتخوازی، هەروەها گوێڕایەڵی کوێرانە بووەتە هۆی زیندوو راگرتنی بایەخە دژە دیموکراتییەکان لە کۆمەڵگادا. لە روانگەی هانتینگتۆن "دەسەڵاتی شاراوە لە کۆمەڵگا" ئابووری نییە، بەڵکو فەرهەنگییە. هەر بۆیە ناوبراو "سەرەڕۆیی ئاسیایی" و "حکوومەتی ئیلاهی" بە رەقیبەکانی مۆدێلی دیموکراسی رۆژئاوایی دەزانێ. ناوبراو لە نووسراوەکانی بە تایبەت لە "شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی" پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئێستا لە شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی لە ١٩٢ وڵات تەنیا ١٢١ وڵات لە رێڕەوی گۆڕانکارییە دیموکراتییەکان هەڵکەوتوون. بەڵام لە راستیدا دەتوانین تەنیا ٨٥ وڵات وەك بەشێك لە وڵاتانی ئازاد چاو لێ بکەین کە ئەوان بە گشتیی ٣٥٪ی دانیشتووانی جیهان پێك دێنن. ناوبراو لە درێژەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا بە بڵاوکردنەوەی کتێبی "ململانێی فەرهەنگەکان" ئەم بیرۆکەیە شیدەکاتەوە.

بە قبووڵکردنی پێش مەرجی فەرهەنگ بۆ دەستپێکی تێپەڕبوون بۆ دیموکراسی دەبێ چاوەڕوان بین لە هێندێك ناوچەی جیهاندا کە بابەخی سیکۆلارەکان لە نێو خەڵکدا جێی گرتووە و هاوتەریب لەگەڵ گەشەی ئابووری، گرووپە چالاکەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنی پێکهاتوون، هەلی پەرەپێدان و قووڵبوونەوەی گۆڕانکارییە دیموکراتییەکان زۆرترە. لەم پەیوەندییەدا دەتوانین بۆ کیشوەری ئەمەریکا و نەتەوەکانی ئەورووپی — ئاسیایی کە لە سۆڤیەتی پێشوو جیابوونەتەوە شانسێکی

زیاتر لەبەرچاو بگرین. بەڵام لە بەرامبەردا پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە وڵاتانی ئیسلامی یان مەحکووم بە شکستە و یان لەگەڵ دژوارییی زۆر بەرەورووە، هەروەها شانسی زۆر لە پەیوەندی لەگەڵ پەرەپێدان و قووڵبوونەوەی گۆڕانکارییە دیموکراتییەکان لە ئەفریقیا و بەشێك لە وڵاتانی ئاسیایی نییە.

تیۆری فەرهەنگ پێ لەبەر رۆڵی فاکتەرە مەزهەبی و فەرهەنگی و نەریتییەکان لە پرۆسەی دیموکراتیزەیشن دادەگرێ. کەوابوو بە پێی ئەم تیۆرییە، دیموکراسی پێویستی بە پشتیوانیی فەرهەنگێك هەیە، فەرهەنگێك کە ئازادیی رادەربڕین، چاپەمەنی، کۆبوونەوەکان، مافی یاسایی ئۆپۆزیسیۆن و مافی مرۆڤ قبووڵبکات. ئەم جۆرە بایەخانە لە کورتخایەندا لە کۆمەڵگا پێکنایەت.

نموونە مەزهەبی و فەرهەنگییەکان لە کۆمەڵگای نەریتیدا فاکتەرگەلێکی گرنگن بۆ سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن. بە پێچەوانەی پێکهاتە سیاسی و ئابوورییەکان، گۆڕانکاری لە پێکهاتە مەزهەبی و فەرهەنگی و نەریتییەکان لە کورتخایەندا مەحاڵە.

ئەگەر کەشی مەزهەبی و فەرهەنگی لەگەڵ بایەخە دیموکراتییەکان بێ، هەلی سەرکەوتنی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن هەیە. جگە لەمە ئەم پرۆسەیە یان لەسەرخۆ و یان بە کردەوە زۆر دژوار دەبێ. بە کورتی دەتوانین روانگەی تیۆری فەرهەنگ بەمجۆرە شیبکەینەوە: فەرهەنگی دینی ناسیکۆلار کۆسپە لەبەردەم پەرەسەندنی بایەخە دیموکراتییەکان لە کۆمەڵگادا.

نموونەکانی فەرهەنگی مەزهەبی، دیاردەیەکی وەستاو نییە، بەڵکو ئەوان بە درێژایی سەردەم و لە ژێر کاریگەری گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی مودێرنیزاسیۆن، گۆڕانیان بەسەردا دێ.

گۆڕانکاری لە کلێسەی کاتۆلیك و گۆڕینی نموونە مەزهەبییەکان لە ژاپۆن، کۆریا و تایوان و تایلەند، هەوەها بەشێك لە ئیسلام دروستی ئەم بیرۆکەیە دەسەلمێنێ. بەڵام لە لایەکی دیکەوە دەبێ بڵێین کە گۆڕانکاریی ئاماژەپێکراو لە پرۆسەیەکی



کامڵبوونی درێژخایەن پێکدێ و بە دەگمەن دەتوانین بە ستراتیژییەکی دیاریکراو ئەم گۆڕانکارییانە پێکبێنین.

لە تەنیشت فەرهەنگی مەزهەبی، نەریتەکان و بایەخەکان و پێوانەکانی هەڵسووکەوتی سەقامگرتوو لە کۆمەڵگا رۆڵی گرنگ لە پەرەپێدانی سیاسی دەگێڕن. ئەم فاکتەرانە لە ژێر ناوی "سەرمایەی کۆمەڵایەتی" کورت دەکرێنەوە. لە قۆناغی تێپەڕبوون لە سیستەمی دەسەڵاتخواز بۆ دیموکراسی "سەرمایە کۆمەڵایەتییەکان" رۆڵێکی گرنگ وە بەرچاو دەگێڕن.

## تیۆری ئەکتۆر

ئەم تیۆرییە بۆ یەکەم جار لە لایەن Rustow هاتە بەر باس. ناوبراوساڵی ١٩٧٠ لە وتارێکدا بە ناونیشانی تێپەڕبوون بۆ دیموکراسی، نموونەی قۆناغبەندیی (فاز) قۆناغی تێپەڕبوون لە سیستەمی دەسەڵاتخواز بۆ دیموکراسی تیۆریزە کرد. ناوبراو بە جێگای پێش مەرجەکانی پێکهاتەیی و کەمبوونی ئەو بۆ دیموکراسی، ستراتیژی و تاکتیك، هەروەها ئەنگیزە و هۆگریی ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لە ناوەندی قورسایی دەستنیشان کرد.

لە درێژەی لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە تیۆری ئەکتۆر بەرهەم و وتارەکانی Lins رۆڵی دیاریکراوی هەیە. ناوبراو لە شیکردنەوەی مۆدێلەکان لە چوارچێوەی تیۆری ئەکتۆر، فامتۆر ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کەم تا زۆر زوك فاکتەرە سەربەخۆکان چاو لێ کردووە و مەرجی ناچاریی فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بۆ دەستپێکی قۆناغی تێپەڕبوون قبووڵ ناکا، هەر چەند وەك بنەما سەیریان دەکا و گرنگیی پێدەدا. ئەوان چوارچێوەی کارکردەکان دیاریدەکەن، بەڵام چۆنیەتی و ئاکامی ئەم کارکردانە پەیوەندی بە تیۆری ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

خاڵی بەرچاوی تیۆری ئەکتۆر، بەستراوەیی ئەوە بە چەندین پارامێتر لەوانە ئەولەوییەتەکان، ستراتیژییەکان و خاڵە لاواز و بەهێزکانی ئەکتۆرەکانە. لە

لێکۆڵینەوەکانی پەیوەندیدار بە تیۆری ئەکتۆری گرووپە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەتوانین هەڵسووراوان لە یەکتر جیا بکەنەوە و ئەوان بە پێی ئەنگیزە تایبەتییەکانیان پۆلێن بەندی بکەین. بۆ وێنە، بۆ سوپا گرنگە کە سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ یان بۆ سەرمایەدارەکان پاراستنی سیستەمی ئابووری گرنگە، هەروەها بۆ هاووڵاتیان مافی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی لە پلەی یەکەمی ئەولەوییەتەکاندایە. بە پێی جیاوازی لە بۆچوونەکان، بە بێ لەبەرچاوگرتنی یەکێتی و هاوپەیمانییەکان دەتوانین ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بۆ وێنە لە چوارچێوەی سوپا، بوروکراسی دەوڵەتی، گرووپە چالاکەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی مەدەنی، چینی کرێکار، حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان و هتد... لە یەکتر جیا بکەینەوە. دووەمین شێواز بۆ شیکردنەوەی جیاوازییەکان، هەڵکەوتی ستراتیژی ئەکتۆرەکانە کە دەتوانێ لە لایەك لە جەمسەری دەسەڵات و لە لایەکی دیکەوە لە ئۆپۆزیسیۆندا بێ. بۆ وێنە لە ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکاندا سوپا دەتوانێ لەگەڵ سەرمایەدارەکان و خاوەن زەوییەکان بە پشتیوانیی بوروکراسی دەوڵەتی جەمسەرێکی دەسەڵات بێ و لە لایەکی دیکە حزبە میانڕەو و ڕادیکاڵەکان کە لە لایەن توێژی نێونجی و خوارەوەی کۆمەڵگە پشتیوانی دەکرێن، هاوپەیمانییەك پێکبێنن.

تیۆری ئەکتۆر لەسەر ئەم گریمانەیە داڕێژراوە کە گۆڕینی سیستەم ئاکامی پێش مەرجی بەناچارکردنی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ناوەندی قورسایی گۆڕینی سیستەم، کارکردی ستراتیژی ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و بژاردە سیاسییەکانە. لێرە بە ئاشکرایی جیاوازی ئەم تیۆرییە لەگەڵ تیۆرییەکانی سیستەم و پێکهاتە کە پێیوایە پرۆسەی گۆڕینی سیستەم، تەواوکەری جیاوازی فۆنکسیۆن و پێکهاتەکانە لە سیستەم و خوارووی سیستەم، دەتوانین ببینین و لێرەوە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە پێچەوانەی تیۆری سیستەم و پێکهاتە کە بەگشتی گۆڕانکاری لە ئاستێکی بەرفراواندا لەبەرچاو دەگرێ، لە تیۆری ئەکتۆر و بژاردە سیاسییەکان، گۆڕانکاری لە ئاستی تاکەکەس واتە پێ



لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەتی هەڵسوڕاوان و بژاردە سیاسییەکان لە پرۆسەی دیموکراتیزەیشن دادەگرێ.

لەم تیۆرییەدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ئەم پرسیارە دێتەبەرباس کە "چۆن ئەم گۆڕانە لە سیستەمدا پێکدێ؟" لە کام یەك لە قۆناغەکان و لە چ فازێکدا، کام ستراتیژی و بەچ هێزێکی هاوپەیمان بەڕێوە دەچێ؟ هەڵبژاردنی ئەم یان ئەو ڕێڕەو چ کاریگەرییەك لە پرۆسەی دیموکراتیزەیشن دادەنێ؟ ئەو فاکتەرانە ڕۆڵیان هەیە بریتین لە: ئامانج و هۆگرییەکان، ئەولەوییەتەکان، وەرگرتنەوەکان، بڕیارەکان، ستراتیژی، هەڵسووکەوتی بژاردە سیاسییەکان و تەواوی ئۆپۆزیسیۆن، هەروەها پرسەکانی پەیوەندیدار بە ڕابردوو.

بە پێچەوانەی دیترمینیزمی زاڵ بەسەر پێکهاتەی ئابووری، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی تایبەتمەندیی تیۆری ئەکتۆر لەوەدایە کە ئاکامی هەڵسووکەوتی چالاکە سیاسییەکان ئاوەڵا و ناڕوونە. دەرئەنجامی پرۆسەیەکی ئەوتۆ کەمتر پەیوەندی بە پێکهاتە و بنەما ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە، بەڵکو زۆرتر بەستراوە بە هەڵسووکەوتی سیاسیی بژاردەکان لە ڕەوشێکی سیاسیی دیاریکراودا هەیە.

بە کورتی دەتوانین تیۆری ئەکتۆر بەمجۆرە پێناسە بکەین کە دیموکراسی بەرهەمی بەناچارکردنی پەرەسەندنی ئابووری- کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ئاکامی چالاکیی حزب و گرووپ و بژاردە سیاسییەکانە. لێکدانەوەی ستراتیژیك، کەڵك وەرگرتن لە رایەڵکەکان و هۆگریی تاکەکەسی و بە کۆمەڵ، دۆزینەوەی ئەو شێوازانەی کە لە نێو گرووپە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیدا وەردەگرین، فاکتەرە سەرەکییەکانی تیۆری ئەکتۆرە.

گرووپ و ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان هەوڵدەدەن، کە دەسەڵاتی پێویست بۆ مانۆڕە سیاسییەکان بەدەستبێنن و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ هەلی پێویستیان وەك: ماڵی و ئابووری، ڕێزیان لە کۆمەڵگە، توانایی و زانستی پێویست و پەیوەندییان هەبێ. لە خشتەی خوارەوە پەیوەندی ئەم هەلانە دەبینین:

لە چوارپێوەی تیۆری ئەکتۆر چەندین شێوازی تیۆری جیاواز هەیە. لە خشتەی خوارەوە ئەم شێوازە تیۆرییانە رەسم کراوە.






| سالّ | لێکۆڵەران | تیۆری ئەکتۆر |
|---|---|---|
| ١٩٨٦ | O’Donnell / Schmitter | لقی تاقیکاری – شیکردنەوە |
| ١٩٩٠ | Dip alma | |
| ١٩٨٦ | Pezeworski | لقی هەڵبژاردنی عەقلانی |
| ١٩٩٢ | Colomer | |
| ١٩٨٩ | Burton / Higley | لقی چڕبوونەوەی سەر بژاردە سیاسییەکان |
| ١٩٩٢ | Cunther | |

بەناوبانگترین نوێنەری روانگەیەکی تیۆری، (Adam pizeworski)ە، کە جیاوازییە تایبەتییەکانی قۆناغە جۆراوجۆرەکانی دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و شێوازی بەناوبانگی هەڵبژاردنی عەقلانی (Choice Rational) یان بە واتایەکی دیکە شێوازی "سوود و زیانی"ی گەڵاڵە کردووە. بەشە سەرەکییەکانی ئەم شێوازە بریتین لە:

هەر کردەوەیەکی سیاسی لە چوارچێوەی لێکدانەوەی عەقلانی سوود و زیان هەڵدەسەنگێندرێت.

ناسنامەی بەکۆمەڵ، ئاکامی بەدواداچوونی عەقلانیی تاکەکەسییە.

ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، ئەڵتەرناتیڤێك هەڵدەبژێرن کە زۆرترین سوودیان پێ بگەیەنێت.

مەبەست لەم شێوازە لێکدانەوە و تاوتوێکردنی کارکردە ستراتیژییەکانی ئەکتۆرەکان، هەڵسووڕاوان و بژاردەکان لە پرۆسەی قۆناغی تێپەڕبوون لە دەوڵەتێکی دەسەڵاتخواز بۆ سیستەمێکی دیموکراتییە.

لە چوارچێوەی ئەم شێوازەدا pizeworsk رۆڵی گرووپە سیاسییەکانی لە ئەفریقیای باشوور لە رەوتی گۆڕینی سیستەمدا تاوتوێ کرد.

قۆناغی یەکەم کەشی ئاوەڵای سیاسی (لیبرالیزاسیۆن) لە سیستەمدا ١٩٧٩-١٩٩٠.

قۆناغی دووەم قۆناغی تێپەڕبوون (transition 1994-1990).

قۆناغی سێیەم سەقامگیرکردن و جێگیرکردنی دیموکراسی ١٩٩٤-١٩٩٧.

نوێنەری روانگەی دیکە، O'Donnell و Schmitter. لەم روانگەیە هەوڵدەدرێ کە بە لێکدانەوەی ئەزموونە جیاوازەکانی گۆڕینی سیستەم، ئاکامی گشتیی لە پەیوەندی لەگەڵ چۆنیەتی هاوپەیمانی و یەکێتییەکان و نموونەیەکی دیاریکراوی کرداری بۆ قۆناغی تێپەڕبوون دابڕێژرێ و ئەم روانگەیە، تا رادەیەك پشت بە نێونجییەکان و ئەگەرەکان دەبەستێ و گرنگترین خاڵەکانی لێکۆڵینەوەی ئەورووپای باشوور و ئەمەریکای لاتینە. لەم شێوازەدا، دیموکراسی لە دوو قۆناغدا"قۆناغی تێپەڕبوون (transition)" و "جێگیربوونی دیموکراسی (Democratic establishment)" دەستەبەر دەکرێ، هەروەها "قۆناغی تێپەڕبوون" بۆ خۆی بریتییە لە دوو قۆناغی جیاواز" قۆناغی لیبراڵی (لیبرالیزاسیۆن)" و "دیموکراتیزەیشن" .

بە گشتی لە لێکۆڵینەوەکانی تیۆری گۆڕینی سیستەمدا، پرۆسەی گۆڕینی سیستەمە بە سێ قۆناغی جیاواز دابەشدەکرێ: قۆناغی لیبراڵی (لیبرالیزاسیۆن)، قۆناغی تێپەڕبوون یان دیموکراتیزەیشن (transition) و جێگیربوونی دیموکراسی (Democratic establishment).

لە خشتەی خوارەوە چوارچێوەی و مەیدانی کردەوە و بڕیاردانی ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا بە کورتی پۆلین بەندی کراوە.

| | |
|---|---|
| قۆناغی لیبراڵی | چوارچێوەی کردار و بڕیاردانی ئەکتۆر لە رەوشێکی "دڵنیا نەبوون" و "لێبڕاو نەبوون" هەڵکەوتووە |
| قۆناغی تێپەڕبوون | چوارچێوەی کردار و بڕیاردانی ئەکتۆر دەبێ لە چوارچێوەی لایەنیکەمی دیموکراسیدا بێ |
| جێگیربوونی دیموکراسی | پەرەپێدان و قووڵبوونەوەی دیموکراسی لە ئاستی هەڵسووکەوت، سەقامگیریی و جێگیرکردنی دیموکراسی کاتێکە کە جێگرەوەیەکی دیکە لە بەرامبەریدا نەبێ |



## شێوازی تیۆری ئادام پرزۆرێسکی

بە شێوەی گشتی روانگەی پرزۆرێسکی لەسەر ئەم بنەمایە دارێژراوە کە ناوبراو رەوتی دیموکراتیزەیشنی لە سێ قۆناغدا گەڵاڵە کردووە و بە ڕێگای ئەم شێوازەوە جیاوازییە تایبەتییەکانی قۆناغە جۆراوجۆرەکان لە پرۆسەی گۆڕینی سیستەم روون دەکاتەوە. لەم پەیوەندییەدا چەندین سیناریۆی جۆراوجۆر دەخاتەڕوو و نیشانی دەدا کە چۆن ئەنگیزە و ئەولەوییەتەکانی ئەکتۆرە جۆراوجۆرەکان پێکدێن و پەرە دەگرن و بە دوای ئەوەدا هەلی هاوپەیمانی و یەکێتییە هەمە چەشنەکان نیشاندەدا و لە کۆتاییدا ئەڵتەرناتیڤی گونجاو لە بار پێشنیاز دەکا. بە شێوەی گشتی خاڵی دەستپێکی پرزورسکی ئەمەیە کە رژێمە دەسەڵاتخوازەکان بە هۆی قەیرانی نێوخۆیی و دەرەکی دەکەونە رەوشێکی ناسەقامگیرەوە و لە یەکەمین قۆناغی رەوتی دیموکراتیزەیشن واتە لیبرالیزاسیۆنن کەلێن دەکەوێتە نێو ئەم رژێمە و ناوبراو پێیوایە لیبراڵەکان لە توندڕەوەکان دوور دەکەونەوە و ئەوان بۆ کۆنترۆڵکردنی قەیرانی پەرەگرتوو هەوڵدەدەن کە چالاکییە دیموکراتییەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی مەدەنی بە فەرمی بناسن و بە راشکاوی نیشانی دەدەن کە هۆگرییان بۆ هاوکاری لەگەڵ هێزە چالاکەکان هەیە. ئەوی روونە ئەمەیەکە لەم قۆناغەدا سیستەمی سیاسی ناگۆڕدرێ کەوابوو تایبەتمەندیی سەرەکی ئەم قۆناغە پرۆسەی بڕیاردانی پەیتاپەیتا، هەڵسەنگاندنی سوود و زیان و ئەولەوییەتەکان و هۆگری ئەکتۆرە سیاسی کۆمەڵایەتییەکانە. ئاکامی ئەم قۆناغەیان دیکتاتۆری لە دوو شێواز (کۆنترۆڵ نەکراو، ئازادییە سنووردارەکان)، یان چوونە نێو قۆناغی دیموکراتیزەیشنە.

بە پێکهێنانی کەشی سیاسیی ئاوەڵا لە رژێمی دەسەڵاتخوازی پرزورسکی، ئەگەری پێکهاتنی دوو جەمسەری سیاسی هەیە و بە شێوەی ئاسایی هاوپەیمانییەکان لە چوارچێوەی ئەم دوو جەمسەرە پێکدین. لە لای دەسەڵاتداران، توندڕەو ریفۆرمیستەکان هەن و لە بەرامبەردا واتە ئۆپۆزیسیۆنی میانڕەو و رادیکاڵەکان وەستاون تەنیا بە هاوپەیمانیی هێزە ریفۆرمیست و میانڕەوەکان دەتوانرێ دامەزرانی

بنەماکانی دیموکراسی گرەنتی بکرێ. لە ئاکامدا بە پتەوکردنی ئەم هاوپەیمانییەتییە قۆناغی کۆتایی دەست پێ دەکا. لەم قۆناغەدا دیموکراسی نوێ دەبێ بتوانێ پێکهاتە نوێیەکان بونیاد بنێ. ئەم قۆناغە گرنگترین قۆناغی رەوتی دیموکراتیزەیشنە. هێزە یەکگرتووەکان لە تەنیشت یەکتر بۆ دیموکراسی خەبات دەکەن و توانیویانە لایەنی دەسەڵاتخواز وەلابنێن ئێستا بۆ وەدستهێنانی پێگەی باشتر پێویستە لە چوارچێوەی بنەماکانی دیموکراتی لەگەڵ یەکتر بکەونە ململانێوە و هەر بۆیە لەم قۆناغەدا مەترسی جەنگی دەسەڵات لە ئارادایە. لە خشتەی خوارەوە پرزورسکی هەلی هاوپەیمانییە جۆراوجۆرەکان لە نێوان گرووپە سیاسییەکان لە پرۆسەی رەوتی دیموکراتیزەیشن نیشاندەدا.

| هاوپەیمانیی میانڕەوەکان لەگەڵ | | | |
| --- | --- | --- | --- |
| چاکسازیخوازان | رادیکاڵەکان | | |
| رژێمەکانی پێشوو بە ئازادیی سنووردار دەمێننەوە | رژێمی پێشوو دەمێنێتەوە | توندڕەوەکان | هاوپەیمانی چاکسازیخوازان لەگەڵ |
| دیموکراسی لەگەڵ گرەنتی | دیموکراسی بەبێ گرەنتی | میانڕەوەکان | |

## تیۆری ئەکتۆر لە کردەوەدا

پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە رووی بەکارهێنانەوە لە تیۆری ئەکتۆر هەروەك ئاماژەی پێکرا بریتییە لە سێ قۆناغ: قۆناغی لیبراڵی کە بە پێی بۆچوونی هانتینگتۆن "کەشی ئاوەڵای سیاسیی کۆنترۆڵ کراو" و "قۆناغی تێپەڕبوون" بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە لایەن بەشێك لە ئۆپۆزیسیۆن یان بە واتایەکی دیکە بژاردە دژبەرەکان و قۆناغی سەقامگیری و جێگیربوونی دیموکراسییە.



## قۆناغی لیبرالیزەیشن

ئەزموونەکان نیشانیان داوە کە هۆکاری دەستپێکردنی قۆناغی لیبراڵی بەرهەمی پەرەسەندنی ئابووری یان بوونی ئۆپۆزیسیۆنێکی بەهێز نییە، بەڵکو ئاکامی بڕیاری دەوڵەتی دەسەڵاتخوازە. کەشی ئاوەڵای سیاسی دەتوانێ بە بێ بوونی ئۆپۆزیسیۆن و ئۆپۆزیسیۆنی لاوازیش روو بدا، بەڵام بوونی ئۆپۆزیسیۆنی بەهێز و یەکگرتوو رۆڵی گرنگ و بەرچاوی لە گەشەپێدانی قۆناغی لیبراڵی بۆ قۆناغی تێپەڕبوون دەگێڕێ.

ناوەرۆکی قۆناغی لیبرالیزاسیۆن قبوولْ و پەرەپێدانی مافی هاوڵاتیان و گرووپە سیاسییەکان و هەڵسووڕاوانی بواری مەدەنییە، لەم قۆناغەدا ئازادییە لیبراڵییەکان لەوانە ئازادیی رادەربڕین، کۆبوونەوە و چالاکیی سیاسی رێی پێ دەدرێ، بەڵام مافی بەشداری لە دەسەڵات کە تایبەتمەندی سیستەمێکی دیموکراتییە لەم قۆناغەدا قبوولْ ناکرێ.

قۆناغی لیبراڵی زۆرجار بە سەرهەڵدانی کەلێن لە نێوان هێزە دەسەڵاتدارەکان دەست پێدەکا. بەشێکی ئەم جیاوازییانە بە شێوەی گشتی قەیران لە سیاسەتی دەرەوەدایە. لە هێندێك حاڵەتدا سەرکەوتنە ئابوورییەکانیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشێك لە هێزە دەسەڵاتدارەکان بۆ رەوایی دان بە هێزی خۆیان لە کۆمەڵگەدا هەوڵگەلێك دەست پێ بکەن. بڕیاری چارەنووسساز لە دەستپێکی قۆناغی لیبرالیزاسیۆن لە لایەن هێزە دەسەڵاتدارکان ئەمەیە کە "ئایا ئۆپۆزیسیۆن هەروا سەرکوت بکرێ یان ئەوەیکە چالاکییەکانیان رێ پێ بدرێ؟" لە راستیدا بنەمای بڕیاردان لەم پەیوەندییەدا هاوکێشەی "سوود و زیان" بۆ ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان جیاوازە.

بە پەرەپێدانی چالاکیی گرووپە هەڵسووڕە نوێیەکان کە بەستراوەتە بە پلە و توانایی رێکخستنی جەماوەر، ئاڵۆزیی سیاسی لە کۆمەڵگە بەوپەڕی خۆی دەگا و بە هۆی ئەم ململانێیەوە چوارچێوە یاساییەکان پەرەپێدەدرێ و هاوکات فشاری زۆرتر لەگەڵ داخوازیی نوێ بەرەورووی گرووپی دەسەڵاتدار دەکرێ. لەم حاڵەتەدایە کە دەسەڵاتداران یان دەبێ بۆ چاکسازیی زۆرتر یان سەرکوت بڕیار بدەن. گرووپە

بەرژەوندخواز و ریفۆرمیستەکانی دەسەڵاتدار دەبێ بتوانن بە توندڕەوەکانی نێو دەسەڵات بسەلمێنن کە ئەوان توانایی کۆنترۆڵی ڕەوتی لیبڕالیزاسیۆنیان هەیە و لەم ڕێگایەوە ناچاریان بکەن چالاکیی ئۆپۆسۆزیسیۆن قبووڵبکەن.

لە سەرتای قۆناغی لیبڕالیزاسیۆن بە شێوەی گشتی ڕووناکبیران و فێرخوازان و هونەرمەندان چالاکن.

ئەوان بە ڕەخنەگرتن و دەربڕینی نارەزایەتی هەوڵدەدن کە کەشی گشتی بخەنە ژێر کاریگەرییەوە. بە دوای ئەواندا گرووپە لاوەکییەکانی سیستەمی دەسەڵاتخواز کە بەشێك لە قازانجی ئابووری و کۆمەڵایەتی سیستەم ئەوانیش دەگرێتە زمانی نارەزایەتی هەڵدەبڕن. بە پەرەپێدانی چالاکیی گرووپەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە لە ڕاستیدا داینەمۆی چالاکیی سیاسیی ئەم قۆناغەن، ڕەخنەگرتن و دەربڕینی نارەزایەتی بەوپەڕی خۆی دەگا. ئەم گرووپانە تایبەتن بە توێژی ناوەندی کۆمەڵگە. لە هێندێك حاڵەتیشدا ڕۆڵی چارەنووسساز، دەکەوێتە ئەستۆی هێزی کرێکار لە کۆمەڵگە کە لە چوارچێوەی یەکێتی و سەندیکاکان ڕێکخراون.

بەهەرحاڵ ڕۆڵی سەرەکی و چارەنووسساز هاوپەیمانی و هەماهەنگی ئەم گرووپانەیە کە بتوانن لەسەر ئەولەوییەتە دیاریکراوەکان ڕێکبکەون. هەر چەند ڕوونە کە هەر یەك لەم گرووپانە دەبێ چاوپۆشی لە هێندێك لە داخوازییە تایبەتییەکانی خۆیان بکەن.

O'Donnell و Schmitter پێیان وایە کە هەر چی دەستپێکی قۆناغی لیبڕالیزاسیۆن چاوەڕوان نەکراو بێ ئەگەری سەرهەڵدانی نارەزایەتیی گشتی کە دەبێتە هۆی قۆناغێکی سەقامگیری تێپەڕبوون، زۆرترە. چونکە ئامانجی گشتی گرووپەکان لە ڕاستیدا هۆگری و جیاوازییەکانیان دادەپۆشێ، بەڵام بە پێچەوانەوە پرۆسەی لیبڕالیزاسیۆن کە بۆ ماوەیەکی درێژ لە سەرەوە گەڵاڵە و کۆنترۆڵ دەکرێ لە باشترین حاڵەتدا دەبێتە هۆی دیموکراسییەکی سنووردار. بەڵام ئەزموونەکان سەلماندوویانە کە قۆناغی لیبڕالیزاسیۆن یان بە قۆناغی تێپەڕبوون کۆتای پێ دێ یان تووشی شکست دەبێ کە ئیتر باسێك لە کەشی ئاوەڵای سیاسی نایەتە گۆڕێ. چونکە دینامیزمی



پەرەپێدانی ئازادییە لیبڕاڵییەکان لە سیستەمێکی سەرەڕۆ، بەجۆرێکە کە ناتوانێ لە چوارچێوەی سنوورەکانی سیستەمدا بمێنێتەوە.

## قۆناغی تێپەڕبوون

بە گشتی قۆناغی تێپەڕبوون بریتییە لە دوو بەش: تێکەوەپێچانی سیستەمی پێشوو و جێگیرکردنی دیموکراسی.

خاڵی ئەرێنی لە قۆناغی وەلانانی سیستەمی دەسەڵاتخواز، یەکێتی هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانە، بەڵام بۆ دامەزرانی دەوڵەتی نوێ و جێگیرکردنی دیموکراسی، ململانێی نێوان ئۆپۆزیسیۆن مەرجێکی سەرەکییە. بەهەرحاڵ خەبات بۆ دیموکراسی لە بەرەدا بەڕێوەدەچێ لە لایەك دژی سیستەمی سەرەڕۆ و لە لایەکی دیکەوە ململانێ لەگەڵ هاوپەیمانەکانی خۆیان بۆ وەدەستهێنانی پێگەی باشتر لە سیستەمی نوێدا.

میانڕەو و چاکسازیخوازان هەڵسووڕاوانی سەرەکی ئەم قۆناغەن. توندڕەوە دەسەڵاتدارەکان و ڕادیکاڵە ئۆپۆزیسیۆنەکان لە پەراوێزدان. فشار و هەڕەشەکان لە لایەن ئەم دوو هێزەوە لە لایەك ڕاستیی هەڵوێستی میانڕەوەکان دەسەلمێنێ، بەڵام لە لایەکی دیکەوە مەترسی هەیە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاڵۆزییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان.

پرسی سەرەکی لەم حاڵەتەدا دارشتنی ئەولەوییەتە سیاسییەکان و هەلی گەیشتن بە هاوپەیمانییە. لە پێناو گەیشتن لە بارودۆخێکی وەهادا چاکسازیخوازانی نێو سیستەم دەبێ بتوانن چالاکیی توندڕەوەکان پووچەڵ بکەنەوە و میانڕەوەکانی نێو ئۆپۆزیسیۆن دەبێ بتوانن ڕادیکاڵەکان بخەنە پەراوێزەوە. ئاکامی پەرەسەندنی سیاسی لە بارودۆخێکی ئەوتۆ لە ڕوانگەی پرزورسکی حاڵەتەکانی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە:

ڕژێمی دەسەڵاتخواز وەك خۆی دەمێنێتەوە.

لە ڕژێمدا چاکسازییەکی سنووردار ئەنجام دەدرێ.

دیموکراسی سنووردار لەگەڵ گرەنتیدان بە توندڕەوەکانی سیستەمی دەسەڵاتخواز.
سیستەمی دیموکراسی.

تێکەوپێچانی سیستەمی پێشوو دەتوانێ سەرکەوتوو بێ بە مەرجێك میانڕەوەکان لە سەرەتادا ئامادەی قبووڵی دیموکراسی سنووردار لەگەڵ گرەنتیدان بە توندڕەوەکانی دەسەڵاتخوازیان هەبێ و هاوتەریب لەگەڵ ئەو بتوانن لە هاوپەیمانەتی لەگەڵ چاکسازیخوازن، سەرچاوەکانی دەسەڵاتی توندڕەوەکان کۆنترۆڵ بکەن و لە لایەکی دیکەوە میانڕەوەکان دەبێ خاوەن پێگەیەکی جەماوەری ئەوتۆ بن کە بتوانن رادیکاڵەکان کە خوازیاری بێ ئەملاوئەولای دیموکراسین بخەنە پەراوێزەوە. مانۆرگەلی ئەوتۆی سیاسی لە حاڵەتێکدا، کە کۆمەڵگە ئاڵۆز بێ، ئەوەندە ئاسان نییە، چونکە هەر جۆرە هاوپەیمانییەك لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا زۆر لەرزۆکە. لە لایەکی دیکەوە هاوتەریب لەگەڵ تێکەوەپێچانی سیستەمی کۆن، باسی دامەزرانی پێکهاتەی نوێ دەبێتە بابەتی مشتومڕ لە نێوان هاوپەیمانانداا.

لە دانوستانی سیاسی بۆ دەستڕاگەیشتن بە ستراتیژییەکی دیاریکراو بۆ دامەزرانی پێکهاتی نوێ، هەروەها دۆزینەوەی شێوازەکان بەکردەوە، ئەکتۆرە سیاسییەکان دەکەونە رەوشێکی پارادۆکسەوە. ئەوان لە لایەك دەبێ لە چوارچێوەی یاسا بجووڵێنەوە و لە لایەکی دیکەوە دەبێ پێگەیەکی لەبار و گونجاو بۆ ململانێی سیاسی برەخسێنن، لە راستیدا ئەوان هەم یاسادانەر و هەمیش بەڕێوەبەرن. بڕیارەکان لەم قۆناغەدا زۆرجار دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەولەوییەتی گرووپە نەیارەکانەوە لە باشترین حاڵەتدا رەوشەکە بەجۆرە دەبێ کە هاوسەنگیی هێز لە نێوان لایەنە سیاسییەکان روون نییە و هەڵسووڕاوان شێوەگەلێك هەڵدەبژێرن کە هەموو هێزەکان بە شێوەی یەکسان لە پرۆسەی دیموکراتسازی بەشدارن و بە بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن قۆناغی تێپەڕبوون کۆتایی پێ دێ.

تیپۆلۆژی گۆڕینی سیستەم لە خشتەی خوارەوە پۆلین بەندی کراوە و بۆ ئەم مەبەستە پێنج تایبەتمەندی کە کاریگەرییەکی چارەنووسسازی لە پێکهێنانی ئەم گرووپانە هەیە لەبەرچاو گیراوە. **"دەستپێك"، "پرۆسە"، "ئەکتۆر"، "پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگە و "دەرئەنجام"**.



لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانی ئاماژەپێکراو دەتوانین گرووپە جۆراوجۆرەکان لە یەکتر جیا بکەینەوە کە بریتین لە "کودەتا"، "چاکسازی"، "گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە"، "جێگۆڕکێی دەسەڵات"، "وەلانان"، "شۆڕش".

بە خوێندنەوەی تیپۆلۆژی ئاماژەپێکراو بۆمان دەردەکەوێ کە تەنیا سێ جۆری گۆڕینی دەسەڵات لە چوارچێوەی قۆناغی تێپەڕبوون پێناسەکراوە کە بریتین لە: "گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە"، "جێگۆڕکێی دەسەڵات"، "وەلانان".

| شۆڕش | وەلانان | جێگۆڕکێ | گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە | چاکسازیی | کودەتا | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| لە خوارەوە | لە خوارەوە | لە سەرەوە بۆ خوارەوە | لە سەرەوە | لە سەرەوە | لە سەرەوە | دەستپێك |
| توندوتیژ | ئاشتیخوازانە | ئاشتیخوازانە | ئاشتیخوازانە | ئاشتیخوازانە | توندوتیژ | رەوت |
| ئۆپۆزیسیۆنی رابردوو | میانڕەوەکان و رادیکاڵەکان | چاکسازیخوازە پارێزگارەکان و میانڕەوە رادیکاڵەکان | چاکسازیخوازە پارێزگارەکان | چاکسازیخوازە پارێزگارەکان | گرووپە نەیارەکان لە دەسەڵاتدا | ئەکتۆر |
| هاندانی خەڵك | هاندانی خەڵك | هاندانی خەڵك | خەڵك هان نادرێن | خەڵك هان نادرێن | خەڵك هان نادرێن | پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا |
| گۆڕینی سیستەم | گۆڕینی سیستەم | گۆڕینی سیستەم | گۆڕینی سیستەم | سیستەم ناگۆڕدرێ | سیستەم ناگۆڕدرێ | دەرئەنجام |
| | قۆناغی تێپەڕبوون | | | | | |

## گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە

لە ڕێڕەوی گۆڕینی ڕژێم، هەر لە سەرەتاوە کەسێك یان گرووپێك لە خاوەن دەسەڵاتەکان ڕێبەریی ڕەوتی لیبڕالیزاسیۆن دەگرنە دەست. ڕەوتی تێپەڕبوون بەکردەوە پێنج قۆناغ لە خۆ دەگرێ. لە هەنگاوی یەکەمدا گرووپێك لە لیبڕاڵەکان پرۆسەی لیبڕالیزاسیۆن بە پێویست دەزانن و بایەخ بە پەرەپێدانی ئازادییە لیبراڵییەکان دەدن. ئەم گرووپە خوازیاری دامەزرانی دیموکراسییەکی تەواو نین، چونکە دەزانن دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی دەسەڵاتەکەیان. لە بەردەوامیی ئەم ڕەوتە دەردەکەوێ کە پەرەپێدانی ئازادییە لیبراڵییەکان قەیرانەکانی ڕژێم چارەسەر ناکا. هێزی نوێی چالاك دێنە گۆڕەپانی خەباتەوە کە خوازیاری پەرەپێدانی زیاتری پرۆسەی لیبڕالیزاسیۆنن.

ئەو گرووپە لیبرالانە کە ناسەقامگیرن لە لایەن لایەنگرانی پەرەپێدانی چاکسازیی، وەلا دەنرێن، ئەوان لە ئاستە لەو دەسەڵاتدا هەن کە بتوانن پرۆسەی درێژەدان بە پرۆسەی دیموکراتسازی بدەن، بەڵام تا ئێستا نەیانتوانیوە کە بەربەرەکانێی توندڕەوە پارێزگارەکان تێك بشکێنن، کەوابوو لە قۆناغی چوارەم لایەنگرانی ریفۆرم هەوڵدەدن بە دابینکردنی ڕەوایی زیاتر لە نێو خەڵکدا، بازنەکانی دەسەڵاتی پارێزگارە توندڕەوەکان لە سیستەمی حکوومەتی لاواز بکەن. لەم قۆناغەدا ئەوان دەکەونە دانوستان لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆن، لە ڕەوتی دانوستاندا ئەوان لە لایەك بە ڕێککەوتنی فەرمی و نافەرمی لەسەر چوارچێوەی چاکسازییەکان و لە لایەکی دیکەوە سەبارەت بە پایەی کاتی لە دەوڵەتی نوێ و پێکهێنانی بەشێك لە پێکهاتەی نوێ ڕێگای هاوپەیمانی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆن خۆشدەکەن و بەم جۆرە ئەرکەکانی قۆناغی تێپەڕبوون کۆتایی پێ دێ. هانتینگتۆن گۆڕینی سیستەم لە وڵاتانی ئیسپانیا و بەرازیل و مەکسیك و بە هێندێك جیاوازی هەنگاریا وەك جۆرێك گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە لێکدەداتەوە.



## جێگۆڕکێی دەسەڵات

جێگۆڕکێی دەسەڵات ئاکامی چالاکیی بژاردە دەسەڵاتدارەکان و ئۆپۆزیسیۆنە، چونکە لەم حاڵەتەدا هیچ یەك لەوان بە تەنیایی خاوەن هێزێکی ئەوتۆ نین کە بتوانن، دەسەڵاتداری سەرەکی بن. لە بەرەی دەسەڵاتداران هاوسەنگیی هێز لە نێوان پارێزگارەکان و چاکسازیخوازان تا ڕادەیەك یەکسانە، بەم پێیە بژاردە دەسەڵاتدارەکان ئامادەن بۆ دانوستان، بەڵام توانایی بەئاکام گەیاندنی قۆناغی تێپەڕبوونیان نییە. لە جەمسەری ئۆپۆزیسیۆن، میانڕەوەکان ئەوەندە هێزیان هەیە، کە ڕادیکاڵەکانی نێو ئۆپۆزیسیۆن بخەنە پەراوێزەوە. لە پرۆسەی جێگۆڕکێی دەسەڵات دەتوانین پێنج قۆناغی جۆراوجۆر لە یەکتر جیا بکەینەوە. یەکەمین هەنگاو بە پەرەسەندنی چالاکیی لیبڕاڵی، پێکهاتەی دەسەڵاتی دەوڵەت دەرووخێ.

دژکردەوەی ئۆپۆزیسیۆن لەم حاڵەتەدا، پەرەپێدانی چالاکییەکانە بەم مەبەستەی لە لایەك هێزی دەسەڵاتدار لاواز بکەن و لە لایەکی دیکەوە خەڵکی هان بدەن. خێراترین ئامانج لەم بارودۆخەدا بۆ ئۆپۆزیسیۆن وەلانانی بژاردە دەسەڵاتدارەکانە. هەنگاوی دوایی هێزی دەسەڵاتدار بۆ سنووردارکردنی چالاکیی ئۆپۆزیسیۆن لەگەڵ شکست ڕووبەڕوو دەبێ. لە قۆناغی چوارەم هێزی دەسەڵاتدار و ئۆپۆزیسیۆن، هەر دوو دەکەونە ڕەوشێك کە هەر یەك لەوان بەدوای دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکن بۆ دەربازبوون لەم بارودۆخە. هەنگاوی دوایی لە ڕاستیدا پرۆسەی دانوستانە (مێزگرد). لەم دانوستانەدا هەر دوو لایەن سەبارەت بە پێش مەرجەکانی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەکەن و ئەم ڕەوتە بە جێگۆڕکێی دەسەڵات کۆتایی پێدێ. گرنگترین نموونە لەم پەیوەندییەدا پۆلۆنیا، چیکوسلۆڤاکیا، ئۆرۆگوان و کۆریای باشوورە.

### وەلانان

لە تایبەتمەندییەکانی وەلانان، هێزی باڵادەستی ئۆپۆزیسیۆن و لاوازیی هێزە دەسەڵاتدارەکانە (چاکسازیخوازان و پارێزگاران). بە هۆی لاوازیی لە بەرەی چاکسازیخوازانی دەسەڵاتدار، پارێزگاران بۆ سەرکوتی چالاکیی ئۆپۆزیسیۆن تەواوی

دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن. لە ئاکامدا ئەگەری گەشەسەندنی چالاکیی ئۆپۆزیسیۆن نامێنێ. هاوتەریب لەگەڵ کەلێنی نێوان هێزە دەسەڵاتخوازەکان، ئۆپۆزیسیۆن چالاکییەکانی پەرەپێدەدا. سەرەتا هێزە دەسەڵاتخوازەکان پێیان وایە کە لە ئۆپۆزیسیۆن بەهێزترن هەر بۆیە ئەم هێزە لە هەڵسەنگاندنی نفووزی خۆی تووشی هەڵەی گەورە دەبێ، رۆژبەرۆژ نارەزایەتی خەڵك زیاتر دەبێ و بەمجۆرە رەوایی تەواوی سیستەم دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە. بە خۆپیشاندان و مانگرتنی بەربلاو، هێزی سەربازی و ئابووری رژێم بەرەو فەوتان دەچێ.

پێش رووخانی رژێم ئۆپۆزیسیۆن خۆی بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات ئامادە دەکات، بەمجۆرە جۆری سیستەمی داهاتوو و دابەشکردنی دەسەڵات لە بەرەی ئۆپۆزیسیۆن دەبێتە بابەتی رۆژ.

شانسی سەرکەوتن بۆ وەدەستهێنانی دیموکراسی لەم حاڵەتەدا کاتێك لە ئارادایە کە هێز و میانڕەوەکان خاوەنی دەسەڵات بن و توانایی پێویستیان بۆ کۆنترۆڵکردنی رادیکاڵە دژە دیموکراتەکان هەبێ. وەلانان، بە گشتی رێگایەکی دڵنیاکەرەوە نییە و لەم حاڵەتەدا شانسی سەرکەوتنی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن زۆر نییە. گرنگترین نموونەکان ئەم جۆرە تێپەڕبوونە فیلیپین و پورتوگال و یۆنانە.

## سەقامگیریی و جێگیرکردنی دیموکراسی

لە پەیوەندی لەگەڵ بوار و هۆکار و رەوشی پێویست بۆ سەقامگیری و جێگیرکردنی دیموکراسی بیروبۆچوونەکان جیاوازن. پێناسەیەکی دیاریکراو لە چەمکی "دیموکراسی جێگیرکراو" نییە. رێککەوتنێك لەو بوارەدا کە چ مەرجێك پێویستە جێبەجێ بکرێ تا سیستەمێك وەك دیموکراسی سەقامگرتوو بناسرێ، لە ئارادا نییە و ناتوانین چوارچێوەیەکی دیاریکراوی زەمانی لەم پەیوەندییەدا لەبەرچاو بگرین. هەروەها سەبارەت بەوەی کە بە دەستراگەیشتن بە کام پێکهاتەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دەتوانین بە سیستەمێکی سیاسیی جێگیرکراو بگەین بیروبۆچوونەکان



جیاوازن. لێرەدا سەبارەت بە "دیموکراسی جێگیرکراو" دەتوانین ئاماژە بە لانیکەم و یان لانی زۆرێك بکەین.

لە کۆتایی ئەم باسەدا شێوازی لانی زۆری مێرکێل دەناسێنین. پێناسەیەکی تایبەتی لانیکەم لە پرزورسکی هەیە، کە زۆربەی لێکۆڵەران لەسەری هاوڕان کە دەڵێ: کاتێك دەتوانین باسی پرۆسەی جێگیربوونی دیموکراسی بکەین کە "دیموکراسی و هەموو پێکهاتەکانی" قبووڵی ئەوە بکەن، کە هەموو یارییەکان تەنیا لە نێوخۆی دەوڵەت بەڕێوە دەچێ"(the hame only in town). بە سەرنجدان بەم پێناسەیە جۆری هەڵسوکەوتی ئەکتۆرەکان رۆڵی گرنگیان هەیە لە سەقامگیری و جێگیرکردنی دیموکراسی. هەر بۆیە لەم نووسراوەیەدا کردەوە و دژکردەوەی ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و رەفتاری تاکەکەسی و بە کۆمەڵی ئەوان لە چوارچێوەی تیۆری ئەکتۆردا جێگای باسە.

زۆربەی دیموکراسییە تازە دامەزراوەکان ناچارن بە میراتیی بەجێماو لە رژێمە دەسەڵاتخوازەکان کە لە لایەك رەوشی ئاڵۆزی ئابووری و لە لایەکی دیکەوە زاڵبوونی فەرهەنگی سیاسیی سەرەڕۆ بەربەرکانێ بکەن و هێندێك جار چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جینایەتی سیاسی لە سیستەمی دەسەڵاتخوازی پێشووش دەبێتە پرسێك. لە راستیدا دژوارترین قۆناغی تێپەربوون بۆ دیموکراسی، قۆناغی سەقامگیر و جێگیرکردنی دیموکراسییە. گرنگترین بابەت لەم قۆناغەدا ئەمەیە کە ئەکتۆرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەبێ بگەنە بنەمایەك بۆ رێککەوتنی گشتی کە لە چوارچێوەی دیموکراتیدا بێ. لە راستیدا رێککەوتنێکی ئەوتۆ کارێکی زۆر دژواترە..

حزب و گرووپە سیاسییە نوێیەکان، هەروەها ئەنجوومەن و رێکخراوە جۆراوجۆرەکان لە چوارچێوەیەکی مەدەنیدا پێکدێن، چونکە چالاکیی سیاسی لەم بارودۆخەدا هەزینەیەکی زۆر ناخوازێ و لە ئاکامدا پێکهێنانی هاوسەنگیی لە نێوانیاندا دەبێتە پرسێکی ئاڵۆز و دژوار.

دامەزرانی پێکهاتەی نوێی سیاسی لەم قۆناغەدا زۆر گرنگە، چونکە لە لایەك تا رادەیەك ئاستی نەبوونی دڵنیایی دادەبەزێ و لە لایەکی دیکەوە ئاکامی

سیاسەتکردن و داڕشتنی سیاسەت هەڵدەسەنگێندرێت و لە درێژەدا ئەوی گرنگە ئەمەیە کە کۆی هێزەکان رازی بکرێن کە دەبێ پرسەکان لە چوارچێوەی بنەما دیموکراتییەکان چارەسەر بکرێن و لە هەر جۆرە دروستکردنی ئەلتەرناتیڤ لە بەرامبەر پرۆسەی دیموکراتیزەیشن خۆ بپارێزن. دانوستانی بەرپرسانەی هێزە دەسەڵاتدارەکان و ئۆپۆزیسیۆن لەم قۆناغەدا گرنگیی تایبەت بە خۆی هەیە، لە لایەك دەوڵەتی نوێ دەبێ توانای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هەبێ و لە لایەکی دیکەوە دەبێ بنەماکانی دیموکراسی کە بریتییە لە ئازادییە مەدەنی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و بەشداری هەموو لایەك لە چارەنووسی سیاسی و هەڵبژاردنی داڕێژەرانی سیاسەت بە کردەوە جێبەجێ بکرێ.

ئەزموونەکان دەریانخستووە بوارەکانی راستەقینەی سەرکەوتن کاتێك دەردەخسێ کە کەسانی کارلێهاتووی سیاسی هەبن، گۆڕانکاریی بەرچاو لە بواری فەرهەنگ و بایەخە سیاسییەکان رووی دابێ و بارودۆخی گونجاوی دەرەکیش رەخسابێ.

بازنەی ناوەندی لە قۆناغی جێگیرکردنی دیموکراسی، پێکهێنانی پێکهاتەکانی سیاسی — یاسایی و بەڕێوەبەریی نوێ و رۆڵی گرووپ و حزبەکانە لە داڕشتنەوەیدا. لە پرۆسەی دژواری دانوستانی سیاسیی هەر رەوت و گرووپێکی سیاسی تەنیا نوێنەرایەتی هۆگری و ئەولەوییەتە تایبەتییەکانی خۆیان دەکەن. بە پێی روانگەی مێرکل لێکۆڵینەوەکان لە تیۆری ئەکتۆر نیشانیدەدن کە بڕیاردان بۆ داڕشتنەوەی نوێی پێکهاتەی سیاسی ناگەڕێتەوە بۆ کارلێهاتووی ئەوان بەڵکو زۆرتر پەیوەندی بە ئەولەوییەتەکان و هاوسەنگیی سیاسی لە نێوان گرووپە سیاسییەکاندایە.

لەم پەیوەندییەدا پرزورسکی ئاماژە بە بوونی سێ رەوشی جیاواز دەکا کە بڕیارەکان دەخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە.

١- رەوشێك کە هاوسەنگیی دەسەڵات روون نییە و ناوبراو ئەمە بە باشترین شانس بۆ بڕیاردانی دادپەروەرانە، هەروەها بەرزترین پلەی کارلێهاتووی بۆ پێکهاتەی نوێ هەڵدەسەنگێنێ.



٢- رەوشێك لە هاوسەنگیی دەسەڵات دیارە، بەڵام گونجانی ئەو لە نێو گرووپە نەیارەکاندا یەکسان نییە، لەم حاڵەتەدا گرووپێك کە هێزی زۆرترە، هەروەها خاوەن رێبەرێکی کاریزماتیکە بە تەنیایی دەتوانێ هۆگری و ئەولەوییەتەکانی خۆی بسەپێنێ.

٣- رەوشێك کە هاوسەنگیی دەسەڵات دیارە، بەڵام گرووپە نەیارەکان لە بارودۆخێکی لانیکەم یەکساندا هەڵکەوتوون لەم حاڵەتەدا هەر گرووپێك هەوڵدەدا ئەولەوییەتە تایبەتییەکانی خۆی لە پێکهێنانی پێکهاتەی نوێ بسەپێنێ، لە ئاکامدا دووبەرەکی و قەیران سەرهەڵدەدا. بۆ پێشگیری لە شەڕی نێوخۆیی زۆرجار ئەو رێککەوتنانەی کە بەڕێوە دەچێ زۆر ئاڵۆز و کارایی پێویستیان نییە و یان لە باشترین حاڵەتدا لەسەر شێوازێکی راستەقینە، کە هەیە وەك دەستووری پێشوو یان شێوازی دەرەکی رێکدەکەون.

هەر وەك لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا لێرەدا بە کورتی باسێك لە سەر شێوازی لانی زۆری مێرکێل دەکەین.

بە پێی روانگەی مێرکێل پێش هەموو شتێك دەبێ دەستوور داڕێژرێ و پەسند بکرێ. خاڵی سەرەکی لەم بارودۆخەدا بوونی دەستوورێکە کە سەقامگیری و رەوایی سیستەم گرەنتی دەکا و ئەویش کاتێك دەستەبەر دەکرێ کە لە لایەك لە پرۆسەیەکی دیموکراسی داڕێژرابێ و پەسند کرابێ و لە لایەکی دیکەوە لەسەر بنەمای رەوایی ئەزموونکراو بووبێ، هەروەها لە لایەن ئەو پێکهاتانەی کە بە پێی ئەم دەستوورە دامەزراوە بتوانن کێشە و پرسەکان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە چارەسەر بکەن. رەوتی جێگیرکردنی دیموکراسی لە لە چوار ئاست و هاوکات و لە پەیوەندییەکی دوولایەنەدا دەستپێدەکا و هەر یەك لەم ئاستانە دەبێ ئاکامێکی دیاریکراوی هەبێ تا بتوانین باسی "دیموکراسی جێگیرکراو" بکەین.

لە ئاستی یەکەم کە بە ئاستی بەرفراوان ناسراوە، دیاریکردن و سەقامگیرکردنی پێکهاتەکان دەکەوێتە دەستووری کارەوە و بریتییە لە ئۆرگانەکانی بەڕێوەبەری و یاسایی دەستوور و دامەزراوەکانی دیکەی سیاسی نوێ وەك پەرلەمان و هتد...

مێرکێل ئاماژە بەوە دەکا کە بۆ دیاریکردنی پێکهاتەی دیموکراتی هیچ پرەنسیپ و پابەندبوونێکی دیاریکراو بوونی نییە، ئێستا کام شێواز هەڵبژێردرێن بەستراوەتەوە بە رەوشی مێژووی — کۆمەڵایەتی هەر ولاتێك.

ئاستی دووەم کە لە راستیدا بازنەی لێك گرێدانی نێوان ئاستی بەرز و ئاستی خوارەوە، پێی دەڵێن ئاستی نێونجی کە ئەویش پێکهێنان و سەقامگیرکردنی گرووپەکانی نوێنەرایەتی لە تەواوی رەهەندەکانی کۆمەڵگەیە وەك حزبەکان، یەکێتییەکان، سەندیکاکان، رێکخراوە ئابوورییەکان، رێکخراوە ناوچەیی و نەتەوەییەکان، گرووپە چالاکەکان لە بواری کۆمەڵگەی مەدەنی و هتد...

لە ئاستی سێیەم پەرەپێدان قووڵبوونەوەی دیموکراسییە لە رەهەندی رەفتاریدا و ئەویش بەو مانایەیە کە ئیتر بۆ هیچ یەك لە ئەڵتەرناتیڤێکی سیاسیی نییە، کە خەڵکی دژی دیموکراسی هانبدەن.

بەڵام گرنگترین خاڵ لە ئاستە، چارەسەری کێشەکان و ئاڵۆزییە ئابوورییەکانە و هەروا دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی لێبڕاوانە لە پەیوەندی لەگەڵ جینایەتی سیستەمی پێشوو دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەیرانەکان.

لەم قۆناغەدا دەبێ هێزە سەربازییەکان بە تەواوی بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی دیموکراتی و هەڵبژێردراو و بایەخەکانی سیستەمی دیکتاتۆری دەبێ بسڕێتەوە و جێگای خۆی بدا بە بایەخ و نۆرمە دیموکراتییەکان.

لە ئاستی چوارەمدا کە مێرکێل پێی دەڵێ "جێگیرکردنی کۆمەڵگەی هاوولاتی" لەم ئاستەدا فەرهەنگی هاوولاتی پێکدێ کە پشتیوانی دیموکراسییە. ئەم قۆناغە دەتوانێ چەندین دەیە درێژە بکێشێ و بە ئەزموونەکان سەلماندوویانە کە بە گشتی بە گۆڕینی نەوەیەك کۆتایی پێدێ و لەم رەوتەدا هەڵسوکەوتی دیموکراتی دەبێتە نۆرمێکی رۆژانە.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەبێ پێ لەسەر ئەم خاڵەدا بگرین کە ئەگەر چی جیاکردنەوەی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن تەنیا بابەتێکی تیۆری نییە، بەڵکو



تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکان ئەم گریمانەیان سەلماندووە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەزموونەکان نیشانیان داوە کە جۆرێك یەکتر داپۆشین لەم رێڕەوەدا هەیە و لە هێندێك حاڵەتدا تەنانەت ئەو پرسانەی کە لە قۆناغی جێگیرکردنی دیموکراسی پێویستە ئاوڕی لێ بدرێتەوە لە سەرەتای ئەم رەوتە دەبێ رێگاچارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە.

کام تیۆری؟

بە شیکردنەوە و راڤەی تیۆرییە جۆراوجۆرەکان لە چوارچێوەی تیۆری گۆڕینی سیستەم بە جێیە کە ئێستا وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە کە کام یەك لەم تیۆرییانە دەتوانێ رەوتی دیموکراتیزەیشن وردتر راڤە و شیبکاتەوە؟ راستییەکەی ئەوەیە کە ئەم پرسیارە وەڵامێکی روونی نییە.

لەم پەیوەندییەدا مێرکێل لێکۆڵەری زانستی سیاسی ئەم پرسیارەی هێناوەتە بەرباس، "ئایا شارێییەك لە لێکۆڵینەوەکانی تیۆری ترانسفۆرماسیۆن بوونی هەیە؟" ناوبراو وەڵامی نەرێنی بەم پرسیارە دەداتەوە و پێیوایە رێگاچارەکان لە کۆی ئەم تیۆرییانە دایە.

لە راستیدا تەنیا بە پەیوەندیی بەهێزی ئەم تیۆرییانە لەگەڵ یەکتر دەتوانین بە شێوەی بەرچاو پرسەکانی پەیوەندیدار بە رەوتی دیموکراتیزەیشن راڤە و شی بکەینەوە. روونە کە تیۆرەکانی ئاماژەپێکراوەکان لە ئاستی جیاجیادا خاوەن خاڵی بەهێز و لاوازن، بۆ وێنە هۆکاری رووخانی سیستەمە دیکتاتۆرەکان یان پێش گریمانەی پێویست بۆ جێگیرکردنی دیموکراسی دەتوانین وردتر بە تیۆرییەکانی پێکهاتە و سیستەم شیبکەینەوە، بەڵام هەلی راڤەی قۆناغی تێپەڕبوون لە چوارچێوەی ئەم تیۆرییانە زۆر سنووردارە. ئێستا گەڕان بە دوای رێگاچارەیەك لە کۆی ئەم تیۆرییانە لە ئارادایە، بەڵام دەبێ بایەخ بەم بابەتە بدرێ کە ئێستا لە روانگەی زۆربەی لێکۆڵەرانەوە، تیۆری ئەکتۆر لە ناوەندی قورسایی دایە. زۆربەیان بۆ ئەم هەڵبژاردنە دوو هۆکار دەستنیشان دەکەن. یەکەمین هۆکار پرزورسکی بەم جۆرە باسیدەکا "بارودۆخەکان تەنیا جیاوازییەکان پێکدێنن، بەڵام ناتوانن بڕیار بدەن". دووەمین گریمانە ئەوەیە کە قۆناغی تێپەڕبوون لە لایەك بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی، دانوستان و چالاکیی و کردەوەی بەرامبەری ئەکتۆرە

سیاسییەکان زۆر گرنگە و لە لایەکی دیکەوە گـۆڕین و پێکهێنـانی پێکهاتـە نوێیـەکان تەنیا بە لایەن ئەوانەوە جێبەجێ دەکرێ. لە خشتەی خوارەوە دەتوانن رۆڵی چوار تیـۆری لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی پرۆسەی دیموکراتیزەیشن ببینن.

| | لیبرالیزاسیۆن | قۆناغی تێپەڕبوون | سەقامگیربوونی دیموکراسی |
|---|---|---|---|
| تیۆری سیستەم | + | - | + |
| تیۆری پێکهاتە | + | - | + |
| تیۆری ئەکتۆر | (-) | + | - |
| تیۆری فەرهەنگ | - | + | (-) |

تێبینی: (+) پلەی بەرزە لە توانـایی لـە شـیکردنەوە و روونکردنـەوە، (-- ) لـە شـیکردنەوە و روونکردنـەوەدا سـنووردارە، (-) پلـەی نزمـە لـە توانـایی لـە شیکردنەوە و روونکردنەوە

## گۆڕینی سیستەم و دیموکراتیزەیشن بە کردەوە

لە لێکۆلینەوەکاندا وا باوە کە لە کۆتاییدا کۆبەندییەك پێـشکەش و دوورەدیمـەنی وێنا دەکرێ. چاوپۆشی لەم بـوارەدا کـراوە و بـە جێگـای پرسـی گـۆڕینی سیـستەم و دیموکراتیزەیشن هاتووەتە بەرباس، تا خوێنەران بـۆ خۆیـان بتـوانن لـە بـەراوردکردنی تیۆری و کردەوە ئاکامێکی دیاریکراویان دەستبکەوێ.

هانتینگتۆن شەپۆلی سێیەمی دیموکراسـی وەك کۆمـەڵێك لـە تێپەڕبوونـەکان لـە رژێمی دیکتاتۆری بۆ سیستەمی دیموکراسی پێناسە دەکا و ناوبراو ئاماژە بـەوە دەکـا کە لە رێڕەوی گۆڕانکارییەکی دیموکراسی ئـەوتۆ دەوڵـەتانی دیکـەی دەسـەڵاتخواز تـا رادەیەك ناچار دەبن مل بۆ کەشی ئاوەڵای سیاسی راکێشن.



پـێش دەسـتپێکردنی شـەپۆلی سـێیەم تـەنیا ٤٠ وڵات لـە جیهـان خـاوەنی سیستەمی دیموکراتی بوون و ناوبراو پێنج هۆی بە هۆکاری دەسـپێکردنی شـەپۆلی سێیەم لێکداوەتەوە:

قەیرانی رەوایی رژێمە دیکتاتۆرەکان، لە لایەك بە چوونەسەریی داخوازی خـەڵك و لە لایەکی دیکـەوە بـە شکـستە سـەربازییەکان و هەرەسـهێنانی ئـابووری و لەگـەڵ ئەوەشدا قەیرانی نەوت (٧٣-٧٤) و (٨٠-٧٩) بەوپەڕی خۆی گەیشت.

گەشەی ئابووریساڵەکانی ٦٠ بووە هـۆی بەرزبوونـەوەی سـتانداردەکانی ژیـان و پەرەپێدانی پەروەردەی گشتی و لە ئاکامدا پێکهاتنی چینی نوێی نێونجی.

چاکسازی لە کڵێسەی کاتۆلیك لە دووەمین کـۆنگرە بـووە بنەمایـەك بـۆ گـۆڕینی رۆڵـی کڵێـسە نەتەوەییـەکان لـە پێنـاوی بـەرگریکردن لـە گۆڕانکارییـە سیاسـی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان.

پەرەسـەندنی یـەکێتی ئـەوروپا، گۆڕانکـاری بایەخـەکان لـە سیاسـەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئاکامی جـەنگی ڤیـەتنام لـە بـەرگریکردنی لـە مـافی مـرۆڤ، هـەروەها پرۆسترۆێکای گۆرباچۆف.

پەرەپێدانی گەیاندنی زانیاری بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی فەرهەنگی سیاسی.

بێگومان گۆڕینی سیستەم و بە دوای ئەودا پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە کـردەوەدا، لە پرۆسەیەکی درێژخایەن بە ئاکام دەگا و لە هێندێك حاڵەتی دەگمەندا بە تێپەڕبوونی راستەوخۆ و یەك قۆناغی روویداوە، بەڵکو بـە گـشتی لەگـەڵ چـەندین لێـك دابڕانـی جیاجیا و چوون و گەڕانەوە بەرەوروو بووە.

هانتینگتۆن بە گشتی پێنج رێڕەوی جیاجیای تێپەڕبوون لە رژێمە دیکتاتۆرەکان بۆ سیستەمی دیموکراسی لە یەکتر جیا دەکاتەوە:

سووڕی a-d a-d-a-d

دووەمین تاقیکردنەوە a-D A-d

لە یەك دابڕان لە قۆناغی دیموکراسی A-D-a-D

تێپەڕبوونی ڕاستەوخۆ A-D

کۆتایی کۆلۆنیالیزم D/a-D

تێبینی: A = ڕژێمی سەقامگرتووی دەسەڵاتخواز، D = دیموکراسی سەقامگرتوو، a = دەسەڵاتخوازیی کورتخایەن و ناسەقامگیر، d = ڕژێمی دیموکراتی.

نموونە سەبارەت بە پێنج ڕێڕەوی جیاواز لە لیستی خوارەوەدا هاتووە.

سوور: ئیکوادۆر، بۆلیڤیا، پیرۆ، ئەرژەنتین لە ئەمریکای لاتین، هەروەها تورکیا و نەیجریا.

دووەمین تاقیکردنەوە: ئەڵمانیا، نەمسا، ژاپۆن لە شەپۆلی دووەم ئیسپانیا، پورتوگال، یۆنان، کۆریا، چیکۆسلۆڤاکیا، سلۆڤانیا، هەنگاریا، ڤەنزۆیلا، کۆلۆمبیا.

لە یەك دابڕان لە قۆناغی دیموکراسی: هیندوستان، فیلیپین، ئۆرۆگوانی، شیلی

تێپەڕبوونی ڕاستەوخۆ: ڕۆمانیا، بۆلگاریا، تایوان، مەکسیك، گواتیمالا، ئیلسالوادۆر، هندۆراس، نیگاراگوا

کۆتایی کۆلۆنیالیزم: وڵاتانی بچووکی ( pappua Neuguinea داگیرکراو لە لایەن بەریتانیا لە شەپۆلی سێیەم) و Anhigua، Barbeda، Belitza، Dominika، و هۆنگ کۆنگ و هتد...

لە خشتەی خوارەوە دەتوانن ئاماری گۆڕانکارییەکان لە ڕەوتی دیموکراتیزەیشن لە جیهان تا ساڵی ١٩٩٠ ببینن (هانتینگتۆن. لاپەڕەی ٢٦، ١٩٩١)

| ڕێژەی وڵاتە دیموکراتییەکان لە جیهاندا | ئەو وڵاتانەی کە زیاتر لە ملیۆنێك دانیشتووی هەیە | وڵاتانی نادیموکراسی | وڵاتانی دیموکراتی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٥٪ | ٦٤ | ٣٥ | ٢٩ | ١٩٢٢ |
| ٢٠٪ | ٦١ | ٤٩ | ١٢ | ١٩٤٢ |
| ٣٢٪ | ١١١ | ٧٥ | ٣٦ | ١٩٦٢ |
| ٢٥٪ | ١٢٢ | ٩٢ | ٣٠ | ١٩٧٣ |
| ٤٥٪ | ١٢٩ | ٧١ | ٥٨ | ١٩٩٠ |



پێش مەرجەکانی هانتینگتۆن بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن بوونی قۆناغێکی کورت یان سەقامگیری دیموکراسییە وەك نموونە بۆ حاڵەتەکانی ١ و ٣ و ٥. لەو شوێنەی کە دیموکراسی بەبێ هیچ گەڕانەوەیەك جێگیر دەبێ حاڵەتێکی دەگمەنە تەنیا لە ئەمریکا، بەریتانیا، سویسرا، هولەندا، بەلجیکا، لۆکسەمبۆرگ، دانیمارك و کۆستاریکا ڕوویداوە.

لە ڕاستیدا بە شێوەی بنەڕەتی ناتوانین بڵێین کە ئایا دیموکراسییە نوێیەکان بەبێ وەستانی کورتخایەن یان لە خراپترین حاڵەتدا گەڕانەوە بۆ سیستەمێکی دیکتاتۆری دەتوانن ببنە دیموکراسییەکی سەقامگرتوو.

هانتینگتۆن یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی لە یەك دابڕان بۆ پرسی کەمایەتییەکان دەگەڕێنێتەوە و پێیوایە نەبوونی ڕێککەوتن و کەڵك وەرگرتن لە توندوتیژی مەترسییەکی گەورەیە بۆ دیموکراسییە نوێیەکان. هەر چەند وەك چۆن ڕاستییەکان نیشانیانداوە تێپەڕبوونی ڕاستەوخۆ و یەك قۆناغی بەبێ گەڕانەوە شتێکی دەگمەنە.

زانیارییەکان (Kosimo Daten Bank, Pftech/Rohloff 2000) دەری دەخەن کە لە ڕاستیدا گۆڕینی سیستەمی سیاسی لە شێوازی دیموکراسی ڕۆژئاوا لە ساڵی ١٩٤٥ لە بەراورد لەگەڵ سیستەمە دەسەڵاتخوازەکان زۆر کەم بووە.

لە ڕاستیدا نێوەڕۆکی ئەم خشتەیە نیشاندەری جێگیربوونی دیموکراسییە ڕۆژئاواییەکانە.

| جۆری سیستەمی سیاسی | چڕبوونەوەی هەر جۆرە سیستەمێك | بەبێ گۆڕانکاریی لە سیستەم لە ساڵی ١٩٤٥ یان لە سەردەمی سەربەخۆییدا |
|---|---|---|
| دیموکراسی ڕۆژئاوایی | ٧١ | ٧٤ |
| ئەو ڕژێمانەی لە حاڵی تێپەڕبووندان | ١٥٨ | ٢٥ |
| سیستەمی دەسەڵاتخواز | ١٢٠ | ١٧ |
| **کۆ** | **٣٤٩** | **٨٩** |

هەر وەك لە بەشی یەکەمی ئەم نووسراوەیەدا هاتووە: "بە گۆڕینی رژێم لە پورتوگال ((سێیەمین شەپۆل))ی دیموکراتیزەیشن دەستیپێکرد. بەدوای ئەودا، ئەم شەپۆلە رژێمەکانی ئەمریکای لاتینی گرتەوە و بە گۆڕینی رژێمەکانی سۆسیالیستی لە ئەوروپای رۆژهەلاّت پەرەی ئەستاند. لە درێژەی ئەودا لە ساڵەکانی ٩٠ هێندێك لە ولاّتانی ئەفریقیایش کەوتنە سەر رێڕەوی گۆڕانکارییە دیموکراتییەکان. گرنگترین تایبەتمەندی شەپۆلی سێیەمی دیموکراتیزەیشن لەمەدایە کە ولاّتە جۆراوجۆرەکان لە کیشوەرە جیاوازەکان و لە ئاستی هەمەچەشنی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەلاّیەتیی لە خۆ دەگرت.

تەواوی ئەم ولاّتانە لە ساڵی ١٩٨٩ بەدواوە پێشکەوتنی بەرچاویان لە پرۆسەی دیموکراسیدا هەبووە. ئەمریکای لاتین قۆناغی جۆراوجۆری لە پرۆسەی دیموکراتیزەیشنی تێپەڕاندووە. جگە لە ولاّتی کۆستۆریکا کە لە ساڵی ١٩٤٩ بێ پسانەوە خاوەنی سیستەمی دیموکراتی بووە، بە دابڕانێکی ٢٠ ساڵە بە پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە ئەمریکای لاتین، سەرئەنجام بە تێپەڕبوونی ئیکوادۆر لە ساڵی ١٩٧٩ و پاشان پیرۆ لە ساڵی ١٩٨٠ و لە بەردەوامی ئەودا ولاّتانی دیکەی ناوچە و دواییینیان مەکسیك لە ساڵی ٢٠٠٠ ئەم پرۆسەی هەروا بەردەوامە. تەنیا دوو ولاّتی کوبا و هایتی تا ئێستا لە بەرامبەر ئەم پرۆسەیەدا بەرگرییان کردووە. لەم کۆمەڵەیەدا تەنیا لە دوو ولاّتی کۆستۆریکا و ئۆرۆگوان دیموکراسی جێگیر بووە و شیلی و جامایکاش کەوتوونەتە سەر ئەم رێڕەوە.

دەتوانین ولاّتانی دیکەی ئەمریکای لاتین لە چوارچێوەی دیموکراسی سنووردار هەڵسەنگێنین. (مێرکێل Defekte Demokratice).

گۆڕینی سیستەم لە ئەوروپای رۆژهەلاّت ئاکامی فاکتەرە نێوخۆیی و دەرەکییەکان بووە. روونە کە بەبێ گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتی پێشوو، پرۆسەی دیموکراتیزەیشن لە ئەوروپای رۆژهەلاّت مەحاڵ بوو. ئەم گۆڕینی سیستەمە سێ ئامانجی ناوەندی تاقیب دەکرد: دژی رژێمی دەسەلاّتخواز، دژایەتی لەگەڵ سیستەمی ناکارامەی ئابووری، بەربەرەکانێ لەگەڵ فراوانخوازی سۆڤیەتی پێشوو.



چڵ ساڵ بەردەوامی ولاّتانی ئەوروپای رۆژهەلاّت لە ژێر چاودێری حزبێك جۆرێك یەك دەستبوونی لە کۆمەڵگە پێکهێنابوو. رەفتاری فۆنکسیۆنە کۆمەلاّیەتییەکان مێژووی نەوەیەکی هەیە و سیستەمێکی لە نێو کۆمەلاّنی خەڵك لە ژێرناوی "سۆسیالیزم" پێکهێنا و ئەم مەسەلەیە لە لایەك بووە هۆی پەروەردەکردنی پسپۆڕان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا و لە لایەکی دیکەوە پێکهێنەری پێکهاتەگەلی دیاریکراو بوو و هەر وەك دەبینرا زۆربەی کادرەکانی سیستەمی پێشووش تێکەڵ بە رژێمی دیموکراتی بوون.

بە سەرنجدان بە پەرەسەندنی پێکهاتەیی لە ئەوروپای رۆژهەلاّت رەوتێکی دیاریکراو لە مۆدێرنیزاسیۆن لەم ولاّتانە پێکهاتبوو. پەروەردە و فێرکردن تا رادەیەك لە ئاستی ولاّتانی ئەوروپای رۆژئاوادا بووە و بە گشتی کۆمەڵگە لە رێڕەوی سیکۆلاریزاسیۆندا هەڵکەوتووە.

لە بەراورد لەگەڵ ئەمریکای لاتین زۆربەی دیموکراسییە نوێیەکان لە ولاّتانی ئەوروپای ناوەڕاست و ئەوروپای رۆژهەلاّت لە رەوشێکدا بوون، کە دەبووایە گۆڕانکاریی سیاسی و ئابووری هاوکات بەرەوپێشەوە بەرن. لە حاڵێکدا لە ئەوروپای باشوور و ئەمریکای لاتین گۆڕانکاریی لە رژێمێکی دەسەلاّتخواز بۆ سیستەمێکی دیموکراتی پرسێکی سەرەکی بوو. لە ئەوروپای رۆژهەلاّت لە تەنیشت گۆڕانکاری لە رژێمێکی دەسەلاّتخواز بۆ سیستەمێکی دیموکراتی دەبووایە هاوکات سیستەمی ئابووری لە رێگای ئابوورییەکی پشت بەستوو بە بازاڕی ئازاد تێپەڕبووایە. ئەم پرسە پەرەی بە کێشە و قەیرانە ئابوورییەکان دەدا و پرۆسەی دیموکراسی سەقامگیری بۆ دواوە دەگەڕاندەوە. لە نێویاندا دەتوانین ئاماژە بە ولاّتانی هەنگاریا و چیك و سلۆڤانیا و سلۆڤاکیا و پۆلۆنیا و لیتوانی بکەین کە دیموکراسی لەواندا جێگیر بووە.

# فیدراڵیزم چییە؟

نووسینی ریچاردلمینگ

(سەرۆکی یەکەی بەریتانیای گەورەی یەکێتی فیدراڵیستییەکانی ئەوروپا)

## فیدراڵیزم ...

### دیموکراسی و لێهاتوویی

نموونەیەك لە دەسەڵاتەکە دەیهەوێ سیستمە دیموکراسیەکان لە رووی لێهاتووییـەوە رێك بخا.

دەسەڵاتە سیاسییەکان لە نێوان ئاستە جۆراوجۆرە دەوڵەتییەکان لە پێناو باشترین جۆری پەیوەندی لە نێوان دیموکراسی و لێهاتوویی دابەشدەکا.

...مەبەست دامەزرانی سیستمێکی حکومەتی چەند لایەنەیە، بە جۆرێك کە لە رێگای پێکهێنانی زۆرترین رادە لە دابەشکردنی دەسەڵات و کەمترین رێژەی کۆبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەند، بڕیاردانەکان لە ئاستێك لە حکومەت دەگیرێ کە بە باشترین شێوە توانای جێ بەجێ کردنی هەیە.

لە سەر بنەمای ئەندێشەی رەوایی سیاسی دامەزراوە، چونکە حکومەت لە هەوڵی نزیك بوونە لە خەڵك و نوێنەرایەتی کردنی قازانج و بەرژەوەندی هاوڵاتیان دایە.

دابەشکردنی ستوونی هێز لە سەر بنەمای ئەسڵی ((سابسیدیارتی)) ئاسانکاری دەکا

کە لە رێگای ئەوەوە بەشداری هاوولاتی یان لە پرۆسەی بریاردان و شەفافییەتی ئەو گرەنتی بکا.

لە پلۆرالیزم و مافی هاوولاتی یان لە بەرانبەر حکومەتە بە هێزەکان پشتیوانی دەکا.



لە سەر بناغەی دیموکراسی و حکومەتی یاسا لە نێو ئاستی حکومەتی فیدرال و هەرێمەکان و لە نێوان ئەواندا دامەزراوە.

## یەکێتی و هەمەجۆری

خۆی بە دەستەبەری هەمە جۆری و بەرزراگرتنی پێناسەی فەرهەنگی دەزانی، هەمەجۆری یەك کە بۆ گرەنتی کردنی لێهاتوویی و گەشە و هەوڵدان لە وڵاتدا پێویستە.

لە نموونەیەکی تیکەڵاو لە پێناسە جۆراوجۆرەکان پێکدێ، نموونەیەك کە لە رێگای پاراستن و هاوسەنگ کردنی پێناسەکان و نەتەوە جیاوازەکان کێشەکانی مرۆڤ لە بەرچاو دەگرێ و لە سیستمی سیاسیدا رەنگدەداتەوە. وەفاداری و نیشتمانپەروەریی ناوچەیی، هەرێمی، یان نەتەوەیی هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ پێناسەی فرەنەتەوەیی خۆی و پابەند بوونی بە بڕیارە سیاسییە فرە رەگەزی یا نەتەوەیی نییە، بەڵکو ئەوان تەواوکەری یەکترن و کاریگەرییان لە سەر یەکتر هەیە.

## ئاشتی و بایەخە جیهانییەکانی

... خۆی بە دەستەبەری مافە بنەڕەتییەکان دەزانێ.

... پێی باشە لە رێگای گرتنە پێشی رێگە چارەی ئاشتی خوازانە پێشگیری لە سەر بکا.

...ئەم بیروکەیە کە گوایا لە دەوڵەتەکانی تا ئێستا بە دەسەڵاتی تاك نەتەوەیی دامەزراوە و سیاسییەکان ناتوانن گوڕانکاری لە خۆیاندا پێکبینن، رەتدەکاتەوە.

تیورییەکی سیاسییە کە لە هەوڵی پێکهێنانی هاو پەیوەندی وەك پێش مەرجی ژیانی هاوبەش لە نێوان وڵاتەکان و لە نێو ئاستە جۆرا و جۆرە دەوڵەتییەکان و هاوکاریی ئاشتی خوازانەی نێوان ئەوانە.

## قەیرانە نێونەتەوەییە نوێکان

هانی چارەسەری کێشە سیاسییەکانی بەرواڵەت چارەسەرنەکراو دەدا بە لەبەرچاوگرتنی ئەم راستییە کە لە هەمان قۆناغی یەکەمی دارِشتنی گەڵاڵەی دامەزراوەکان کێشەکان سەر هەڵدەدەن کە دەبێ لە هەمان قۆناغدا چارەسەر بکرێ.

ئاکامی ئەم رەنگ بوونی سەربەخۆیی دەوڵەتە نەتەوەییەکان بەهۆی بەجیهانی بوونی مەسەلەکانەوەیە. دەوڵەتە مودێرنەکانی ئەمرۆیی چی دیکە ناتوانن، مەسەلەکان و کێشە جیهانی و نەتەوەییەکان بە تەنیایی و بە یارمەتی شێوازە باوەکانی هاوکارییە نێو دەوڵەتییەکان چارەسەر بکەن. لەم سەردەمەدا ئەم کارە بەبێ ستراتیژییە هاوبەشە سیاسییەکان مسۆگەر نابێ.

## بەکارهێنانی جیهانی

گەڵالەیەکی زیندوو گەشەسەندوو کە سەرەرای قەیرانە نوێیەکانی خۆی لەگەڵ بارودۆخی نوێی کۆمەڵگا رێکدەخا، ئاکامەکەی ئەوەیە کە وڵاتەکەمان، ناوچەکان و گەلان وێنەی فیدرالیستی سیستمی سیاسییان بۆ خۆیان هەلبژاردووە.

کردەوە و ئەندێشە سیاسییە جۆرا و جۆرەکان لە خۆ دەگرێ کەلەگەڵ دابەشکردنی کلاسیکی حیزبەکان لە چەپ و راست جیاوازە.

باسی پێشکەوتن لە قۆناغە جۆراوجۆرەکان دەکا- هەر بۆیە فیدرالیزم ئامانج نییە، بەڵکو رێگایە.

کۆماری فیدراڵی نەمسا (١٩٢٠) و بەتایبەتی بۆندی باکوور و رایشی ئەڵمانیا (١٨٧١ — ١٨٦٧) لە پەیوەندی لەگەڵ شەرِدا پێکهات. هەرچەند کە لە پێکهاتنی فیدرالیزم لە ئەڵمانیا رابردووی مێژوویی و بەرِێوەبردنی دەوڵەتەکان لەلایەن ناوچەکانەوە تارادەیەك رۆڵی گێرِا، بەبێ ئەوەی کە هاوچەشنی پرۆس لە رایش و لە کۆماری وایمار بچێتە ژێر پرسیارەوە، بەڵام هەمە چەشنی کۆمەڵایەتی و پشتیوانی فەرهەنگی لەم مەسەلەیەدا رۆڵێکی کاریگەری نەگێرِا. بێجگە لە هەرێمی بایرن هەرێمەکانی یەك شاری



هامبورگ و برمن کە لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانان دوای جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی ١٩٤٥ بە مەبەستی لە نێوبردنی پێکهاتەکانی پرۆس و لەسەر بنەمای بەرژەوەندی خۆی لە دابەشکردنی ناوچەکان، سەرە رۆیانە پێکهاتن، ئامانجی هەرێمەکانی دیکە کە لە ساڵەکانی ١٩٤٨-١٩٤٩ رۆڵێکی بەرچاویان لە دارِشتنی یاسای بنەرِەتی ئەڵمانیا گێرِا پێش لە هەموو شتێك ئەمە بوو کە بەدامەزرانی سیستمێکی فیدراڵی ئامرازی پێویست بۆ پێشگیری لە پێکهاتنی دووبارەی سیستمێکی یەك دەست و پاوانخواز هاتە کایەوە و هاوسەنگی لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵ و هەرێمەکان پیکبێنێ، کە هەڵبەت ئەم مەبەستە بە تەواوی جێبەجێ نەبوو، چونکە دەیان ویست کاراکتری سەرەکی فیدرالیزم لە ئەڵمانیا نە دابەشکردنی دەسەڵات، بەڵکو بەربەستکردنی بێ.

فیدراڵیزەکردنی ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٧٨ تایبەت بوو بە بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی فرانکسیمی پاوانخواز، هەروەها هەوڵدانێك بوو بۆ پێشکەشکردنی وەڵامێکی شیاو بۆ بزووتنە ناوچەییە فەرهەنگی و نەتەوەییەکان لەم وڵاتەدا.

لە لێکدانەوەی زانستی و تیۆری فیدرالیزم زۆرتر تەنیا سەرنج دەدەنە یەکێك لە لایەنەکانی ئاماژە پێکراو.

بیرۆکەیەك کە هەتا ناوەرِاستی سەدەی بیستەم زاڵبووە لە پلەی یەکەمدا تایبەت بووە بە دابەشکردنی ئۆرگانەکان و دەسەڵات. زۆربەی هەوڵەکان بۆ پێناسەی فیدرالیزم لە دیاریکردنی سنوور لەگەڵ دەوڵەتێك کە هەموو دەسەڵاتی تێدا کۆبووەتەوە لەم روانگەیەوە سەرچاوە دەگرێ کەبەپێی ئەو:

(١) تەواوی سیستمی سیاسی بە دەوڵەتی فیدراڵ و یەکەکانی دەوڵەتی ناوچەیی دابەشدەکرێ.

(٢) دەزگای بەرِێوەبەری و یاسا دانان لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵ و دەوڵەتە هەرێمییەکان لە رووی ئۆتۆنۆمی سیاسی تارادەیەك بە هێز دابەشدبێ.

(٣) هەرێمەکان لە گۆرِەپانی سیاسەتی فیدراڵ و کاریگەری بەسەر سیاسەتەکانیدا، چالاکانە بەشداریدەکا.

(٤) سیستم خاوەنی میکانیزمێکە بۆ چارەسەرکردنی کێشە و دژایەتییەکان لە سەر بنەمای دیالۆگ کە بڕیارگەلێك بۆ پشتیوانی کردن و بەشدارکردنی کەمایەتی یەکانیش دەخوازێ.

(٥) هەروەها دادگایەکی یاسای بنەڕەتی وەك بەرزترین ئۆرگان کە کێشەکانی نێوان ئۆرگانە دەوڵەتییەکانی چارەسەر دەکا، پێکدێ.

هەر بۆیە لەروانگەی یاسای بنەڕەتی و ئۆرگانییەوە، ئەو کات دەتوانین سیستمێکی سیاسی وەك فیدرالیزم بناسێنین کە گرنگترین پێکهاتەکانی ئەم سیستمە وەك دەزگای یاسادانان، بەڕێوەبەری، قەزایی، دەزگای بیروکراسی، پولیس و هتد... لە هەردوو ئاستی حکوومی (فیدراڵ و هەرێمی) بوونی هەبێ، بوونی ئەوانە لە یاسای بنەڕەتی گرەنتی کرابێ و هیچ یەك لەم دوو ئاستە نەتوانن، لایەنی بەرانبەر هەڵوەشێننەوە (بەراوردی بکەن بۆتە ١٩٧٧، شتو نسون ١٩٨٩).

بەڵام مامەڵەکردنی تیۆری لەگەڵ چەمکی فیدرالیزم بەس نییە و لێکوڵینەوەی ئەزموونی و بەراوردکردنی فیدرالیزم لەم سەردەمەدا دەبێ لایەنی زۆرترلە چاو رابردوو بگرێتە خۆکە بریتییە لە:

(١) بارودۆخ و بواری کۆمەڵایەتی فیدرالیزم، پێکهاتەی ئۆرگانی (دەوڵەتی) و نموونەی هەڵسووکەوتی نوخبە سیاسییەکانی کۆمەڵگا (فەرهەنگی سیاسی)، (٣) پەیوەندی نێوان ئینتگراسیۆنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تایبەتمەندییەکانی پرۆسەی فیدرالیزم. ئەم جۆرە مامەڵانە بۆیە گرنگە کە چوارچێوەکانی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی سیاسی و دامەزراوە داڕێژراوەکان دەتوانن فیدرالیزم بە پێچەوانەی رەوتێك کە دامەزرێنەرانی ئەو یاسا دانەرانەن لە بەرچاویان گرتووە رێنوێنی بکەن و ئەو دامەزراوانە کە دەسەڵات کۆدەکەنەوە، یان لە هەوڵی دابەشکردنی دەسەڵاتی بە هێزیان لاوازی بکا.

کەنەدا و ئەڵمانیا دوو نموونەی ئاشکران کە ئەو رەوتانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد پێواویانە:، ئاوا لە سیستمێکی ناوەندگەرا و یونیتارتیی بۆ سیستمێکی کۆنفیدراڵی فیدراڵیستی گۆڕا و بەرەو سیستمێکی بە تەواوی کۆنفێدرالیستی



هەنگاوی نا. بەڵام ئەڵمانیا لە سیستمێکی یونیتاریسی فیدراڵ لە دەیەکانی ٧٠،٨٠ بۆ سیستمێك کە دەسەڵاتی تێدا کۆنەبێتەوە گۆڕانی بە سەرداهات، رەوتێك کە بەیەکگرتنی دووبارەی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٩٠ جارێکی تر پێی لە سەر داگیرایەوە ((سەرچاوە ئابرومایت ١٩٩٢، شولتسە ١٩٩٣)).

لە نێو کۆمەڵێك هەلومەرجی گشتی کۆمەڵایەتی و لە تەنیشت جیاوازییە ناوچەییەکان و ئەو نابەرانبەرییانەی کە لە رووی ژمارەی حەشیمەت و پانتایی نێوان دەوڵەتەکانی ناوچە دەبینرێ، بە تایبەت لە دوو بەشدا گرنگییەکی تایبەتی پەیدا دەکا.

١- ناهەماهەنگی لە پێکهاتەکانی ئابووری و رێژەی گەشەی ئەوانە، هەروەها جیاوازییەکان لە چوارچێوەی ئاسایش و دابینکردنی کۆمەڵایەتی پەرەگرتووی یان پەرەنەگرتووی، نابەرانبەری لە بوارەکانی سەرچاوەی کەرەستەی خاو هتد... بوونی هەموو ئەم فاکتەرانە سیستمەکانی فیدراڵی بەرەو دابەشکردنی دەسەڵات رێنوێنی دەکا، ئەگەر بەشێکی بەرچاو لە خەڵك بۆ ماوەیەکی زۆر هەستبکەن کە دەوڵەتی فیدراڵ بایەخیان پێ نادا یان ئەوان دەچەوسێنێتەوە.

جیاوازی لە بواری ئاستی گەشەی ئابووری لەم سەردەمەدا بە روونی لە ناکاوە دەبینرێ، شوێنێك کە لەنێوان ناوەند — کە رێڕەوی پیشەسازی و دابینکردنی کۆمەڵایەتی دیاریدەکا — و ئەو ناوچانەی لە پەراوێزدان — کە کەرەستەی خاو رۆڵێکی کاریگەری لەژیانی خەڵکدا هەیە — کێشەیەکی زۆریان (هەڵبەت نە تەنیا بەهۆی بوونی ئەم جیاوازییانە) هەیە. ئەم کارە بووەتە هۆی وەگەڕ کەوتنی رەوتێکی بەردەوام بۆ "پێکهێنانی ئۆستانەکان" (دەستێوەردانی دەوڵەتی ئۆستانی، گەڵالەگەلێك بۆ پەرەسەندنی دەوڵەتەکانی ئەندام ستراتیژی بە پیشەسازی کردن و هتد...) کە بە گۆڕانکاری لە یاسای بنەڕەتی دا بە ئاکام گەیشت و ئەم لایەنە کە لەگەڵ گەڵاڵە و سیاسەتەکانی ناسیونالیزمی ئابووری بەراورد دەکرێ، وەڵامێك بوو کە لە ئاستی دەوڵەتەکانی ناوچە بەبەستراوەیی ئابوروی و نا بەرانبەری لە بواری گەشەی کۆمەڵایەتی-

ئابووری درایەوە، هەرچەند کە لەفیدرالیزمەکانی دیکە جیاوازییەکان لە رووی ئاستی گەشەی ئابووری ناوچەکان، کەهەڵبەت بەم بەربلاوییە نییە، نەبووەتە هۆی پێکهێنانی دژایەتی و کێشە گەلێك کە سیستم بخاتە مەترسییەوە.

٢- بۆ {راڤە کردنی} پێکهاتەی سیستمەکانی فیدراڵ، هۆگری بەگەل و ناوچەی تایبەت، قایل بوونی پێناسەی نەتەوەیی بۆ خۆی، هەروەها بوونی دامەزراوە گەلی نەتەوەیی- فەرهەنگی، زمانی و مەزهەبی گرنگییەکی تایبەتی پەیدا دەکا. {بەم مانایە کە بە پێی ئەم پێکهاتانە جۆری فیدرالیزم کە بڕیارە دابمەزرێ جیاوازی هەیە}.

(١) فیدرالیزمی ئەڵمانیا و نەمسا بە نیسبەت فیدرالیزمە فرە نەتەوەییەکان پێکهاتەیەکی هاوشێوەی هەیەو دوورە لە کێشەی قەومی- فەرهەنگی و دوای جەنگی دووەمی جیهانی بە خێراییەکی چاوەڕوان نەکراو جۆرێك تێگەیشتنی بنەڕەتی کە لەگەڵ پێناسەی نەتەوەیی بەراورد دەکرێ پێکهێنا. ئەم فیدرالیزمە دەبێ لە فیدرالیزمە فرە نەتەوەیی و فەرهەنگییەکان جیا بکرێتەوە.

(٢) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئوسترالیا جیاوازی ئەتنیکی، فەرهەنگی، نەژادی، زمانی و مەزهەبی ناوچەیی نین {نەتەوەیەکی تایبەت لە ناوچەیەکی تایبەت ناژی}. دەسەڵاتی نەتەوەیش لەم وڵاتانەدا بە پێی یەك نەتەوە، زمان، یان ئایینی فەرمیی دیاریکراو پێناسە نەکراوە. هەر بۆیە ئەنگیزەی کەمایەتییەکان کە خۆیان لەگەڵ ئەو بارودۆخە بگونجێنن، زۆرە. سیاسەتی فەرهەنگی و پەروەردەیی دەوڵەتەکانی هەرێمی بەپێی پێکهاتەی ناوبراو دانەمەزراوە، هەرچەند لێرە و لەوێ بایەخ بە فەرهەنگ و زمانی نەتەوە جۆراو جۆرەکانی نیشتەجێ لەم وڵاتانە دەدرێ.

(٣) پێکهاتەی فرەنەتەوەیی و فرەفەرهەنگی تایبەتمەندیی سەرەکی فیدرالیزم لە بەلجیکا و سویسرایە کە لەواندا زۆربەی هەریەك لەم نەتەوانە بەستراوە بە ناوچەیەکی دیاری کراو دابەشکردنی وڵات بەم پێیە دارێژراوە. فیدرالیزم و سەربەخۆیی نێوخۆیی



کانتونەکانی (دەوڵەتە هەرێمییەکان) سویسرا بووەتە هۆی ئینتگراسیۆنی نەتەوەکانی سویسی (بێجگە لە یوراسییەکان و رتورمانییەکان)، پتەوتر بوونی ئەوانە لەگەڵ یەکتر بە هێز دەکا. لەخاڵێکدا لەبەلجیکادا هاتووە دەبێ نیشانیبدا کە ئایا فیدرالیزمێك کە لە ساڵی ١٩٨٠ دامەزراوە و لەورا دابەشکردنی کار و بەرپرسیارەتییەکان بە لە بەرچاوگرتنی هۆگریی فەرهەنگی و زمانی بەڕێوەچووە و ناوچەکانی فلامییەکان و ڤالۆنییەکان کە لە رووی ئاستی گەشە جیاوازی یان پێکەوە هەیە، دەتوانێ کێشەکانی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە چارەسەر بکا یان نە. ئەم مەسەلەیە بۆ ئیسپانیای فیدرالیزم.. بوو (روستەکە لە ناوچەی جۆراوجۆر بە نەتەوە و فەرهەنگی تایبەت بەخۆی پێکهاتووە و سەرەرای ئەوەش ئەم ناوچانە لە رووی ئاستی گەشە و پێکهاتەی ئابوورییەوە زۆر نابەرانبەر و نەگونجاون.

(٤) بەڵام فیدرالیزم لە کەنەدا کەوتوەتە بەر کاریگەریی پەیوەندی پڕ لە ئالۆزی فرە فەرهەنگی — ناوچەیی لەلایەك و دوو نەژادی کۆمەڵگای فەڕەنسی زمانی کیبیك و ئینگلیزی زمانی کەنەدایی لە لایەکی دیکەوە. بنەمای فیدرالیزم لە کەنەدا هەم تیۆری ریککەوتننامەی کۆمەڵایەتییە {گرەنتی مافی هاووڵاتی بۆ هەموو لە تەواوی کۆمەڵگادا} و هەم تیۆری ریککەوتننامەی سیاسی — ناوچەییە {بە فەرمی ناسینی مافی نەتەوەیی کیبیکەکان}، ئەمە سیاسەتێکە کە هاوسەنگی و بەرانبەری لە نێوان ئینگلیزی زمانەکان و فەڕەنسی زمانەکان دەپارێزی و بایەخ دەداتە ئاراستەی کۆمەڵناسیی تیۆری تەواوەتی کۆمەڵگاو هەم بەتایبەت ئەو هێزانەش بە هێز دەکا کە کەنەدا وەك موزائیکێك لە نەتەوە جیاوازەکان پێناسە دەکا. هەردووی ئەمانە ئەم وڵاتە بەرەو سیستەمێکی فیدراڵی دەبەنە پێشەوە.

فەرهەنگی سیاسی دەسەڵاتدار و سیستەمی حیزبەکانی ٨ وڵاتی فیدراڵی پیشەسازی ناوبراو لە زۆر بواردا لەگەڵ یەکتر جیاوازییان هەیە. ئەم جیاوازیانە دەگەڕێنەوە بۆ دوو جۆر سیستەمی حیزبەکان و هەڵبژاردنی دژبەیەك:

١- دژایەتی نێوان ((سیستمی هەڵبژاردنی زۆرینە)) و کێبەرکێ وەك نیشانەیەکی بەرچاوی ئەم جۆرە لە فەرهەنگی سیاسی کە دژایەتییەکان و کێشەکان

لەخۆیدا دەشارێتەوە و ((سیستەمی هەڵبژاردنی ڕێژەییە و دیالۆگ وەك نیشانەیەکی بەرچاوی ئەو فەرهەنگە سیاسییە کە دژی جیاوازی و ناکۆکییەکانە.

٢- دژایەتی نێوان سیستەم و پێکهاتەکانی حیزبی تێکەڵاو سەرتاسەری لەگەڵ سیستەمی حیزبەکانی کونفیدراڵ و دوو ڕەگەزی.

بەپێی ئەو بۆچوونە باوانەی کە گوایە هەندێك لە ڕواڵەتە سیاسییەکان، مودێلەکانی یاسای بنەڕەتی و سیستەمی حیزبەکان لەگەڵ فیدرالیزم یەك ناگرنەوە و یان لەگەڵ یەك دژایەتییان هەیە، کارکردنی فیدرالیزم نیشانیداوە کە پێکهاتە جیاوازەکان و فاکتەرە دیاریکەرەکان دەتوانن پێکبێن و پێکەوە بێنە مەیدان، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبنە هۆی خولقانی کێشە و هەروەها ڕێگاچارەی تایبەتی و هاوریێ لەگەڵ چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکان و پێکهاتەی یاسایی سیستەمی سیاسی، فیدرالیزم یان بەرەو سیستەمێك کە دەسەڵاتی تێدا کۆببێتەوە و یان بەرەو سیستەمێك کە دەسەڵات دابەشدەکا پاڵی پێوەدەنێ. ئەم کارە بەتایبەت بۆ پێکهاتنی مۆدێلی ((ویست مینستر)) ﴿یەکێك لە شارەکانی بەریتانیا﴾ لەگەڵ فیدرالیزم، هەروەها سەبارەت بە تێکەڵاوکردنی سیستەمی هەڵبژاردنی زۆرینە لەگەڵ کۆمەڵێك لە پێکهاتەکانی فیدراڵیستی ڕاستە، کە لە ئوسترالیا و بەتایبەت لە کەنەدا پێ لەسەر سەربەخۆیی کردەوە و دەسەڵاتی دەوڵەتە هەرێمییەکان دادەگیرێتەوە و لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی پێکهاتنی سیستەمگەلی حیزبی کۆنفیدراڵی و روونەژادی. لەکەنەدا حیزبە سەرتاسەری و ئۆستانییەکان سەربەخۆن. سەرەرای ئەمەش، هەندێك لە حیزبەکان تەنیا لەیەکێك لە دووئاستی (سەرتاسەری یان ئۆستانی) خۆی دەپاڵێوێ.

ئەم حیزبە سەرتاسەرییانە و حیزبە ئۆستانییەکان کاریگەریی جیاواز و دژبەیەك لەسەر رووداوەکان دادەنێن: لەلایەك قازانج و بەرژەوەندی سیاسی ناوچەکان دەتوانن وردترو شەفافتر دابڕێژرێ و لە دانوستانەکانی ئۆستانەکان لەگەڵ دەوڵەتی فیدراڵ بێتە بەرباس (ئەگەری زۆرە کیبیکەکان لەڕابردوودا بەهۆی خۆبواردنی حیزبەکانی کیبیکی لە تێکۆشان لەئاستی سەرتاسەری دا بووکە توانییان بەرژەوەندی خۆیان بەهاوکاری



حیزبەکانی خۆیان نوێنەرایەتی بکەن. لەلایەکی دیکەوە بەهۆی بوونی دوو ڕەگەزی حیزبەکان، حیزبە سەرتاسەرییەکان کەمتر توانیویانە خواستی ناوچە جیاوازەکان بێنەبەر باس و نوێنەرایەتی بکەن. سیستەمێکی ئەوتۆی کۆنفیدراڵیستی حیزبەکان (حیزبە سەرتاسەریەکان لە تەنیشت و لەبەرانبەر حیزبە نەتەوەیی- ناوچەییەکان) دەتوانێ ببێتە هۆی بەهێزبوونی ئاڵۆزیی دەوڵەتی ناوەندی لەگەڵ دەوڵەتە هەرێمییەکانیش.

پێچەوانەی ئەم ڕەوتە لە نەمسا، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا دەبینرێ. لەم وڵاتانەدا حیزبە سەرتاسەرییەکان کە بەڕێژەیەکی یەکجار زۆر تێکەڵی (سیستەمی سیاسی)بوون، بە فەرهەنگی سیاسی بە مەبەستی تێگەیشتن و پەیوەندی نزیکی کادری و ڕێکخراوەیی لەگەڵ هەرێمەکان زامنی ئەوبوون کە بەرژەوەندی ئەم هەرێمانە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو نوێنەرایەتی بکەن و ئەمە بووەتە هۆی بەهێزبوونی دەسەڵات و نفووزی ئەوان هەم لە ئاستی سەرتاسەریدا و هەم لەئاستی هەرێمیدا. حیزبی سوسیال مەسیحی ئەڵمان نموونەیەکی تایبەتییە. حیزبی ناوبراو سەرەڕای پارێزگاری لە بەرژەوەندی هەرێمی بایرن، بەتایبەت ئامانج و ئەندێشە سیاسییەکانی خۆی لە ئاستی سەرتاسەریدا تاقیب دەکا. کێشەی هەرێمەکان نە لەسەر بەرژەوەندی ناوچەیی، بەڵکو لەسەر گەڵاڵە جۆراوجۆرەکان بۆ هاوشێوەکردنی بارودۆخی ژیان لەسەرتاسەری ئەڵمانە.

فیدرالیزم پێکەوە لکێندراو مودێلێکە لە سیستەمی سیاسی کە لەلایەن یاسای بنەڕەتی ئەڵمانیاوە بۆ ئەم وڵاتە دیاریکراوە و بریتییە لەم چەند خاڵە:

١- دابەشکردنی دەسەڵاتی بەپێی جۆر: مافی یاسادانان و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری یاساکان. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە لە ئەڵمان خاڵی یەکەم لە ئەستۆی دەوڵەتی فیدراڵە و دووەم لە لایەن دەوڵەتە هەرێمییەکانەوە بەڕێوە دەچێ. هەڵبەت یاسادانان لە بوارەکانی فەرهەنگ، پەروەردە و فێرکردن، پۆلیس، ئاسایشی نێوخۆیی، سیستەمی شارەوانییەکان لە ئەستۆی هەرێمەکانە و بوارەکانی دیکە لە ئەستۆی پەڕلەمانی فیدراڵییە بەڕێوەبردنی هەمووی ئەم یاسایانە لانیکەم لە ئەستۆی پیاوانی دەوڵەتە هەرێمییەکاندایە. لە پەیوەندی لەگەڵ ماڵییەکان و دابەشکردنی مافی یاسادانانی تا رادەیەکی زۆر لە ئەستۆی پەڕلەمانی فیدراڵە و هەرێمەکان و شارەکان بەهۆی

دەسەڵاتی ئیداری یان مافی تەرخان کردن و خەرجی ئەوان بەپێی ڕەزامەندی خۆیان بەرپێژەیەکی زۆر هەیە.

٢- بەشدار کردنی دەوڵەتە هەرێمییەکان لە سیاسەتی فیدراڵ لە ڕێگای ئەنجومەنی فیدراڵەوە.

٣- هاوکاری، هەم لە نێوان خودی هەرێمەکان (بۆ نموونە لە ڕێگای دامەزرانی هاوسەنگی ماڵی ئاسۆیی) و هەم لە نێوان هەرێمەکان و دەوڵەتی فیدراڵ (بۆ وێنە لە ڕێگای کومیسیۆنەکانی هاوبەش، ئەنجومەنی پلان دانانی ماڵی و هتد...).

فیدرالیزمی نێوان دەوڵەتی (هەرێمەکان بەپێناسەی دەوڵەتییەوە) کە بەپێی بنەماکانی دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات، یا دەوڵەتەکانی خودموختار دامەزراوە و خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەیە:

١- دوو ڕەگەزی پێکهاتەکانی دەوڵەتی، بۆ نموونە لە ئەمریکا و بەڕادەیەکی کەمتر لە ئوسترالیا و کەنەدا (لانیکەم هەموو ئۆرگانە دەوڵەتییەکان، لەوانە دامەزراوەکانی یاسادانان، قەزایی و بەڕێوەبەری، هەم لە ئاستی فیدراڵدا هەیە و هەم لە ئاستی هەرێمەکاندا) بێ ئەوەی کە یەکێك لەم دوو ئاستە بەستراوە بەیەك بن.

٢- دابەشکردنی دەسەڵاتەکان نە بەپێی جۆری دەسەڵاتەکان (مافی یاسادانان یا بەڕێوەبردنی یاساکان)، بەڵکو بەپێی بوارەکان و بەشە سیاسییەکان (بۆ نموونە سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەوە) و گرەنتی کردنی ئەم ماف و دەسەڵاتانە لە یاسای بنەڕەتیدا.

بەشداربوونی دەوڵەتەکانی ئەندام لە دارشتنی سیاسەتی فیدراڵ لە ڕێگای ئۆرگانێکی پێکهاتوو لە نوێنەرانی خەڵك بەپێی بنەمای ئەسڵی پەرلەمانی سەنا، بەو جۆرەی کە لە ئەمریکا و ئوستوراڵیا و سویسرا هەیە. کەنەدا بەهۆی بوونی پەیوەندی دابڕاو و کۆن بوونی لەم بوارەدا جیاوازە لە وڵاتانی دیکە، چونکە لەم وڵاتەدا بەهۆی دیاریکردنی سناتورەکان لەلایەن سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی ئوستانەکان بەهیچ شێوەیەك لە پرۆسەی یاسادانانی دەوڵەتی فیدراڵدا بەشدار نین.

هەڵبەت لە مۆدیلی نێوان دەوڵەتی فیدرالیزمیشدا دابەشکردنی دەسەڵات بەستراوەتەوە بەوەی کە یاسای بنەڕەتی چ دەسەڵاتێك بە چ ئاستێك دەبەخشێ و



بەندەکانی ئەم یاسایە تا چەند بەڕێوە دەچێ. بۆ نموونە لە یاساکانی بنەڕەتی ئەمریکا، ئوسترالیا و سویسرا دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵ دارێژراوە، بەم جۆرە تەواوی بەشە سیاسییەکان کە ماونەتەوە و باس نەکراوە، لە چوارچێوەی دەسەڵاتی دەوڵەتەکانی ئەندام دایە. لە کەنەدا دەسەڵاتی هەردوو ئاستی فیدراڵ و ئوستانەکان لە یاسای بنەڕەتیدا باسکراوە، لە ڕووی یاساییەوە هەرچی دەمێنێتەوە دەکەوێتە چوارچێوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵ، بەڵام بەکردەوە ئەوە ئوستانەکانن کە خاوەنی ئەم دەسەڵاتانەن.

بەگشتی دەتوانین بڵێین کە یاسا بنەڕەتی سیستەمەکانی فیدراڵ دابەشکردنی دەسەڵات لە سەر ئەم بنەمایەیە کە سەرزەوی و خاك (لەگەڵ سەرچاوە ژێرزەوییەکان) پەیوەندی بە دەوڵەتەکانی ئەندام و هەرێمەکان هەیە و بازرگانی بە دەوڵەتی فیدراڵ، سەرەڕایی ئەمەش پەروەردە و فێرکردن و فەرهەنگ و مافی هاوڵاتی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەکانی ئەندام دایە.

لە پەیوەندی لەگەڵ یاسای ماڵیەکانیش چەند جۆر میکانیزم هەیە :

١- یان دەسەڵاتەکان هاوتەرین (واتە هەم دەوڵەتی فیدراڵ و هەم دەوڵەتە هەرێمییەکان لەم بوارەدا دەسەڵاتیان هەیە) وەك ئەمریکا.

٢- یان بەشی زۆرتری دەسەڵات لەم بوارەدا لایەنی دەوڵەتی فیدراڵە وەك ئوسترالیا.

٣- یان هەرێمەکان لەم بوارەدا دەسەڵاتیان هەیە وەك کەنەدا (لەم وڵاتە لەم چەند ساڵەی دواییدا تای تەرازوو بەتایبەت لەم بەشەدا بە قازانجی ئوستانەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە).

لەم پەیوەندییەدا تەفسیری یاسا لەلایەن بەرزترین ئۆرگانی قەزاییەوە گرنگییەکی زۆری هەیە...

(١) بەدوای ڕەوتی نوێی لیبراڵی کۆمەڵگای پیشەسازی بەرەو دەوڵەتگەلی پێشکەوتوو هەتا سەرەتای دەیەی ٨٠ لە وڵاتانی فیدرالیستیشدا شاهێدی پەرەسەندنی ڕۆڵ و کارکردنی دەوڵەتەکان بووین. هەڵبەت ئەمە بەمانای کۆکردنەوەی دەسەڵات و

لاوازکردنی دەوڵەتە هەرێمییەکان نەبووە، بەو جۆرەی کە دەسەڵاتی ئوستانەکاندا لە دەیەی ٥٠بەم لاوە بۆ وێنە نیشاندراوە. (سەرنج بدەنە شوڵتسە ١٩٨٥). سەرەڕای ئەمەش دەتوانین رەوتە هاوبەشەکانی ئەم سیستەمانە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم بابەتە بەم جۆرە رەسم بکەین.

١- لە ناوەندی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی فیدراڵ و دەوڵەتەکانی ئەندام لە سەرەتای پەرەسەندنی ئەرکە دەوڵەتییەکان لە تەواوی فیدرالیزمەکاندا ململانێ لەسەر یاسای ماڵی، دابەشکردنی داهاتی ماڵیەت و هاوسەنگی ماڵی ستوونی (لەلایەن دەوڵەتی فیدراڵ بە هەرێمەکان و شارەوانییەکان بۆ ئەرکێکی دیاریکراو و یان خەرجی ئەو بەپێی رەزامەندی خۆیان) و ئاسۆیی (وەك ئەڵمان لە نێوان خودی هەرێمەکان) هەیە. بەم جۆرە هەرێمەکان (بێجگە لە کەنەدا) یەك راست دەبنە کرێچی دەوڵەتی فیدراڵ.

٢- پەرەسەندنی دەزگای ئیداری لە هەدروو ئاستی فیدرالیزم دەبێتە هۆی لاوازی پەرلەمانەکانی فیدراڵ، بەتایبەت پەرلەمانی هەرێمەکان. ئەم ئۆرگانە یاسادانەرانە تەنیا لە هەندێك بواردا توانیویانە ئەو رێککەوتنانەی کە حکومەتەکان و بروکراسییەکان لە پێناوی هاوسانکردنی بارودۆخی ژیانی خەڵك کردوویانە هەڵوەشێننەوە و تەنیا پاش ئەم لێك تێگەیشتنانە بوو کە ئەوان توانییان دەوڵەتە دڵخوازەکانی خۆیان سزا بدەن.

٣- هاوکارییەکانی و تێکەڵ بوونەوەی رووڵەگەشەی ئاستە جیاوازەکانی سیستەمی فیدرالیزم لە رێگای کۆنفراسی وەزیرەکان و کارناسانی بەشە جیاوازەکانی دەوڵەتی، لەرێگای ئۆرگانەکان و ئەنجوومەنە هاوبەشەکانی بڕیاردان و هتد... بووە هۆی دروستبوونی ئەم بۆچوونە کە لە تەنیشت ئاستی فیدرال و ئاستی هەرێمەکان بەرە بەرە ئاستێکی دیکە لە نوێنەرانی بەشی دەوڵەتی لە حاڵی دروستبوون دایە.

ئەم تێکەڵ بوونەوەی ئاستە جیاوازەکانی سیاسی بە تایبەت لە فیدرالیزمی ئەڵماندا دەبینرێ. بەو جۆرەی کە شاریۆف و کەسانی دیکە لە ساڵی ١٩٧٦دا



نیشانیان داوە، سیستەمەکانی پێکەوە لکێنراوی کورتخایەن توانایی زۆرتری هەیە بە نیسبەت ئەو سیستەمە سیاسییانەی کە دەسەڵاتی تێدا کۆبووەتەوە بۆ رووبەرووبوون لەگەڵ کێشەکان و جیاوازییەکانی پۆست کاپیتالیزم و دیموکراسی کێبەرکێی، چونکە دابەشکردنی ئۆرگانەکانی لە نێوان ئاستە جیاوازەکان و دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات لە هەمان حاڵەتی تێك ئاڵانی ئاستە دەولەتییەکان لە یەکتر لە لایەك دەسکەوتی سیاسی دەباتە سەرەوە و هەزنیەکان دابەشدەکا و لە لایەکی دیکەوە ئەو کێشانەی کە چارەسەر ناکرێن لە رێگای "لێکوڵینەوە" و بەرێکردنی لە ئاستێك بۆ ئاستێکی دیکە لە کاریگەری دەخا. هەڵبەت دامرکاندنەوە و کەمکردنەوەی کورت خایەنی فشاری کێشەکانی بۆ خۆی دەتوانێ ببێتە هۆی دروستبوونی کێشەی درێژخایەنتر. بنەمای فیدرالیزمی پێکەوە لکێندراو رێککەوتن و لێك تێگەیشتنی هێزە سیاسییەکان و ئاستە جیاوازەکانی ئەم جۆرە لە سیستمی فیدرالیزمە. فشار بە مەبەستی رێککەوتن لەم سیستمەدا بووەتە هۆی ئەوەی کە هەر هێز و ئاستێکی سیاسی هەوڵبدا کە لە گرژی و ئاڵۆزی خۆی بپارێزی. هەروەك لایەنێك دەتوانێ لە لایەك ببێتە لەمپەر لە بەردەم پێشگیری لە چاکسازی و نوێ بوونەوە (هەر وەك کە زۆرجار بە تایبەت لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٠ لە ئەڵمانیا شاهیدی بووین)، و لە لایەکی دیکە لە بەرچاونەگرتنی کێشە نوێیەکانی کۆمەڵایەتی و نەبوونی جموجۆڵی سیاسی بە دواوەبێ و ئەم درێژخایەنییە رەوایی پێشڕەوانی سیاسی {کە ئەرکی چارەسەر کردنی کێشەکانی خەڵکیان لە سەر شانە} دەباتە ژێر پرسیارەوە.

(٢) فیدرالیزم لە دیموکراسییەکانی پیشەسازیدا لە دەیەکانی ٧٠-٨٠ لە رووی رەوایی خۆیەوە تووشی قەیران بوو. هەروەها ئەم پرسیارە کە ئایا بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە سەر بنەمای فیدرالیزم یان وردتر بە هۆی قورسی ئەرکەکانی حکوومەت لەم سیستمەدا دەکرێ رۆڵی گەورە لە باسەکانی پەیوەندیدار بە فیدرالیزم بگێڕێ.

هەروەك نموونەی "نوێ فیدرالیزم"ی سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا، نیکسون و رێگان نیشانیانداوە، ئامانجێك کە پارێزگارەکان لە رێفورمی فیدراڵیستی گرتبوویانە

پێش یەکسان نەبوون: مەبەستی نیکسون بردنە سەری ئاستی کارلێهاتوویی سیاسەتەکانی (تایبەت بە دابینکردنی کۆمەڵایەتی) دەوڵەت لە ڕێگای کۆنەبوونەوەی دەسەڵات لە پێکهاتەی دەوڵەتی و دابەشکردنی ئەرك و دەسەڵاتەکان بوو. بە هەرحاڵ ناوبراو هەڵوەشانەوەی پێکهاتەکانی فیدراڵیستی و بردنە ژێر پرسیاری دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵ و دەوڵەتە هەرێمییەکانی لا مەبەست نەبوو. دابەشکردنی گشتی داهاتەکان و تەرخانکردنی بودجەی دەوڵەتی فیدراڵ بۆ هەرێمەکان بە مەبەستی خەرجکردن بە ڕەزامەندی خۆیان ئامرازەکانی ئەم کارەبوون (سەرنج بدەنە کندان ١٩٨٩). بەڵام "نوێ فیدرالیزم"ی ڕێگان بەشی جیانەکراوەی سیاسەت و پروگرامی کاری ناوبراو بۆ پاشەکشە پێکردنی دەوڵەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی بە شێوەی گشتی و لە پێشکەشکردنی خزمەت گوزاری کۆمەڵایەتی بە تایبەتی بوو. مەبەستی ناوبراو تەنیا کۆنەکردنەوەی دەسەڵات لە ناوەند و کەمکردنەوەی قورسایی ئەرکی دەوڵەتی بە هۆی "قەیرانی ماڵی دەوڵەت" نەبوو، بەڵکو خاوێن کردنەوەی دەوڵەت و "هەڵوەشانەوەی پێکهاتەکانی فیدراڵیستی دەوڵەتی" بوو (لوشە ١٩٨٩).

بەنیسبەت ئەو ئاماجانەی کە هەوڵەکانی قۆناغی نیکسون لە پەیوەندی لە گەڵ کۆنەبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەند، هەروەها پرۆگرامەکانی قۆناغی ڕێگان بۆ خاوێن کردنەوەی دەوڵەت و کەمکردنەوەی قورسایی ئەرکی دەوڵەتی بۆ خۆیان دیاریکرد بوو، دەبێ هەردووی ئەوانە شکست خواردوو بزانین. لەگەڵ ئەمەشدا ڕیفورمەکانی ڕێگان سیستمی فیدرالیزمی لە ئەمریکا بە شێوەی کاریگەر و درێژخایەن گۆڕی. سەرەرای ئەمانە گۆڕانکاری لە پێکهاتەی فیدرالیزمی ئەمریکا و ئوسترالیا نیشاندەدا کە وەك پروگرامەکانی کۆنەکردنەوەی دەسەڵات لە ناوەند لە فیدرالیزمە دوو ڕەگەزییەکاندا و لە سەر بنەمای دابەشکردنی دەسەڵات دارێژراوە لانیکەم ئەگەری جێ بە جێ بوونی زۆرترە لە سیستمەکانی پێکەوە لکێندراوی فیدراڵیستی {وەك فیدرالیزمی ئەڵمانیا}. لە خۆڕا نەبوو کە هەوڵ و سیاسەتەکانی دابەشکردنی دەسەڵات لە دەیەی٨٠ یان



بەشێکی سەرکەوت، یان ئەگەر هەموویان سەرکەوتوو بوون، ئەم سەرکەوتنە لە چوارچیوەی هەندێك شتی بێ بایەخ وەك "پرۆگرامی یارمەتی بە خوێندنی باڵا" بوو.

(سەرنج بدەنە کلات ١٩٨٦). ئاڵوگۆڕی گرنگ دواتر لە ڕەوتی یەکگرتنەوەی دوو بارەی ئەڵمانیا و لە ئاکامی ڕێککەوتننامەی ماستریخت (یەکێتی ئەوروپا) ڕوویدا. ئەم گۆڕانکارییە لە دابەشکردنی دەسەڵات بریتی بوو لە :

(١) بەشدار کردنی هەرێمەکان لە ڕێگای ئەنجوومەنەکانی فیدراڵ لە پرۆسەی دابینکردنی دەسەڵات لە بوارە جیاوازەکان بە ئورگانە فرەنەتەوەییەکان، لە بڕیارەکانی کۆمیسیۆنی یەکێتی ئەوروپا و ئەنجوومەنی وەزیرانی ئەوروپا، هەروەها لە کۆمیسیۆنی ناوچەکانی یەکێتی ئوروپا.

(٢) یەکسان کردنی ژمارەی ئەندامانی هەرێمەکان لە ئەنجوومەنی فیدراڵدا.

(٣) کەم ڕەنگترکردنی بەندی ٧٢ ی یاسای بنەڕەتی کەلەکاتی پێویستدا یاسادانان لە دەستی پەرلەمانی فیدراڵ دایە {بە واتای بردنە سەری خاڵەکانی یاسادانان لە لایەن پەرلەمانی هەرێمەکانەوە}،

(٤) دیاریکردنی ئەسڵی "پێویستی بارودۆخی ژیانی تاکی هاووڵاتی یان لە ئاستی سەرتاسەریدا" لە جێگای ئەسڵی "پێویستی هاوبەها بوونی بارودۆخی ژیانی هاوڵاتییان"".

(٥) گەڕانەوەی دەسەڵات (هەڵبەت نە ئەوەندە سەرەکی) لە دەوڵەتی فیدراڵ بۆ هەرێمەکان.

(٦) بەشداریکردنی سێ هەرێمی نوێی ئەڵمانیا {کە پێش لە یەکگرتنی ئەڵمانیا بەشی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بوو} لە لیستی فیدراڵیستی ماڵیدا.

ئەم ریفۆرمانە پرۆسەی دوو لایەنی تێك ئالاوی سیاسیی نێوان هەرێمەکان و دەوڵەتی فیدراڵ و یەکێتی ئەوروپا بە هێز دەکا و بە تایبەت بەیەکگرتن و تێکەڵاو کردنی ماڵی و باجی بەستراوەیی ماڵی هەرێمەکان بە دەوڵەتی فیدراڵ زیاتر دەکا. ئەم گۆڕانکاری یانە تەنیا ڕیفورمگەلێکن بۆ یەکسان کردنی فیدرالیزمی ئەڵمانیا لەگەڵ

بارودوخ، بەڵام هێشتا وەڵامدەری پێویستی و ئاڵوگۆڕەکان لە پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا و یەکگرتنی دووبارەی ئەڵمان نییە (سەرنج بدەنە شولتسە ١٩٩٣).

سەرەڕای هەمووی ئەمانەی ئاماژەیان پێکرا، فیدرالیزمی ئەڵمان بەهۆی توانای بەرزی تێکەڵکردن و ئینتگراسیون و کاریگەریی ئەو لە ساڵەکانی پێش یەکگرتنەوەی ئەڵمان لە زۆربەی وڵاتەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە دەیانەوێ ماڵئاوایی لە سەنترالیزم و کۆبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەند بکەن و لە پرۆسەی دابەشکردنی دەسەڵات و فیدراڵیزاسیون جێ بگرن، وەك نموونەیەکی سەرکەوتوو باسیدەکەن. بۆ نموونە لە یاسای بنەڕتی ئیسپانیا دوای ١٩٧٨ پەیوەندی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و ((کۆمەڵگای خودموختاری بە ڕێژەیەکی زۆر بەپێی یاسای بنەڕەتی ئەڵمان داڕێژراوە. ئەم مەسەلەیە بووە هۆی گرژی وئاڵۆزی هاوشێوەی نێوان کارکردو ڕۆڵی دەزگای بەڕێوەبەری و یاسادانان و بەستراوەیی ماڵی لە رادەبەدەری ناوچە خودموختارەکان بە دەوڵەتی ناوەندی لە مەدرید. ئەوەی کە راگواستنی ئەزموونی فیدراڵستی ئەڵمان بۆ ئیسپانیا بە سەرنجدان بە بارودۆخی جیاوازی کۆمەڵایەتی سەرکەوتوو، جێگای گومانە، چونکە پێویستی سیستەمی پێکەوە لکێندراوی فیدرالیزم، بەو جۆرە لە ئەڵمان هەیە، بوونی هاوچەشنی لە کۆمەڵگایە. ئەم هاوچەشنییەیە کە بووەتە هۆی ئینتگراسیون و تێکەڵاوبوونی سیستەم لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی و نەهێشتنی گرژی و ئاڵۆزی.

پێچەوانەی پرۆسەی سەرەوە لە کەنەدا دەبینرێ. لەم وڵاتە ریفۆرمی فیدرالیزم بەرەو سیستەمێکی فیدراڵیستی نێوان دەوڵەتی دەڕوا، بەو جۆرە کە زۆرێك لە زانایانی زانستی سیاسی خوازیاری بوون.

(٣) لە کۆتاییەکانی دەیەی ٨٠ بەم لاوە دووبارە بایەخ و گرنگی فیدرالیزم وەك بنەمایەك بۆ ڕێکخستنی دەوڵەتی چووە سەرەوە. مەبەست لە گەڕانی لەسەرخۆ بۆ دیاریکردن و دارشتنی پەیوەندی نێوان جۆراوجۆری و یەکگرتن کەمتر دەسراگەیشتن بەکارلێهاتوویی، ئینتگراسیون و بارودۆخێکی یەکسانی ژیانە، بەڵکو لە پلەی یەکەمدا دابەشکردنی دەسەڵاتەکانە لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵ و هەرێمەکان لەسەربنەمای "ئەسڵی سوپسیدیارتییە"، بەخشینی سەربەخۆیی نێوخۆیی بە ناوچەکان



﴿لەڕووی سیاسی، فەرهەنگی، ئابووری، بەڕێوەبەری قەزایی و ئەمنیەتی﴾، بە فەرمی ناسینی و ڕێزلێنان لە فرەیی، هەروەها پارێزگاری و پشتیوانی لە کەمایەتییەکان لە بەرانبەر زۆرینە و پێشگیری لە دروستبوونی حکوومەتی پاوانخواز.

سەرنج و هۆگرییەك کە لەم ساڵانەی دواییدا بەفیدرالیزم دەبینرێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رەوت و هەوڵە سیاسییانەی کەلە ئاستی جیهانیدا بۆ ڕێکخستنی دووبارەی دەسەڵاتی سیاسی دراوون، ئەم پرۆسانە بەدوای هەڵوەشانەوەی جەمسەرە سیاسی و سەربازییەکانی رابردوو و رووخانی یەکێتی سۆڤییەت و وڵاتانی فرەنەتەوەیی ئەوروپای رۆژهەڵات و ناوەندی وەگەڕ کەوتوون. دابەشکردنی دەسەڵات و فیدرالیزم تەنیا ئەلتەرناتیڤی ئەوان بۆ ناوەندگەرایی، پاوانخوازی و سەرەڕۆییە، هەرچەند کە هیوای ئەوان بە سەرنجدان بەو هەمووە شەڕەی ساڵانی دوایی، بەتایبەت لە یوگسلاڤیای پێشوو، کەم بووەتەوە.

کێشەکانی ئەمڕۆ بەسەرنج دان بە بەجیهانی و کارەیی بوونی تەکنۆلۆژیا و ئابووری وەڵامی نوێ دەخوازێ. دەبێ لە سەردەمی نوێدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە کە چ کێشەگەلێك ئەوەندە گەورەن کە میکانیزم و پێکهاتەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی یان فیدراڵ توانای چارەسەرکردنی ئەوانەی نییە و دەبێ لە ئاستی بان نەتەوەیی، هەرێمی یان ناوچەیی چارەسەربکرێن. لە ئاستی بان نەتەوەیی و کارەییەوە دەبێ بەپێی وەرگرتن (ئیرادەی ئازاد) یەکەکانی نەتەوەیی و فەرهەنگی ناوچە جیاوازەکان، (قبووڵ کردنی راستی) فرەنەتەوەیی و پێویستی لە نێو بردنی جیاوازی لە رادەبەدەری کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەم ناوچانە پێکەوە هەڵوێست بگرن. هەر بۆیە دەبێ بەدوای مودێلێك لە سیستەمی سیاسی بگەرێن کە وەڵامی ئەم پێوستییانە بداتەوە.

مۆدێلی فیدرالیزمی پێکەوە لکێندراو (ئەو جۆرە کە ئەڵمان هەیە) ئەستەمە بتوانێ ئەرکێکی ئەوتۆ بەڕێوە بەرێ. ڕێگاچارە، دابەزاندنی سیستەمی فیدراڵیستی نێوان دەوڵەتییە کە سەرەڕای دابینکردن و دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەیی و سیاسی

ناوچەکان و نەتەوەکان خـاوەنی پێکهاتەیەکـە لـە کۆنفیـدرالیزم (کەنـەدا، سویـسرا، بەلجیکا، ئەمریکا، ئوستورالیا) (سەرنج بدەنە شولتسە ١٩٩٠).

**********

لـە پێکهـاتنی سیـستەم فیدراڵییەکانـدا بـەردەوام ئـەو دوولایەنـەی کـە پێـشتر ئاماژەمان پێکرد رۆڵیان گێڕاوە. لە ٨ وڵاتی پیشەسازی رۆژئاوا کە بەشێوەی فیدراڵیٚ بەڕێوە دەچن ٣ وڵات (ئەمریکا، کەنەدا و ئوسـتڕالیا) لـە ئاکـامی پرۆسـەی خـەبات لەگەڵ کۆلۆنیالیزم پێکهاتوون. بەپێچەوانەی گۆڕانکارییەکانی پاش جـەنگی دووەمـی جیهـانی لـە ئـەفریقیا و ئاسـیا، لـە وڵاتـانی نـاوبراو یەکیەتییـە فیدراڵیـستییەکان لەسەربنەمای ویستی کۆچـبەرانی سـپی پێـست بەمەبەسـتی پێکهێنـانی بـازاڕێکی لێکگرێدراوی نێوخۆیی و پەرەپێدانی سەرزەوی و ئابووری و لەهـەمان کاتـدا گرەنتـی دابەشکردنی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی حکوومەت لەناوچەکان دامەزراوە.

مەبەستی کەنەدییەکان لە پێکهێنـانی دەوڵـەت لـە سـاڵی ١٨٦٨ ئەمـە بـووە کـە دەیانویست سنوورەکانیان لەگەڵ ئەمریکا دیاریبکـەن و ببنـە خـاوەنی میکانیزمێـك بـۆ پارێزگاری لە خۆیان لە بەرانبەر ئـەم وڵاتـەدا. لـەم وڵاتـەدا ئـەم بۆچـوونە لـە روانگـەی سیاسەتی ئەمنیەتی و لەڕووی ئۆرگانییەوە زاڵبوو کە فیدرالیزمی کەنەدایی ئاڵترناتیڤێکە لـە بەرانبـەر دیموکراسـی بنـەڕەتی و راسـتەوخۆی ئـەمریکایی و لەبەرانبـەر دەسـەڵاتی دەوڵەتەکانی هەرێمی لە فیدرالیزمی جۆری ئەمریکایی، بەتایبەت ئـەوەی کـە پاراسـتنی سیستەمی دوو رەگەزی بەریتانیایی- فەرەنسی، کەنەداییەکانیشی دڵ خۆشدەکرد.

گرنگترین هۆکاری پێکهاتنی فیدرالیزم لە سویـسرا(١٨٤٨) ئۆتۆنـۆمی کـانتۆن و ناوچـەکان، جۆراوجـۆری فەرهـەنگی، ئینتگراسـیۆنی ئـابووری و پێداویـستی ئەمنیەتییەکان بوو.

دابەشکردنی فەرهەنگی لەنێوان فلامییەکان و ڤالۆنەکان لە بـەلجیکا دەگەڕێتـەوە بۆ فیدراڵیزەکردنی سیستەمی سیاسی ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٨٠.

************

# باسێك لەسەر فیدرالیزم؟

## -٢-

**هیدایەت سوڵتان زادە**

### پێشەکی:

تەواوی سیستمە سیاسییەکان کە مرۆڤ لە کاتێکی دیاریکراو لە زەمەندا بیری لێدەکاتەوە بتەوێ و نەتەوێ رەنگدانەوەی چوارچێوەی مێژوویەکی تایبەتییە کە تێدا دەژی. لەم رووەوە هیچ سیستمێکی سیاسی نییە بە جۆرێك هەڵگری ژیاننامەی سەردەمی خۆی نەبوو بێ و لە هەمان کاتدا، پلەیەك لە گشتگیری مێژوویی و جیهانگەرانی (vnirersalism) لەودا نەبێ.

لە دونیایی ئەمرۆدا، بیرۆکەی فیدرالیزم، رۆڵێکی تایبەتی لە تیۆری سیاسی بۆ پەیوەندی دانانی ئاشتخوازانەی جۆراوجۆری نەتەوەیی، فەرهەنگی، زمانی و مەزهەبی لە جیهان، بە بوونی دەوڵەتی کارا و لە هەمانکاتدا یەکپارچەنەك کۆجێی، دەگیرێ.

بیرۆکەی دەوڵەت-نەتەوە و پاشان رێکخراوی سیاسی کە دوای شۆڕشی فەڕەنسا لە ئەوروپا و پاشان لە شوێنەکانی دیکەی جیهان شکڵی گرت، ئێستا لە دوو لاوە کەوتووەتە بەر فشاری جیدییەوە، یەکەم، پرۆسەی ئابووری جیهانی و بە جیهانی بوونی ئابووری، هێزە ئابووری و سیاسییەکانی دوور لە ناوەند لە رێگای جێهانێکی یان نەتەوەیی و دامەزراوە یان نەتەوەییەکان وەك تێکەڵبوونی ناوچەیی ئابوورییە نەتەوەییەکان (یەکێتی ئەروپا، نەوت) بانکی جیهانی، سندووقی نێونەتەوەیی دراو، رێکخراوی بازرگانی جیهانی، رێککەوتننامە جۆراوجۆرە نێونەتەوەییەکان و هتد...، بە هێزکردووە. ئەم فشارە، چ لەسەر دەوڵەتە نەتەوە گەورەکان و چ لەسەر دەوڵەتە-نەتەوە بچووکەکان، دیارە کە بەیەك ئەندازە، کاریگەرە.



دووەم، فشاری ناوچەی بۆ سەر دەوڵەت-نەتەوەکان بە مەبەستی سەر لە نوێ پێناسەکردنی ناسنامەی نەتەوەیی و دیاریکردنی مافی چارەنووس بۆ ئەو دەستە لە نەتەوەکان کە لە ئاکامی دەسەڵاتی سیاسی، فەرهەنگی و ئابووری نەتەوەیەك بەسەر ئەواندا، مافی سیاسی و فەرهەنگی ئەوان لەبەرچاو ناگیرێ. ئێرانیش ئەم دوو فشارەی لەسەرە، بەتایبەت ستەمی نەتەوەیی راستەوخۆی ناوەند بۆ سەر نەتەوەکانی غەیری فارس، رێژەی فشارەی بردووەتە سەرەوە.

دەسەڵاتی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەکانی دیکە، لە نێو سیاسەتمەداران و بیردرای گشتی و بەشی زۆری رووناکبیران بە جۆرێك جێی خۆی کردووەتەوە کە ئەوان وەك دیاردییەکی ئاسایی چاوی لێدەکەن، دەڵێی ئەگەر بێجێگە لەمە بێ شتێکی سەیرە. تەنانەت زۆربەی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە دیموکرات یان پارێزەری مافی مرۆڤ دەزانن، ئاسۆی زەینی ئەوان بۆ دیتنی ئەم بێدادییە دەبەسترێ.

ئەمرۆ ناتوانین وڵاتێکی فرەنەتەوە ببینینەوە کە دەوڵەت-نەتەوە لەودا لە ژێر کاریگەری سیاسی و فەرهەنگی نەتەوەیەکی دیاردا نەبێ و نابەرانبەری ئابووری، سیاسی و فەرهەنگی لە نێوان نەتەوەکانی دیکە، یان شێوازێك لە ئاپارتایدی پێك نەهێنابێ و بە کردەوە ئەوانی کردووەتە هاووڵاتی پلە دوو. ئەم دەسەڵاتە پێش هەموو شتێك، خۆی لە رێگای میکانیزمی حاکمیەتی سیاسی و دەسەڵاتی بەسەر دەزگا سیاسییەکاندا نیشاندەدا، کەوا بوو لە درێژخایەندا، لە رێگای پێکهێنانی کەلێنێکی جیددی لە نێوان نەتەوەیەك کە بە ناو ئەوەوە قسەدەکا و نەتەوەکانی دیکە بەکردەوە دەسەڵاتی ئابووری و کۆمەلایەتی ئەو نەتەوەیە هەموار دەکەن، تەنانەت ئەگەر بەشی زۆری ئەو نەتەوەیە، لەم پرۆسەیە تێکەڵ یان لە رووی سیاسییەوە لەگەڵ دەسەلات نەبن.

ئاکامی بەکردەوەی ئەو ئەم راسییەیە کە دەسەڵاتی سیاسی حاکمیەتێکی دیاریکراو، کە لە پێناو بەرژەوەندی نەتەوەیەکی دیاریکراو بێ بەشکردنی نەتەوەکانی دیکە هەنگاو دەنێ، دەسەڵاتی چینایەتی هەمان نەتەوە بەسەر نەتەوەکانی دیکە

دابینده‌کا و سته‌می نه‌ته‌وایه‌تی ده‌بێته سته‌می چینایه‌تی، بابێ له‌م قسه‌یه خێرا به‌م ئاکامه بگه‌ین که هه‌موو نه‌ته‌وه‌یه‌ك که به‌ناو ئه‌وه‌وه قسه‌ده‌کرێ، بوونه‌ته سه‌رمایه‌دار و نه‌ته‌وه‌کانی دیکه به کرێکار، به‌ڵکو پرۆسه‌یه‌که که به‌شی گرنیگی نه‌ته‌وه‌کانی بێ ده‌سه‌ڵات ده‌خاته په‌راوێزی ئابووری و کۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه، پرۆسه‌یه‌کی ئه‌وتۆ، ده‌رنگ یان زوو ده‌بێته دینامیێکی ته‌قینه‌وه له نێو خۆی نه‌ته‌وه‌کاندا.

ئه‌وه‌ی که له دونیای سه‌رمایه‌داری، له نێوان ولاته پێشکه‌وتوو ولاته په‌راوێزاوه‌کان، یان به‌ناو جیهانی سێیه‌م که‌لێنێکی گه‌وره‌ی پێکهێناوه و جه‌مسه‌ری هه‌ژاری و سه‌ره‌وه‌ت له نێوان ئه‌و دوو و له کۆتاییدا ده‌سه‌ڵاتی ئابووری و سیاسی و ته‌کنه‌لۆژیا و فه‌رهه‌نگی ناوه‌ند به‌سه‌ر ولاتانی ده‌وروبه‌ر و فرێدرانی زۆربه‌یان بۆ په‌راوێزی شارستانییه‌ت دابینده‌کا، وه‌گه‌ڕخستنی سه‌رمایه و په‌ره‌پێدانی پیشه‌سازی و ئابووری له ناوه‌ند و پێکهاتنی سه‌رچاوه‌ی په‌ره‌پێدانی ولاتانی په‌راوێزخراو به پشت به‌ستن به گوشارگه‌لی جۆراوجۆری مالی، سیاسی، ته‌کنۆلۆژیا و هێندێك جاریش به‌کارهێنانی راسته‌وخۆی توندوتژییه. پرۆسه‌یه‌کی ویکچووش هه‌ر ئه‌مڕۆ ولاته‌که‌مان له ئارادایه و به‌توندوتیژییه‌کی سیاسی راسته‌وخۆ، دژی نه‌ته‌وه غه‌یره فارسه‌کان به‌کارده‌برێ. ئه‌مه به‌و مانایه نییه که هه‌موو نه‌ته‌وه‌ی فارس به‌شێوه‌ی یه‌کسان که‌ڵك له‌م سیاسه‌ته‌ی کۆماری وه‌رده‌گرن و یان هه‌موویان پشتیوانی له‌م سیاسه‌تانه ده‌که‌ن، که‌وابوو ناتوانین حاشا له‌و بکه‌ین که له هاوسه‌نگی گشتیدا، مه‌سه‌له‌که به قازانجی ئه‌وان ده‌گۆڕێ و ژماره‌ی زاغه‌نیشینه‌کان له نێو نه‌ته‌وه‌یی بێده‌سه‌ڵاته‌کاندا به‌شێوه‌ی سه‌رسورهێنه‌ر روو له زیاد بوونه و به‌کرده‌وه ئه‌وانیان کردووه‌ته هێزی کاری هه‌رزان بۆ خۆیان، هه‌ر بۆیه سته‌می نه‌ته‌وه‌یی له ئێران له‌گه‌ڵ سته‌می چینایه‌تی له یه‌ك ئاستدان. لێکۆڵینه‌وه‌ی به‌ربلاوتری ئه‌م پرۆسه‌یه پێویستی به نووسراوه‌ی سه‌ربه‌خۆ هه‌یه که له ده‌ره‌وه‌ی بابه‌تی سه‌ره‌کی ئه‌م نووسراوه‌یه.

بیرۆکه‌ی فیدرالیزم، بێ ئه‌وه‌ی که چاره‌سه‌ری کێشه‌یه‌ك بۆ هه‌موو کێشه سیاسی و ئابوورییه‌کان و هه‌موو نه‌خۆشییه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کان بێ، هه‌وڵدانێکه بۆ چاره‌سه‌ری



ئاشتیخوازانه‌ی جیاوازییه نه‌ته‌وه‌ییه‌کان له نێو خۆی ولات و نزیك کردنی ئه‌وان به‌یه‌کتر بۆ دۆزینه‌وه‌ی رێگا چاره‌یه‌کی له‌بار به مه‌به‌ستی گۆڕینی پێکهاته سیاسییه‌کانی حکوومه‌تی، هاوسانکردنی جیاوازییه ئابوورییه‌کان له نێو نه‌ته‌وه‌کان و پێشکه‌شکردنی وه‌لامێکی دیموکراسی بۆ ئه‌وان، بێ ئه‌وه‌ی که شیرازه‌ی کاروباری ولات تێك بچێ.

## باسێکی ساده له فیدراڵیزم

ده‌توانین سیستمه سیاسییه‌کانی جیهان له شێوازێك له پولێنبه‌ندی واته له جۆری دابه‌شکردنی ده‌سه‌لاتی سیاسی له نێوخۆی ولاتدا به حکوومه‌ته کۆجێی و ناکۆجێییه‌کان دابه‌شبکه‌ین.

له حکوومه‌تێکی کۆجێی، حکوومه‌تی ناوه‌ندی، ته‌نیا ده‌سه‌لاتی بریارده‌ر بۆ سه‌رتاسه‌ری ولات که زنجیره‌یه‌ك له دامه‌زراوه‌کانی ناوه‌ند له‌خۆ ده‌گرێ که‌خاوه‌نی ده‌سه‌لاتی سیاسی و یاسایین.

حکوومه‌تێکی کۆجێی ره‌نگه شێوازگه‌لی جۆراوجۆری ناکۆجێی له نێو خۆی ولاتدا وه‌ك ناکۆجێی ئیداری یان خودموختار(حوکمی زاتی)ی ناوچه‌یی یان ناوچه فه‌رهه‌نگییه خودموختاره‌کان به‌کاردێنێ، به‌لام هه‌موو ئه‌وانه له کۆتاییدا، باسێکی به‌رێوه‌به‌ری حکوومه‌تی ناوه‌ندین، ئه‌م جۆره له ناکۆجێی به‌کرده‌وه له مێژووی زۆربه‌ی ئیمپراتۆره‌کان دابووه و ئه‌م جۆره له ناکۆجێی نابێ وه‌ك سیستمی فیدراڵ چاوی لێبکه‌ین، چونکه بوونی ئه‌م جۆره له دامه‌زراوه ناکۆجێییه‌کان، به‌شێکه له حکوومه‌تی ناوه‌ندی و هه‌موو کاتێك ده‌وڵه‌تی ناوه‌ندی ده‌توانێ هه‌ڵوه‌شێنێته‌وه یان به ته‌واوی پێکهاته‌که‌ی بگۆڕێ.

به پێچه‌وانه‌ی سیسته‌مه کۆجێییه‌کان، سیستمێکی فیدراڵ وه‌ك فۆرمێك له حکوومه‌ته ناکۆجێییه‌کان، ده‌رخه‌ری جۆرێك سیستمی سیاسییه که له‌ودا ده‌سه‌لاتی سیاسی به‌شکڵی ستوونی، له نێوان حکوومه‌تی ناوه‌ندی و ئۆرگانه‌کانی ژێر چاودێری دابه‌شده‌بێ. ده‌توانین تایبه‌تمه‌ندی سه‌ره‌کی فیدرالیزم به‌م جۆره پێناسه‌بکه‌ین، سیستمی

سیاسی داخوازانە لەسەر بناغەی خود- حکومەتی (self-rule) و حکومەت- هاوبەشی (shared-rule) دەستەواژەی سیاسی فیدرالیزم لە وشەی لاتینی foedus واتە پەیمان و بەڵێنی وەرگیراوە کە تیایدا دوولایەن بەشێوەی یەکسان، پەیمانی بەشداربوون لەسەر بنەمای بەڵێنی لە نێوان خۆیاندا دەبەستن کە بەپێی ئەم بەڵێنە (corenart)، سەرەڕای پاراستنی ناسنامە و تاکەکەسی خۆی، کۆمەڵێکی نوێی دیکە، وەك بنەماڵە، دامەزراوە سیاسییەکان و هتد... پێکدێنێ کە خاوەنی ناسنامەی سەربەخۆیی خۆیەتی.

چەمکی بەڵێنی هەروەها بەم مانایەیە کە دوو لایەنی پەیمان و بەڵێن، نە تەنیا لەسەر خاڵە یاساییەکان خۆیان، بەڵکو لە رووی ئەخلاقییەوە پابەندبن بە رۆحی پەیمان و بەڵێنی خۆیان.

کەوابوو رێککەوتننامەی بەڵێندراو، شتێك بانترە لە رێککەوتننامەی سادە. چونکە پەیوەندی سەقامگیر و تەنانەت هەتاهەتایی دوو لایەن دەستەبەر و بەڵێنی هاوکاری بۆ سەقامگیرکردن و گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەم پەیمانە و چارەسەری ئاشتی خوازانەی ململانێکان دەکا.

کەوابوو، فیدرالیزم هەم بەمانای پێکهاتەیەك و هەم شێوازی حکومەتییە کە یەکێتی و یەکپارچەیی لەسەر بنەمای لێکحالێبوون و رەزامەندی دامەزراوە و لە هەمانکاتدا لە رێگای یاسای بنەڕەتییەوە، ئەم جۆراوجۆرییە سیاسییە دەپارێزێ.

بەپێی ئەم پێناسەیە، فیدرالیزم فۆرمێکە لە رێکخراوی سیاسی دەولەت کە لەسەر بنەمای دەسەڵاتی دوو لایەنی ناوەند و هەرێمەکان، یان بە واتایەکی دیکە لەسەر ئاستە جیاوازەکانی دابەشکردنی دەسەڵات بەشێوەی ستوونی (چ بەشێوازی جوگرافیای یان پارێزگایی، چ لەسەر بنەمای هێڵی نەتەوەیی- قەومی یان تێکەڵێك لە جوگرافیای و نەتەوەیی- قەومی) دامەزراوەکە لەودا هەریەك لەم دوو ئاستەی دەسەڵات، چوارچێوەی دیاریکراوی خۆی هەیە و لە هەرێمی رێگەپێدراوی خۆیدا مافی بەکارهێنانی دەسەڵاتی سەربەخۆیی هەیە و هیچ یەك لەم دوو مافی دەستدرێژی بۆ چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەوی دیکە نییە.



رێژەی دەسەڵات و چوارچێوەی دەسەڵاتی ناوەند و هەرێمەکان، یان شێوازی بەشداری ئورگانەکان بەستراوە بەوانەوە لە بڕیارەکانی دەسەڵاتی ناوەندیدا، لە دالێك بۆ دالێکی دیکە جیاوازە. هەموو ئەوانە لە خالێکی سەرەکیدا یەك دەگرنەوە کە دەتوانێ وەك عەیار پێوی دیاریکردن بوونی سیستەمی فیدرالی لێکبدرێتەوە کە بریتییە لە: دەسەڵاتی دوو لایەنە (dual-sovereignty) لە نێوان حکوومەتی ناوەندی (یان فیدراڵ) و هەرێمەکان (یان ئۆرگانەکانی بەستراوە بەوان). ئەم دوو لایەنە لە دەسەڵات، مافی بەرانبەریشیان هەیە. بەمجۆرە کە هەم هەرێمەکان، سەرەڕای ئەوەی کە لە چوارچێوەی دیاریکراوی دەسەڵاتی خۆیدا، هێز بەکاردێنێ کە پێی دەڵێن خود- حکوومەتی یان self-rule، لە بەڕێوەبردنی حکوومەتی ناوەندیش بەشداریدەکا کە بە حکوومەتی هاوبەش یان shared-rule ناسراوە.

رێژە شێوازی بەشداری ئۆرگانەکانی خوارەوەتر لە حکوومەتی ناوەندیش لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە، بۆ وێنە لە وڵاتێکی وەك بەلجیکا، هەرێمەکان هەم لە یاسادانانی ناوەندی (لە رێگای پەرلەمانی سەنا) و هەم لە کابینەی وەزیرەکان بەرێژەی یەکسان بەشداریدەکەن، ئەمە بێجگە لە بەشداری هەموو هاوڵاتیان لە رێگای پارلمان لە یاسادانانی وڵاتە.

لە ئەمریکا، هەرێمەکان یان ئۆرگانەکانی خوارەوەتر، رۆڵیان لە دیاریکردنی راستەوخۆی کابینەی وەزیرەکاندا نییە. لە بەرانبەردا، بەشداری ئۆرگانەکانی خوارەوەتر لە حکوومەتی ناوەندی، حکوومەتی فیدرالیش لە هەرێمەکان، لە تەواوی حکوومەتە فیدرالییەکاندا، خاوەن مافێکی دیاریکراون.

ئەم دابەشکردنەی نێوخۆیی دەسەڵات (dual sovereignty) یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی سیاسی فیدرالە. خالی جێگای سەرنج ئەوەیە کە، دەسەڵاتی دوو لایەنە نابێ لەگەڵ دابەشکردنی دەسەڵات (separation of power) تێکەڵ بکەین.

لە هەموو دیموکراسییە پارلمانییەکاندا، دابەشکردنی دەسەڵات هەیە و مەرجی پێویستی حکوومەتی فیدراڵە، بەڵام هەموو حکوومەتە پارلمانییەکان، پێویست ناکا

فیدرال بن، بەڵکو بۆ دەستەبەرکردنی پێویستی دابەشکردنی ستوونی دەسەڵاتی دوو لایەنە لە نێو خۆی وڵاتدا هەیە.

زۆرجار لە دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات، چەند دەسەڵاتی سەرەکی کە پێویستی بە هەماهەنگی هاوبەش هەیە وەك بەرگری، سیاسەتی دەرەوە، مافی بڵاوکردنەوەی دراو و سیاسەتە گشتییەکانی پەیوەندیدار بە ئابووری وڵات و کۆنترۆڵی کۆچبەری لە چوارچێوەی دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندیدایە و دەسەڵاتەکانی دیکەی پەیوەندیدار بە گوێرەی وڵات لە ئەستۆی هەرێمەکاندایە.

هەر لەم چوارچێوەیەدا، جۆر و رێژەی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی ناوەندی و هەرێمەکانی جیاوازە، بۆ وێنە لە یاسایی بنەڕەتییەکاندا، چوارچێوەی دەسەڵاتی هەرێمەکان، دەستنیشان کراوە و باقی دەسەڵاتەکان بۆ دەوڵەتی ناوەندی دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەمریکا دروست بە پێچەوانەوەیی. یان لە سوێسرا یاسای بنەڕەتی وڵات، دەوڵەتی فیدرال، مافی بوونی سوپای لە کاتی ئاشتیدانییە مەگەر ئەوەی کە هەرێمەکان قبووڵیان کرد بێ. دیاردەیەکی دەگمەن سەیری بکرێ و وێنەی دووەم لەم پەیوەندییەدا نییە.

شایانی باشە کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، تەنانەت لە سەردەمی ئیمپراتۆرییە گەورەکانی چاخی کۆندا، وەك ئیمپراتۆری رۆم هەتا ئیمپراتۆرییەکانی سەردەمی سەرمایەداری کە بەسەر بەشێکی زۆر لە جیهان حکوومەتیان دەکرد، بەردەوام دیاریکرانی دەسەڵات بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆیان گۆڕانی بەسەرداهات، لەبەر ئەم هۆیەش ئەندێشەی سیاسی چۆنیەتی لێکگرێدانی ئەم ناوچە پرش و بڵاوانە لە جیهان لە ژێر چەترێکی حکوومەتیدا، یەکێك لە سەرقالییە فیکرییەکانی دەسەڵاتداران بووە.

هێندێك جاریش، یەکگرتنی جۆراوجۆر، بۆ مەبەستێکی دیاریکراو لە مێژوودا شکڵی گرتووە، بەڵام ئەم یەکگرتنانە پاش هاتنەدەی ئامانجی یەکگرتن، وەك بەرگری دوو لایەن لە بەرابنەر پەلاماری دەرەکی بۆ قۆناغێکی کورت بووە. دەتوانین ئاماژە بە



یەکگرتنی دەوڵەت شارەکانی یۆنان لە سەردەمی کۆن یان یەکگرتنی شارەکانی ئیتالیا لە سەدەی نیوەراست بکەین.

یەکەمین یەکگرتنی مۆدێرن بە تایبەتمەندی، تارادەیەك سەقامگیر، سەرەتا لە سویسرا لە سەدەی ١٣ بەم لاوە و پاشان لە هۆڵەندا (the united provinces) شکڵی گرت.

لەگەڵ ئەمانەشدا، یەکگرتنی ئەوان سست و دەسەڵاتەکانی ناوەندیش (لاواز بوون. کەوابوو ناتوانین هیچ یەك لەم یەکگرتننامە لە مێژوودا، یا هیچ یەك لە ئیمپراتۆرییە گەورەکانی جهان کە خاوەنی پلەگەلێك لە ناکۆجێیی و دابینکردنی دەسەڵات بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی حکوومەت بوون، لە چەمکی ئەمڕۆیی خۆیدا، پێی بڵێین سیستمێکی سیاسی فیدرال.

چەمکی دەسەڵاتی دوولایەن (dual sovereignty) کە پەیوەندییەکی دوولایەن و یەکتر بڕ لە نێوان هەرێمەکان (یان دەوڵەتی ناوچەی) و دەوڵەتی ناوەندی (دەوڵەتی فیدرال) پێکدێنێ، لە لایەن دامەزرێنەرانی ئەمریکاوە داهێنرا کە وەرسووڕانی بنەڕەتی لە داڕشتنی بناغەکانی سیستمێکی سیاسی فیدرال بە پێناسەگەلی روون، بە پەسەندی یاسای بنەڕەتی ئەمریکا لە ١٧٨٩، پێکهێنا، کە یەکەمین وێنەی مێژووی سیستمێکی سیاسی فیدرال لە چەمکی ئەمڕۆیی خۆیدابوو.

سێزدە هەرێم کە دوای شەڕی سەربەخۆیی، هەرێمەکانی کۆنفیدرالییان پێکهێنابوو، پەیوەندییەکی لاوازیان پێکەوە هەبوو و خاوەن دەسەڵاتێکی ناوەندی نەبوون. هەر بۆیە، وێکچوونی زۆری لەگەڵ یەکگرتنەکانی پێشوو لە مێژوودا هەبوو.

یاسای بنەڕەتی ١٧٨٩، مودێلێکی نوێی لە دەوڵەت دامەزراند و ئەم هەرێمانەی لە فۆڕمی سیاسی کۆنفیدرال کردە دەسەڵاتی سیاسی فیدرال لەگەڵ دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و حکوومەتی ناوەندی کارا. لەم مودێلە سیاسییە نوێیەدا، هەرێمەکان نە تەنیا خاوەنی هێز و چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆیانن، بەڵکو لە ئۆرگانە ناوەندییەکانیشدا بەشدارن. لە بەرانبەردا، حکوومەتی فیدرالیش،

سەرەڕای رۆڵی خۆی، لە لقە سەرەکییە هاوبەشەکان بۆ هەموو هەرێمەکان، لە چوارچێوەییەکی دیاریکراودا.

مافی بەکارهێنانی دەسەڵات لە هەرێمەکانی لە ئەستۆ دەگرێ، لەبەر ئەم هۆیە، هیچ یەك لە نموونەکانی پێشتری مێژوو، لەوانە کۆنفیدراسیۆنی نێو ئینگلەند لە ١٩٤٣ کە لە لایەن ئیمپراتۆری بەریتانیا، پێش شەڕی سەربەخۆیی، بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتە داگیرکراوەکان پێکهاتبووە، ناتوانین سیستمی فیدرالی پێ بڵێین هەرچەندە کە بۆ خۆی وەك مودیلێك بۆ کۆنفیدراسیۆنی باکووری ئەمریکا لە ١٧٧٤ بەکارهاتووە.

ساڵێك پێش شۆڕشی ئەمریکا خەڵکی ئەمریکا، خاوەن دەسەڵاتی زۆر بوون بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی خۆیان و لە رێگای پارلمانی ناوچەی خۆیان، زۆربەی کاروباری پەیوەندیدار بە خۆیان وەك باج، بازرگانی و دادگاکان رادەپەڕاند. لە هەندێك بواردا دەسەڵاتی ئەوان تەنانەت لە کاروباری ناوچەیی خۆیان زیاتر بوو.

لە دابەشکردنی جوگرافیای دەسەڵاتی سیاسی لە نێو حکوومەتی فیدرال کە هەموو وڵات لە ژێر دەسەڵاتیدایە، ئۆرگانەکانی خوارەوەتر کە هەرکامەیان بە تەنیا لە ناوچەیەکی دیاریکراو لە هەرێمی خۆیدا دەسەڵاتی هەیە، کۆی ئەوانە سەر زەوی یان جوگرافیای سیاسی دەوڵەتێکی دیاریکراوی پێکدێنن، رەنگە ئۆرگانەکانی بچووکتر لە نێو هەر هەرێمێکدا پێکبێ، بۆ وێنە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێکهاتووە لە دەوڵەتێکی فیدرال یان دەوڵەتی گشتی ئەمریکا (government general) و پەنجا هەرێم (state). بەڵام هەرێمەکانی بۆ خۆیان لە ئەو هەزار حکوومەتی خودموختار وەك کانتییەکان (county)، شارەوانییەکان و ناوچە قوتابخانەییەکان (school districts) پێکهاتوون.

پۆلێن بەندییەکانی نێو هەرێمەکان، لە بنەڕەتدا بەشێوەی دەوڵەتی کۆجێیەکان هەتا فیدرال، کەوابوو دەبێ پێکهاتەی سیاسی دەوڵەتی ئەمریکا وەك پەنجا دەوڵەتی کۆجێیی سەیر بکرێ کە لە نێو دەوڵەتێکی فیدراڵدا هەڵکەوتووە.

دابەشکردنی جوگرافیای دەسەڵات لە نێوانیان، کەوابوودەبێ پێکهاتەی سیاسی دەوڵەتی ئەمریکا وەك پەنجا دەوڵەتی کۆجێیی سەیر بکرێ کە لە نێو دەوڵەتێکی فیدرال داهەڵکەوتووە.



دابەشکردنی جوگرافیای دەسەڵات لە نێوان دەوڵەتی فیدرال و هەرێمەکان، راشکاوانە لە یاسای بنەڕەتدا گونجێندراوە و چوارچێوەی هێز و رێژەی دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرال و هەرێمەکان دیاریکراوە. بەڵام، رێژەی دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرال و هەرێمەکان لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی دیکە جیاواز لە هەموو وڵاتە فیدرالەکان وەك یەك نییە.

لەگەڵ ئەمانەشدا، تایبەتمەندییەکی دیکە وڵاتانی فیدرال و غەیرە فیدرال لە یەك جیا دەکاتەوە: لە وڵاتێکی فیدرالدا، هەم کۆجێیی و هەم جیابوونەوە رەت دەکرێتەوە.

هێندێك جاریش سیستمە فیدرالییەکان وەك یەکگرتنی تێکنەشکێندراوییەکە تێك نەشکێندراوەکان پێناسەدەکەن.

لە دونیای ئەمڕۆدا، بەشێوەی فەرمی بێت وڵاتی فیدرال هەیە کە نزیك بە نیوەی حەشیمەتی جیهان پێکدێنێ، بەڵام هەشت لە سەدی وڵاتەکان، بە جۆرێك کەڵك لە میکانیزمەکانی فیدرال وەردەگرن، بێ ئەوەی کە بەشێوەی رەسمی فیدرال بن. بۆ وێنە، بەریتانیای گەورە، بە فەرمی وڵاتێکی فیدرال نییە، بەڵام ناوچە گەلێك وەك سکۆتلەند یان ویلز وتاراِدەیەك ئایرلەندای باکوور، خاوەنی پارلمانی ناوچەیی خۆیانن، هەروەها خاوەنی دەسەڵاتی جێگای سەرنجن.

لە دروستبوونی حکوومەتە فیدرالەکان دەتوانین دوو پرس دەستنیشان بکەین: یەکەم، بە کۆبوونەوەی دەوڵەتەکان یان ناوچە سیاسە سەربەخۆکان (together coming) پێناسەیەکی نوێی چ بەشێوازی فیدرال و چ بەشێوازی کۆنفیدرال، پێکدێنێ.

دووەم: دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی لە نێو دەوڵەتە کۆجێیەکان، بەشێوازی نوێی فیدرال (holding together).

لە رووی مێژووییەوە، شێوازی یەکەم، واتە کۆبوونەوەی ناوچە سەربەخۆ سیاسییەکان لە فۆرمێکی کۆنفیدرال و پاشان بەشکڵی فیدرال، یەکەمین ئەزموونە مێژووییەکان بووە. کۆنفیدرالی سویسرا، ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هولەندا، کۆنفیدراسیۆنی هەرێمەکانی باکووری ئەمریکا، هەروەها یەکێتی ئەورووپا لە بارودۆخی ئێستادا، نموونەگەلێکن لە کۆبوونەوەی هەرێمەکان و ناوچەکان لە

پێکهێنانی سیستمێکی فیدرال و کونفیدرال. لە وڵاتگەڵێك وەك برازیل، بەلجیکا، ئەرژەنتین و هیند و چەند وڵاتێکی دیکە، دەتوانین وەك چەند نموونەیەك ناو بەرین کە لە ڕێگای ناکۆجێی کردنی حکوومەتە کۆجێیەکانی خۆیان، دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات و پێکهێنانی دەسەڵاتی دوولایەنەی خود-حکوومەتی و حکوومەت-هاوبەشی، لە پێناوی سیستمێکی فیدرال هەنگاویان ناوە کە پرۆسەی فیدرالیزم کە ڕەنگە لە وڵاتەکەماندا جێگیر بێ، پێویستە مۆدێلی دووەم کەڵك وەربگرێ.

سیستمێکی فیدرال لەوانەیە لەسەر بنەمایەکی یەکگرتوو و هاوکێشی ئۆرگانەکانی خوارەوەتر دامەزرابێ، کە پێی دەڵێن (symmetric federalism) و ئۆرگانەکانی خوارەوەتر لە پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی فیدرال خود-حکوومەتی و سەربەخۆیی بەرانبەر لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەن، یان لە ئۆرگانەکانی خوارەوەتر کە نایەکگرتوون (asymmetric federalism) پێکدێ.

چەمکی فیدرالیزمی نایەکگرتوو بەم مانایەیە کە لە ئاستی دەوڵەتی فیدرال، ئۆرگانەکانی خوارەوەتر بە پلەی جیاواز سوود لە خود-حکوومەتی و سەربەخۆیی چ بەشێوەی ڕواڵەتی وەردەگرێ. بۆ وێنە، لە ئیسپانیا بە ناوچەکانی ناودار (navara) و باسك زیاتر لە ناوچە خود موختارەکانی دیکە دەسەڵات و بەکارهێنانی مالیاتیان بۆ دابینکردوون، یان بە هەرێمەکانی کاتالونی و گالیسیا، سەبارەت بە فەرهەنگ و زمان و پەروەردەکردن، دەسەڵاتێکی تایبەتیان لێدراوە. بەم شێوازەش، لەو کاتەدا، هەرێمی کیبیك (Qubec) بۆ پاراستن و بەرەوپێش بردنی فەرهەنگی زمانی فەرەنسی، خاوەنی دەسەڵاتی تایبەتن لە ئەڵمانیا فیدرال، سێ شاری بەرلین، بیرمەن و هامبورگ وەك دەوڵەت- شار lander چاولێ دەکرێ، بەڵام شارەکانی دیکە شوێنکەوتووی سێزدە ناوچەن lander. یان بۆ وێنە لە چین بە بەندەری هونك گونگ، ڕەوشی سیاسی و یاسایی تایبەتی دابینکراوە.

فورمە یەکگرتووەکانی فیدرالیزم، بەم مانایە نییە کە هەموو ناوچە و هەرێمەکان دەبێ وەك یەك بن، بەڵکو پلەی ناکۆجێی بوون لە ئاستی فیدرالدا،



سەبارەت بە هەرێم یان ناوچە، بۆیە یەکگرتوو چاولێدەکرێ کە یاسا و بنەماگەلی وێکچوو لەودا بەکارهاتووە تەنانەت ئەگەر حەشیمەتی گەورەتر یان ناوچەیەکی گەورەتر لە خۆبگرێ.

## جیاوازی نێوان ناکۆجێ بوون و سیستمی فیدراڵ

هەر سیستمێکی فیدراڵ دەبێ لەسەر بنەمای ناکۆجێی دامەزرێ، بەڵام هەر جۆرە ناکۆجێ بوونێك بە مانای سیستمی فیدراڵ نییە. جیاوازی بنەڕەتی نێوان سیستمی فیدراڵ و سیاسەتی ناکۆجێی لەهەر شێوازێك دابێ، دەبێ لە بوونی دەسەڵاتی دوولایەنە لە حکوومەتی فیدراڵ کە بۆ خۆی لە بنەڕەتدا هاوڕێیە لەگەڵ ناکۆجێی و نەبوونی لە ناکۆجێی ئیداری و یان تەنانەت لە خودموختاریدا بگەڕێین. ئەمڕۆ، زۆربەی وڵاتەکان، چ پێشکەوتوو و چ لە حاڵی پەرەسەندن، چەندین شێوازی جۆراوجۆر لە سیاسەتی ناکۆجێی دەگرنەبەر و هەرکام بە لەبەرچاوگرتنی چەندین هۆکار بەڕێوەدەچن.

سیاسەتی ناکۆجێ بوون، ئەگەرچی شێوازێکی نوێ نییە و دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کەڵکیان لێوەرگرتووە، بەڵام لە دوو دەیەی ڕابردوو، زۆرتر پەرەی سەندووە، لە ساڵەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠، وڵاتانی کۆلۆنیالیزم، بەشێکی بەرچاو لە دەسەڵاتی خۆیان بە وڵاتە داگیرکراوەکان ئەسپارد سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا سەربەخۆیی تەواویان پێنەدابوون. لە دەیەی ١٩٨٠، زۆرتر پەیوەندی بە پەرەئەستاندنی مرۆڤی و پێویستی یەکسان کردنی شێوازە حکوومەتییەکان لەگەڵ ئەودا بوو. لە حاڵی حازردا، سیاسەتی ناکۆجێی لە هەواڵێکدا خاوەنی ڕێوشوێنی تایبەتی خۆیەتی، وڵاتە پێشکەوتووەکان بە هۆی پێشکەشکردنی هەرزانترین و کاراترین خزمەتگوزاری ئەو ڕەوتە پێشەوە دەبەن و لە وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا بە هۆی پێشگیری لە ناکارامەیی و ناسەقامگیری ئابووری و وڵاتە کۆمۆنیستەکانی پێشووش لە ناکۆجێی بوون وەك ئامرازێك بۆ بەسەرمایەکردنی پێکهاتەی ئابووری خۆیان و هەنگاوی

به پەلە هاویشتن بەرەو ئابووری بازاڕ بەکاردەهێنن. ناکۆجێی ڕێکخراوی ئیداریش بۆ بەڕێوەبردنی دەزگای بیرۆکراسی وڵات، شێوازێکە کە زۆر لە مێژە لە زۆربەی وڵاتەکانی بەڕێوەچووە. لە ئەمریکای لاتین ناکۆجێی فشارێکە بۆ دیموکراتیزەکردنی زۆرتر و لە کیشوەری ئەفریقیا، ناکۆجێی ئامرازێکە بۆ پاراستنی یەکێتی نەتەوەیی، لە ئاکامدا، حکوومەتەکان، رەنگە بە لەبەرچاوگرتنی هێندێك هۆکاری جیاواز و لە ئاستی جیاوازدا، سیاسەتی ناکۆجێی بەرەو پێشەوەبەرن.

کەوابوو هیچ یەك لەو مافە ناتوانێ وەك شێوازێکی فیدراڵ چاوی لێبکرێ، چونکە نەبوونی میکانیزمی فیدراڵ، بە مانای مافی دەسەڵاتی دوو لایەنەیە.

## جیاوازی نێوان سیستمی فیدراڵ و کۆنفدراڵ

سیستمی فیدراڵ و کۆنفدراڵ، هەردوو لە چەمکی حکوومەتە ناکۆجێیەکانە، دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات لە سیستەمە فیدراڵییەکان و ڕێژەی دەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵ و ئۆرگانەکانی خوارەوەتر دەبێتە چەند خاڵێك لە یاسای بنەڕەتی وڵات و دەرەکانی گۆڕینی تەنیا بە پەسەندی پەرلەمانی ناوچەی هەرێمەکان دەتوانێ بەڕێوەبچێ. بە واتایەکی دیکە، هەر جۆرە گۆڕانکارییەك لە هاوسەنگی نێوان حکوومەتی فیدراڵ و هەرێمەکان، تەنیا بە رەزامەندی دوولایەن بەڕێوەدەچێ و پەیوەندی یەك لایەنەییە و حکوومەتی ناوەندی ناتوانێ بەپێی ئیرادەی خۆی، گۆڕانکاری لە دەسەڵاتی حکوومەتە ناوچەییەکان پێکبێنێ. گۆڕانکارییە لاوەکییەکان لە ڕێگای تەفسیری بنەڕەتی و لە ڕێگای دادگای بەرزی فیدراڵ کە دەسەڵاتی پێداچوونەوەی بە کێشەی نێوان هەرێمەکان، هەروەها هەریەك لە هەرێمەکان لەگەڵ دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر شانە، بەڕێوەدەچێ، بەڵام بۆ گۆڕانکاری لە یاسای بنەڕەتیدا، هێندێکجار پێویستی بە پێداگری سێ چوارەمی پەرلەمانی هەرێمەکان هەیە.

بە پێچەوانەی حکوومەتی فیدراڵ، سیستمی کۆنفدراڵ، بەپێی ڕێککەوتن بۆ ئامانجگەلێکی دیاریکراوی پێکدێ و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری ناوەندی تەنیا لە



نوێنەرانی ئۆرگانەکانی خوارەوەتر پێکدێ. بە پێچەوانەی دەوڵەتی فیدراڵ، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و حکوومەتی ناوەندی لاوازی هەیە.

لە سیستمی کۆنفیدرالدا، یەکەم، ئۆرگانەکانی خوارەوەتر رەنگە ناسنامەی یاسایی بە تەواوی سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن. دووەم، ناوەند تەنیا دەتوانێ ئەو دەسەڵاتە بەکاربێنی کە هەرێمەکان بۆی دیاریکردوون. واتە دەسەڵاتی ئەوان بەشێکە لە دەسەڵاتی هەرێمەکان.

سێیەم، ئۆرگانەکانی خوارەوەتر لە زۆربەی مەسەلەکاندا، دەتوانن بڕیارەکانی ناوەند ڤیتۆ بکەن.

چوارەم، بڕیارەکانی ناوەند تەنیا دەتوانێ ئۆرگانەکانی خوارەوەتر بگرێتەوە نەك هاوڵاتیانی هەرێمەکانی کۆنفیدراڵ. بۆ وێنە زۆربەی بڕیارەکانی یەکێتی ئەورووپا ڕاستەوخۆ نابێتە بەشێك لە پێکهاتەی یاسای دەوڵەتەکانی ئەندام و پێویستی بە پەسەندی پەرلمانی دەوڵەتەکانی ئەندام هەیە هەتا رەسمیەتی پەیدا بکا و ماف یان بەڵێنی یاسای بۆ ئەوان پێکدێنێ.

پێنجەم: ناوەندی خاوەنی سەرچاوەی ماڵی یان پێگەی هەڵبژاردنی سەربەخۆ نییە.

شەشەم: ئۆرگانەکانی خوارەوەتر، دەسەڵاتی بۆ هەمیشە ناسپێرن بە ناوەند و سەرئەنجام ئەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە هەر کات لەم یەکێتییە بێنە دەرەوە، بەڵام مافی جیابوونەوە لە سیستمی فیدرالیدا مافێکی یەك لایەنە نییە.

دەتوانین لە کۆنفیدراسیۆنی سویسرا لە ماوەی ۱۲۹۱ هەتا ۱۸٤۷، کۆنفیدراسیۆنی هەرێمەکانی باکووری ئەمریکا لە ۱۷۷٦ هەتا ۱۷۸۷ و هەروەها یەکێتی ئەورووپا لە حالی حازر وەك نموونەگەلی مێژوویی ناو بەرین. بەم جیاوازییە کە یەکێتی ئەورووپای ئێستا ناسنامەیەکی دوورەگەیە لە نێوان فیدرالی و کۆنفیدرالی و دەوڵەتی سویسرا سەرەرای پاراستنی ناوی کلاسیکی کۆنفیدراسیۆنی خۆی، حکوومەتی بە تەواوی فیدرالییە.

## جیاوازی حوکمی زاتی (autonomy) لەگەڵ فیدرالّیزم

چەمکی خودموختاری چەندین پێناسەی جیاوازی هەیە و زورتر بەکارهێنانی دەسەلاّتی خۆی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا لە خۆدەگرێ. لە رووی دابەشکردن یان بلاّوکردنەوەی دەسەلاّتی سیاسی، خودموختاری بە مانای سیاسەتی ناکۆجێیە، بەلاّم لە زۆربەی بوارەکاندا، خاوەنی دەسەلاّت و مافی پاوانکردنی یاساداڕێژی و بەڕێوەبەریی کاروباری ناوچەیی و هەندێك جاریش خاوەنی مافی قەزایی لە چوارچێوەی گشتی یاسای بنەڕەتییە.

لێرەدا دەبێ لە نێوان (خودموختاری ئیداری) کە زۆرتر شێوازێکە لە ناکۆجێیی لە رێکخستنی ولاّتدا و (خودموختاری سیاسی) بە مانای راگواستنی مافی یاسادانان بە یەکەیەکی سەر زەوی لە چوارچیوەیەکی دیاریکراو، هەروەها (خود موختاری فەرهەنگی) جیاوازی دەبینین. خود موختاری فەرهەنگی جیاوازە لە خودموختاری سیاسی. خود حکوومەتی فەرهەنگی، زۆرتر بۆ گرووپە زمانی، مەزهەبییەکان، یان لە رووی ئەتنیکی جیاواز بەکاردەبرێ هەتا گرووپە کۆمەلاّیەتییەکان کە تەنیا بەپێی بەستراوەی بەسەر زەوی پێناسەدەکرێ و چوارچێوەی بەڕێوەبەری ئەوان پەروەردە، فەرهەنگ و زمانی کەمایەتی و کاروباری مەزهەبی و ئاسایش لەخۆدەگرێ. دامەزراوە خودموختارەکانیش تەنیا لەو چوارچێوە دیاریکراوانەدا دەتوانن دەسەلاّتیان بەکاربێنن نە زیاتر.

پانتایی خودموختاری سیاسی، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد بەربلاّوترە و پلە و ئاستی دەسەلاّتی دابینکردنی رەنگە لە هێندێك بواردا جیاواز بێ. دەسەلاّتی خود موختاری ناوچەیی، زۆرتر بوارەکانی پەروەردە، فەرهەنگ، زمان، ژینگە، دارشتنی گەلاّلەی ناوچەیی بۆ سەرچاوە سروشتییەکان، پەرەپێدانی ئابووری، کاروباری ئیداری ناوچە، شوێنی نیشتەجێبوون، تەندروستی و کاروبارەکانی دیکەی کۆمەلاّیەتی لەخۆدەگرێ.

دەولّەتی ناوەندیش کاروباری پەیوەندیدار بە بەرگریی، سیاسەتی دەرەوە، سیاسەتی بەربلاّوی ئابووری، سیستمی دراوی و ئاسایش لە ئەستۆ دەگرێ. لەم پەیوەندییەدا



دەتوانین لە خودموختاری دورگەکانی ئالان (Aland Ilands) هەلّکەوتوو لە دەریای بالتیك کە لە ژێر دەسەلاّتی دەولّەتی فەنلاند دایە، بەلاّم بە زمانی سویدی قسە دەکەن، سکۆتلەندا، گرین لەند، پورتریکو، ناوچەی پترول و ئالتوئایدیجە لە باکووری ئیتالیا کە ئەلّمانی زمانن، وەك نموونەگەلێك لە خودموختاری سیاسی ناوبەرین.

جیاوازی بنەڕەتی هەمووی ئەمانە لەگەلّ سیستمی فیدرال لەمەدایە کە دەولّەتی ناوەندی مافی گۆرانکاریی یان دانی دەسەلاّتە دابینکراوەکانی هەیە، بەلاّم ئەم مافە یەك لایەنانە لە حکوومەتی فیدرالدا لەبەرچاوناگرێ.

دووەم: نەبوونی دەسەلاّتی دوو لایەنە و بەشداری دوولایەنە لە بەڕێوەبردنی حکوومەتی ناوەندیدا.

## فیدرالّیزم وەك رێگا چارەیەکی گونجاوتری سیاسی

بیرۆکەی دەسەلاّتی کۆجێی سیاسی لە ولاّتێکدا، ئیتر بابەتی مێژووی خۆی لە دەستداوە. یەکێك لە لایەنە گرنگیەکانی سیستمی فیدرالی ئەمەیە کە بوونی چەندین مەسەلەی جیاواز لە ولاّتدا هەروەها بوونی دامەزراوە جۆراوجۆرەکان بووە وەلاّمدانەوەیان قبوولّدەکا. بەشێك لەوانە لە ئاستی ناوچەییدا کاریگەرە و بەشێکی دیکەیان لە ئاستێکی بەربلاّوتردا. پێکهاتەی سیاسی دەسەلاّت، دەبێ رەنگدانەوەی ئەم ئاستە جیاواز نەبێ.

هێز و دەسەلاّتی پێراگەیشتن بەم مەسەلانە، تا ئەو جێگایە دەکرێ، دەبێ راگوێزری بۆ ئاستەکانی خوارەوە و لە سەرەوە هەتا ئەو جێگایە پێویستە کۆبکرێتەوە.

لایەنی دیکەی جێگای پەسەند لە سیستمی فیدرالّدا، پەیوەندی راستەوخۆی دەسەلاّتی سیاسی لەهەر ئاستێکدا لەگەلّ هاولاّتیان دایە. لەم رووەوە، دیموکراسی زیاتر لەبەر چاودەگیرێ.

کاریگەری یاساکانی دەولّەتی فیدرالّ، نە تەنیا هەرێمە پێکهێنەرەکانی بەلّکو راستەوخۆ هەموو هاوولاّتیان دەگرێتەوە.

له سیستمێکی فیدراڵدا، دەسەڵاتی سیاسی ئەگەرچی بڵاودەبێ -کراوە-، بەڵام دەسەڵاتێکی بە تەواوی هاوئاهەنگە و ئەم هاوئاهەنگییە، یەکریزی نێوخۆی و دەسەڵاتی راستەقینەی زیاتر بە دەوڵەت دەدا و لە ئالۆزییە نێوخۆییەکان کەمدەکاتەوە. کەوابوو، دەوڵەتێکی فیدراڵ، سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندییەکی نێوخۆی رێکوپێکتری لەگەڵ پێکهاتەکانی خۆی هەیە، بۆ خۆی ئامرازێکە بۆ پاراستنی پلورالیزم و پارێزگاری لە مافی تاکەکەس لە بەرانبەر دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندیدا.

راگواستنی دەسەڵاتی بڕیاردانی بۆ هەرێم و ناوچەکان دەبێتەهۆی ئەوەی کە ئەو مافی بڕیاردانە لە بیرۆکراتە ناوەندنشینەکان وەربگیرێتەوە کە لە هێندێك بواردا کاریگەری لەسەر ژیانی خەڵکی هەرێمەکان هەیە و بدرێتەوە بە خەڵکی هەرێم و ناوچەکان.

دابەشکردنی ستوونی دەسەڵاتی سیاسی، نە تەنیا ژیانێکی ئاشتیخوازانە بۆ هەموو هاوڵاتیان پێکدێنێ بەڵکو دەرفەتێك دەرەخسێنێ کە زۆربەی ئەو مشتومڕانەی کە لە نێوان هەرێمەکان و دەوڵەتی ناوەندی یان لە نێوان نەتەوەکان سەرهەڵدەدەن، بە کەڵك وەرگرتن لە میکانیزمە سیاسییەکانی هاوئاهەنگ کردنی سیستمی فیدراڵ، لە رێگای دیالۆگ و ئامرازی یاسای لەبار چارەسەر بکرێن. ئەزموونی ئەورووپا دوای دوو جەنگی مالوێرانکەر کە لەودا نەتەوەکانی پێشوازییان لە سیستمی کۆنفدراڵ و فیدرالکرد، شایەتێکی زیندووی ئەم باسەیە.

حکوومەتی فیدراڵ سەرەڕای دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی بە شێوازی ستوونی، هەم لە دەوڵەتی ناوەندی و هەم ناسنامە و هەرێمەکان کە پێکهاتەکانیەتی، پشتوانی دەکا و بە هەریەك لەوانە دەسەڵاتی پێویست بۆ چارەسەکردنی کێشەی وڵات لە رێگا هاوئاهەنگی لەگەڵ یەکتر دەبەخشێ و پەیوەندی هاووڵاتیان بە ناوەندەکانی بڕیاردان نزیکتر دەکاتەوە، کەوابوو دەتوانین بە سیستمێکی فیدرال کە بە راستیی دیموکراسی بێ بڵێین کۆماری کۆمارەکان.

# فیدراڵیزم و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان

ئەگەر مرۆڤەکان فریشتە بوونایە، ئەوا بوونی حکوومەت پێویست نەبوو. ئەگەر بهاتبایە و فریشتەکان بەسەر مرۆڤەکان حکوومەتیان کردبایە، کۆنترۆڵی نێوخۆیی و کۆنترۆڵی دەرەکی بۆ حکوومەت پێویست نەبوو.

James Madison.

Federalist ژمارە ٥١

جۆری پەیوەندی نێوخۆیی مەکینەی حکوومەتی، هەروەها شێوەی پەیوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵگادا، هەموو کاتێك پرسیارێکی گەورەبووە لە بەرانبەر ئەندێشەی مرۆڤایەتیدا. تارمایی چەقگیری دەسەڵات لە دەست دامەزراوەیەك، کەسێك، یان توێژێکی کۆمەڵایەتی هەمیشە سێبەرێکی ترسی دەرخستووە.

بە درێژایی مێژوو، حکوومەتەکان، کە بەرواڵەت دەبێ پارێزگاری لە مافەکانی خەڵك و تاکەکەس بکەن، تووشی زۆرترین هەڵەبوون بەرانبەر بە مافەکانی خەڵك. پەیامی ناوەوە لە بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات ئەمەیە کە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی کەسێك یان گرووپێك بۆ هاوڵاتییان، جێگای مەترسییە و دابەشکردنی دەسەڵات دەتوانێ پێش بە روودانی ئەم مەترسییە بگرێ.

لەوەی کە دەوڵەت، فراوانترین و چەقگیرترین دامەزراوەیە و لە هەمان کاتدا گەورەترین دەسەڵاتی رێکخراوی زاڵە لە کۆمەڵگادا، پێویستی کۆنترۆڵ کردنی ئەو لەلایەن هاوڵاتییانەوە، پلەیەکی دیاریکراو لە جۆری ئاسایش لە بەرانبەر ئەم دەستدرێژییە دەرەخسێنێ. تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات چاودێرە بەسەر بەشێك لەم کۆنترۆڵە دیمۆکراتیکەی کۆمەڵگا لەسەر ئەم دامەزراوە بە دەسەڵاتە. شێوەی



بەکارهێنانی ئەم کۆنترۆڵە، هەروەها چوارچێوەی گشتی تیۆری، هیچ کات یەکسان نەبوو، وەك چالاکی خودی کۆمەڵگا لە رەوتی مێژوودا، رانەوەستاوە و پێویست بووە، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی، هەروەها ئەندێشەی زاڵ لە کۆمەڵگادا نیشانبدا.

ئەگەرچی دەوڵەت، دامەزراوەیەك یان چەمکێکی سیاسی و زەمینییە و چاودێرە بەسەر ژیانی مرۆڤەکان، بەڵام باسکردنی سەرچاوەی دەسەڵات و هەڵگرانی ئەم دەسەڵاتە زەمینییە، هێندێك جار لە خەرمانەیەك لە ئایدیۆلۆژیا ناروونەکان دادەپۆشرێ. ئەم ئایدیۆلۆژیایە، رەنگە چەندین جۆری جیاوازی هەبێ و هەرچی سیستمێکی سیاسی بەرەو چەوسانەوە و دیکتاتۆری بڕوا، هەوڵدان بۆ بە ئایدۆلۆژی کردنی دەوڵەت و دوورکەوتنەوە لە کۆنترۆڵی هاوڵاتییان و کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵات لە دەستی کەسێك، یان دامەزراوەیەك پەرەدەسێنێ. لە ئاکامدا، ئەگەری دەسدرێژی ئەم دەوڵەتە بۆ سەر مافی هاوڵاتییان دەچێتە سەرەوە.

بە پێچەوانەی کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری، دەوڵەتی مۆدێرینی سەرمایەداری، یەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ناوەندگەرایی بوو. تەواوی ئیمپراتۆرەکانی گەورەی مێژوو، بەهۆی پرش و بڵاوی جوغرافیایی و نەبوونی هەلی پێوەندی، لەبەراوردا، دوڵەتگەلێکی ناوەندگەرا نەبوون. ئالکسی دو توکویل (Alexis de Tocqueville)، بە کۆمەڵگای نوێی سەرمایەداری دەڵێ کۆمەڵگایەکی بچووککراو(ئەتۆمیزە) لە بەرامبەر دەسەڵاتی ناوەندگەرادا و دەنووسێ کە بە پێچەوانەی کۆمەڵگاکانی پێشوو کە لەواندا، بوونی زنجیرەیەك پلەی کۆمەڵایەتی، کەلەورا هەر کەسێك رۆڵی دیارکراوی هەیە و دەبێتە هۆی دابەشبوونی دەسەڵاتی سیاسی ، دیموکراسی لە کۆمەڵگای نوێدا لەلایەك ئەم زنجیرە لە پلەوپایە و نەبوونی ناوەندگەرایی لە نێو دەبا و لە لایەکی دیکەوە، کۆمەڵگایەکی تەم و مژاوی لە کەسانی ئەتومێزە (La Societe en Poussiere) لە بەرانبەر ئەم ناوەندگەراییدا پێکدێنێ.

خوان دونوسو کورتس (Juan Donoso cortes) باوکی فیکری فرانکیسمی ئیسپانیا و یەکێك لەو کەسانەی کە کاریگەری گرنگی لەسەر ئایدۆلۆگە یاساییەکان لە ئەڵمانی نازی داناوە وەك کارڵ ئیشمیت، رەنگە بەراشکاوییەکی زۆرترەوە فشار بخەنە سەر سروشتی ناوەندگەرایی دەوڵەتی نوێی سەرمایەداری و بە پێچەوانەی دوتوکویل کە بیری لە پێویستی کۆنترۆڵ و دابەشکردنی دەسەڵات دەکردەوە، دونوسوکورتس، بەم ئاکامە دەگا، پێویستی دیکتاتۆری لەم دەسەڵاتە کە لە ناوەندا کۆبووتەوە. ناوبراو دەنووسێ کە پەرلەمان لە بەریتانیا، هێزێکی دیکتاتۆرە و دەسەڵاتێکی بەرفراوانی هەیە، ئەمە ئەو شتەیە کە کۆڵەکەی دیکتاتۆری پێکدێنێ.

"پەرلەمانی بەریتانیا" بێجگە لەوەی کە ژن بکا بە پیاو و یان پیاو بکا بە ژن، دەتوانێت هەموو شتێك بکا[٢]. هەر بۆیە، دونوسو کورتس ، لە لێکدانەوەی دروستبوونی دەسەڵاتی ناوەندگەرا لە کۆمەڵگای نوێی سەرمایەداریدا، هەرچەند بەیەك ئەنگیزە و چەند دەرئەنجامی جیاوازبوو، رێگەیەکی هەڵەی نەگرتبووە پێش. ناوبراو لە وتاری بەناوبانگی خۆی لە بەرامەر ئەندامانی پەرلەمانی ئیسپانیا لە ١٨٤٨وتی:

"برایان! دەمەوێ سەرنجی ئێوە بۆ خاڵێك راکێشم! لە دونیای کۆندا، سەرەرۆیی، بێ بەزەیی و وێرانکەربوو. لەگەڵ ئەمانەشدا، چوارچێوەیەکی بەرتەسکی بوو، چونکە دەوڵەتەکان بچووك بوون و پەیوەندی نێونەتەوەیی لە نێوان دەوڵەتەکاندا نەبووە. بەو ئاکامە دەگەین لە سەردەمی کۆندا، حکوومەتە سەرەرۆکان لە ئاستێکی بەربڵاودا، بێجگە لە رۆم، نەیانتوانیوە پێکبێن. بەڵام ئێستا برایان، بارودۆخ گۆڕاوە. بوار بۆ سەرەرۆیی و دیکتاتۆری رەها، گەورە و جیهانی رەخساوە. لەبەرامبەر دیکتاتۆرێکی ئەوتۆدا، نە خۆراگری فیزیکی هەیە و نە خوراگری رۆحی و ئەخلاقی. خوراگری فیزیکی نییە، چونکە تێلێگرافی ئەلێکتریکی، مەوداکانی لەنێوبردووە. خۆراگری رۆحی و ئەخلاقی لەنێوچووە، چونکە رۆح و گیانی مرۆڤەکان لە یەك جیاو لەت لەت بووە. برایان! بەگەیشتنی سەدەی شازدەهەم بە ریفۆرمی گەورەی لوتر، کە ریسوایی گەورەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەزهەبی بە دوواوە بوو، رزگاری سیاسی و ئەخلاقی



هاوکات بوو لەگەڵاّ هەڵکشانی دامەزراوەکانی خوارەوە: سیستمی پاشایەتی دەرەبەگایەتی بووە سیستمی پاشایەتی رەها. برایان! پێتان وایە سیستمی پاشایەتی دەتوانێ شتێك بێ بێجگە لە حکوومەتێکی رەها، رۆژ بە رۆژ سەرکوتی سیاسی لە حاڵی بەرزبوونەوەدایە. چ دامەزراوەیەکیان دروستکردووە؟.. لەشکری هەمیشەیی.

برایان! دەزانن لەشکری هەمیشەیی یانی چی؟ بۆ زانینی ئەو، ناسینی مانای سەرباز بەسە! سەرباز یانی کوێلەیەك لە بەرگی یۆنیفۆرمدا !.. بۆ حکوومەتەکان پێویست نەبوو کە رەها بن. ئەوان خوازیاری حکوومەتێکی رەها و بوونی یەك ملیۆن سوپا بوون و ئەویشیان بەدەستهێنا. دواتر وتیان ئێمە یەك ملیۆن چەکمان دەوێ! دواتر وتیان ئەوەش بەس نییە، ئێمە شتێکی دیکەشمان دەوێ! ئێمە پێویستمان بەیەك ملیۆن چاو هەیە! ئەوان یەك ملیۆن پۆلیسیان پێکهێنا! یەك ملیۆن پۆلیس بە یەك ملیۆن چاوەوە!.. رۆژ بە رۆژ سەرکوتی سیاسی دەچووە سەروسەرتر.. بەڵام یەك ملیۆن چەك و یەك ملیۆن چاو بۆ حکوومەت بەس نەبوو! ئەوان دەیانویست یەك ملیۆن گوێشیان هەبێ! هەر بۆیە، داوای دەزگایەکی ئیداری ناوەندگەرایان کرد!.. رۆژ بە رۆژ سەرکوت هەرچی زیاتر پەرەی دەستاند، بەڵام حکوومەتەکان وتیان کە یەك ملیۆن چەك و یەك ملیۆن چاو و یەك ملیۆن گوێ، بۆ ئەرکی سەرکوت بەس نییە! شتی زۆرترمان دەوێ! دەمانەوێ لە هەموو شوێنێکدا بین! تێلێگرافیان هەڵبژارد. ئەمەیە بارۆدۆخی ئەوروپا!"[٣]

رۆیشتن بەرەو ناوەندگەرایی لە دەوڵەتە مودێرنەکاندا، ئەگەر لەگەڵ دابەشکردنی گونجاوی دەسەڵات لە نێوخۆی دەزگای حکوومەتی و لەڕووی جوغرافیاییەوە هاوسەنگ نەکرێ، ئەگەر بوونی ئازادییە سیاسییەکان و ئازادیی حیزبەکان، ئەم چاودێرییە بەسەر دابەشکردنی دەسەڵات، گرەنتی نەکا، هەلی کۆبوونەوەی دەسەڵات، لە دەستی دامەزراوەیەك، یان گرووپێك، یان کەسێك، لەژێر هەر ناو و بیانوویەك، دەبێتە راستییەك. ئەزموونی حکوومەتە دیکتاتۆر و تۆتالیتارەکان لە سەدەی هاوچەرخدا، مۆری پشتیوانی لە حوکمی کلاسیکی لۆرد ئاکتۆن (Lord acton) دەدەن کە: هێز دەکوژێ، و هێزی رەها بەشێوەی رەها دەکوژێ[٤].

## پێناسەی ساکاری دابەشکردنی دەسەڵات

بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات، لە پێناسەیەکی گشتیدا، دامەزراوە حکوومەتییەکان بەسەر سێ لقی دەسەڵات بەڕێوبەری، یاسادانان و قەزایی دابەش دەکا. بەپێی ئەم دابەشکردنە، بناغەی یاسادانان، یاسا دادەڕێژی، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، یاسای دارێژراو جێ بەجێ دەکا و دەزگای قەزایی، یاسا داڕێژراوەکان بەپێی بارودۆخ تەفسیر دەکا و بنەمای گشتیی یاساکان لەگەڵ بارودۆخێکی دیارکراودا، بەراوەرد دەکا.

دەسەڵاتی تەرخانکراو بۆ هەریەك لەم سێ لقە حکوومەتییە، لەلایەن کەسانێك جیا لە یەکتر بەڕێوەدەچێ و هیچ یەك لەم دامەزراوانە دەسەڵاتی تەواویان نییە، بەڵکو هەرسێکیان بەستراون بەیەکتر. هەروەها لە نێوخۆی هەریەك لەم سێ دەزگا دابەشکراوە لە یەکتر، جارێکی دیکەش دەسەڵاتەکان دابەشکراون هەتا هەرچی زیاتر پێش بە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەست کەسێك یان گرووپێکی دیارکراو بگیرێ کە نابێ دەست بخاتە کاروباری بواری دیکەوە. بەم شێوەیە بە پێچەوانەی ڕژێمەکانی پاشایەتی و حکوومەتە دیکتاتۆرەکان، کە تەواوی دەسەڵات لە دەست کەسێك کۆدەبێتەوە، دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوخۆی دەزگای حکوومەتیدا، ئەم ئامانجە دەگرێتەبەر کە پێش بە دروستبوونی دیکتاتۆری بگرێ. لەم جۆرە دابەشکردنەی دەسەڵاتدا،هەر سێ لقی حکوومەتی، یەکتر کۆنترۆڵ دەکەن و سەربەخۆیی هەر لقێك، پێش بە هەڵەی یەکێك لەوانە لە هەرێمی ئەوی دیکە و دەستێوەردان لە کاروباری یەکتر دەگرن.

بۆ گرەنتی ئەم شێوازە لە دەسەڵات، بوونی دەسەڵاتی یاسا، مەرجێکی بنەرەتییە. بە واتایەکی دیکە، دەسەڵاتی یاسا، رواڵەتێکی دیکە و وێنەی بوونی دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان لقەکانی حکوومەتێکە. دابەشکردنی رواڵەتی دامەزراوەکانی حکوومەتی بە سێ لق، بە تەنیایی ئاماژەیەك نییە بۆ بوونی ئەوان. بەبێ دەسەڵاتی یاسا، دابەشکردنی راستەقینەی دەسەڵاتیش بەڕێوە ناچێ. ئەوەی کە رووی راستەقینە



دەبەخشێتە دابەشکردنی دەسەڵات و هاتنە دی ئەم مەرجە بنەرەتییە یانێ دەسەڵاتی یاسا، بوونی پێکهاتەگەلێکی سەرتر و لە دەرەوەی دامەزراوە دەوڵەتییەکان و لە نێوخۆی کۆمەلگادایە کە لە خوارەوە ئاماژەی پێ دەکەم. بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات، وەك هەر تیورییەکی سیاسی و فەلسەفی دیکە کە ئەندێشەی مرۆڤایەتی بۆ پێکهاتەی نێوخۆیی دەوڵەت و شێوەی پەیوەندی دانی ئەو بە کۆمەڵگاوە، داهێناوە، بایەخی رێژەیی هەیە و نابێ بە شێوەی رەها مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. بەم مانایە کە دابەشکردنی دەسەڵات لە شێوازی گشتی خۆیدا مانا پەیدا دەکا و هەریەك لەم بەناو سێ دەزگایە، لە هێلە گشتییەکاندا لەیەك جیادەکرێنەوە و دەنا لە کردەوەدا، هەریەك لەم دەسەڵاتانە، تاڕادەیەك دەست دەخەنە نێوکاروباری یەکترەوە کە بە پێی تیورییەکە نابێ بکرێ. بۆ وێنە لە هەموو وڵاتەکاندا، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، هندێك جار ئەرکی یاسادانان دەگرێتە ئەستۆ کە لە روانگەی تیۆرییەوە، دەست تێوەردانە لە کاروباری یاسادانانداندا و یان پارلمانی هەر وڵاتێك چاودێری زۆربەی چالاکییەکانی دەرەوەی دەوڵەتی خۆی دەکا و بەشێك لە ئەرکی دیپلۆماسی نێونەتەوەیی دەخاتە سەرشان. بەم شێوەیە، رەنگە دادگا بەرزەکان ئەم یان ئەو پەسەندکراوی پەڕلەمان بە پێچەوانەی یاسای بنەرەتی بزانن و رەتی بکەنەوە. سەرەرای ئەمەش، تەواوی چالاکی ئەوان جیا لە یەکترن و بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات، چ لە دونیای کۆن، چ لە سەدەکانی ناوەڕاست و چ لە دونیای نوێدا، سەرباری ئەو هەوراز و نشێوانەی کە لە تیۆری و کردەوەیدا روویداوە، کاری پێکراوە. جۆری رەهای دابەشکردنی دەسەڵات، ئەو جۆرەی کە مۆنتسکیۆ وەك داڕشتنێکی تیۆری لە زەینی خۆیدا گەڵاڵەی کردبوو، تەنیا جارێك لە مێژوو و ئەویش لە یاسای بنەرەتی ماساچوست لە ١٧٨٠، پێش لە پەسەندی یاسای بنەڕەتی فیدراڵ و دامەزرانی دەوڵەتی فیدراڵی ئەمریکا، بووە.[٥]

بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات، دەبێ وەك یەکێك لە کۆڵەکەکانی پێکهاتنی دەوڵەتی مودێرن بزانین. لەم رووەوە، تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات، لە رێکخستنی پێکهاتەکانی دەوڵەتی مودێرن، هەمان رۆڵ دەگێڕێ کە دابەشکردنی دەسەڵاتی واتایی و زەمینی، لە پێکهاتنی گۆمەڵگای دەرەبەگایەتی خستبوویە ئەستۆ.[٦]

## سەرهەڵدانی تیۆریی

سەرچاوە و ئەندێشەی سەرەتایی دابەشکردنی دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ دونیای کۆن و بۆ نووسراوەکانی ئەرستۆ، ئەفلاتون، تاسیدیس(Thucydides)، سیسرۆ(Cicero)، بەتایبەتی مێژووی ((Histories پۆلی بیۆس (Polybius)ی یۆنانی. هەر بۆیە نێوەرۆکی دابەشکردنی دەسەڵات، تا کاتی شۆڕشی ئەمریکا، تەنانەت لە نووسەرانی سەردەمی روشنگەری، وەك مۆنتسکیۆ، بلاکستۆن(Blackstone) و جەیمز هرینگتۆن (James Harrington)، تەئکیدیان لەسەر جۆرێك حكومەتی تێکەڵاو لەژێر سەردێری (Mixed Government یا (Mixed Constitution، پێکهاتوو لە چینە کۆمەڵایەتی جیاوازەکان بووە. بەم مانایە کە چینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا، هەرکامەیان یەکێك لە سێ دەسەڵاتی دەوڵەتییان لە ئەستۆ بووە. لەراستییدا، تێگەیشتن لە دابەشکردنی دەسەڵات، لە تەواوی ئەم قۆناغەدا، چاودێری بەسەر بەشداری راستەوخۆی چینە کۆمەڵایەتییەکان لە حكومەت و ئەستۆگرتنی یەکێك لە سێ دەسەڵاتی حكومەتییە. لە شۆڕشی ئەمریکا بەم لاوە، ئەندێشەی دابەشکردنی دەسەڵات، بەرە بەرە لایەنی چینایەتی راستەوخۆی کە جێگای سەرنجی کلاسیکی یەکانی ئەم تیۆرییە بوو، لەدەستدا و سەرنجی دایە دابەشکردنی کارکردی نێو دەزگای حكومەتی.

ئەفلاتون پێ لەسەر جۆرێك هاوسەنگی لە پێکهاتەی حكومەتدا دادەگرێ. ناوبراو لە بەرهەمی خۆی بە ناوی"یاساکان" دەنووسێ:

- کلیناس: ئێستا سەبارەت بە هاوئاهەنگی و گەش بینی و ئازادی زیاتر باسبکە و شیبکەرەوە کە یاسادانەر چۆن دەتوانێ دابین بوونی ئەوانە بکاتە ئامانجی خۆی؟

ـ ئاتنی:.. دوو جۆر سیستەمی سیاسی هەیە کە دەتوانین پێی بڵێین سیستەمی سیاسی دایك. جۆرەکانی دیکە لە دایك بوونی ئەون. یەکێك حكومەتی پاشایەتییە، ئەوی دیکە حكومەتی دیموکراسی. نموونەی کاملی حكومەتی پاشایەتی دەتوانین لە ئێران ببینینەوە و کاملترین جۆری حكومەتی دیموکراسی لە وڵاتی ئێمە. هەموو



حكومەتەکانی دیکە، هەروەك ئاماژەمان کرد، لە تێکەڵاوی ئەو دووانە، بە شێوازگەلی دیکە پێکهاتن. بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگایەك ئازادی و هاوئاهەنگی لەگەڵ گەشبینی بێتە ئاراوە، حكومەتی ئەو کۆمەڵگایە ناچار دەبێ تایبەتمەندییەکانی ئەو دووە لەخۆیدا کۆبکاتەوە[٧]. لە ئاماژەیەك بەجۆرە حكومەتە دەڵێ:

حكومەتێك کە بەجۆرە هەڵبژێردرێ، لە نێوان دیکتاتۆری و دیموکراسیدا هەڵکەوتووە و حكومەتی چاك ئەو حكومەتەیە کە نێونجی نێوان ئەو دووە بێ.[٨]

ئەفلاتون، هەرجۆرە کۆکردنەوەی دەسەڵاتی لە دەرەوەی بازنەی هاوسەنگی دادەنێ کە دەبێتە هۆی گرژی و ئاڵۆزی لە سیستەمی حكومەتیدا: لە هەر شوێنێك هەنگاوێك لە بازنەی هاوسەنگی بەرەو سەرتر بنێین و دەسەلاتێکی لەڕادەبەدەر بە کەسێکی بچووك ببەخشین، هێمنی و هاوسەنگی تێکدەچێ... پێم وایە یەکێك لە خواکان جلەوی چارەنووسی ئێوەی بەدەستەوە گرت و نەیهێشت دەسەڵاتی پاشایەتی لە دەست شاریارێکدا بمێنێتەوە، بەڵکو ئەوی بە دوو شا سپارد و بەجۆرە دەسەڵاتی ئەوانی لە بازنەی هاوسەنگیدا بەرتەسك کردەوە. پاشان سروشتی مرۆڤایەتی کە هاوڕێیە لەگەڵ هێزی خودایی، مەترسییەك کە لە ئاوێتەبوونی دەسەلات لەگەڵ لە خۆبایی بوون لە دەسەڵاتدارانی پێشووی ئێوە سەرچاوەی دەگرت، وڵاتی دەخستە مەترسییەوە خوێندنەوە و ئەنجوومەنێك لە ٢٨ پیاوی بە تەمەن، پەیوەستی پۆستی پاشایەتی کردو لە بڕیارە گرنگەکاندا، بەو ئەنجوومەنە مافی دەنگی بەرامبەری لەگەڵ پاشاکان بەخشی .. پاش ئەو خوایەکی دیکە بە هانای ئێوەوە هات. بۆ ئەوەی هەوسارێکی دیکەیان بکاتەوە ئەو پاسەوانانەی یاساکە بە تیروپشك هەڵبژاردبوو، لە جێگای ئەوان دیاریکرد لە ئاکامدا، هەموو رێکخراوە دەوڵەتییەکان لە ئاڵۆگۆڕی و لە نێوچوون پارێزران[٩].

ئەرەستووش پاش خوێندنەوەی یاسای بنەرەتی ٥٨ دەوڵەت ــ شاری یۆنان، لە کتێبی"سیاسەت"ی خۆیدا ئاماژە بە ئەندێشەی حكومەتی تێکەڵاو و پێویستی دابەشکردنی دەسەڵات دەکا: "لە هەر یاسای بنەڕەتیدا سێ پێکهاتە هەیە کە هەر یاسادانەرێکی جیددی دەبێ ئەوانە لەبەرچاو بگرێ کە چ شتێك لەودا سوودمەندە.

ئەگەر ئەم سێ پێکهاتەیە بە دروستی دابرێژرێ، ئەوکات دەتوانین بلێین کە یاسای بنەڕەتی، یاسایەکی بنەڕەتی دەوڵەمەندە و جیاوازییەکان لە یاسای بنەڕەتیدا لەگەڵ جیاوازییەکانی هەریەك لەم سێ پێکهاتەیە بەرانبەرن. ئەم سێ پێکهاتەیە بریتیین لە: یەکەم پێکهاتەی راگۆڕینەوە[١٠] کە سەبارەت بە هەموو کاروبارەکانی پەیوەندیدار بە تێکرای خەڵك دەکەوێتە بەرباس. دووەم، دەسەڵاتدارانن، و پێکهاتەی سێیەم پەیوەندی بە پێکهاتەی دادوەرەوە هەیە".[١١]

هەر بۆیە، چ لە ئەزموونی زانستی دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنان و چ لە لێکۆڵینەوەکانی ئەرەستوو، ئەم سێ پێکهاتەیەی دەوڵەت، بە شێوەیەکی روون و دیار لەیەك جیانەکرابوونەوە. بەڵکو تێکەڵاوی و دەستێوەردانی ئەرکەکان لە نێوانیاندا هەبوو. پەرلەمان یان دامەزراوەیەکی یاسادانان، لەراستیدا هەم رۆڵی پەرلەمانی دەگێرا و هەم رۆڵی حکوومەت. بەم مانایە کە یاسادانان، تەنیا تایبەت بە داڕشتنی یاسا نەبوو، بەڵکو چاودێری دەسەڵاتی بەرێوەبەری دەکرد و لە حاڵەتی گرنگدا، نێوبژیوانی دەکرد. دەسەڵاتی بەرێوەبەریش لە زۆر دامەزراوەدا بڵاوبووەوە و ژمارەیەکی زۆر بە ئەرکی دیاریکراو و بەرتەسك لەودا بەشدارییان دەکرد. دەسەڵاتی قەزاییش لەچەمکی ئاساییی خۆیدا وەك دامەزراوەیەکی سەربەخۆ لە ئارادا نەبوو[١٢].

دیتنی خەباتی خێلەکی لە نێوان دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنانی کۆن، بیرمەندانێك وەك ئەرەستوو و تاسیدیدسی بەم ئاکامە گەیاند کە بە دانی بەشێك لە دەسەڵات بە زۆرینە و کەمینە، رەنگە بتوانین لە کۆمەڵگادا، سەقامگیری پێکبێنن. لەم پەیوەندییەدا، لەسەر دابەشکردنی ئەرکەکانی نێوان داڕێژەرانی یاسا، دەسەڵاتی بەرێوەبەری و قەزایی تەئکیدیان کردەوە.[١٣]

ئەندێشەی یاسای بنەڕەتی یان حکوومەتی تێکەڵاو، لە کۆماری رۆم و مافناسانی رۆحی، بەتایبەت سیسرۆ( Cicero)، رەنگدانەوەی راستەوخۆی بوو کە حکوومەتی تێکەڵاو بە باشترین جۆری حکوومەت بزانن.[١٤]



رەنگە بتوانین یاسای بنەرەتی رۆم لە رووی فۆرمی داڕشتنەوە، مۆدێلی سەرتایی بۆ یاسای بنەڕەتی ئەمریکا دابنێین. بەمجۆرە تیۆری حکوومەتی تێکەڵاو، بووە ئەندێشەی زاڵ لە کۆماری رۆم و پاشان لە قوناغی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا.

هەربۆیە، دەبێ پولی بیوس(Polybius)ی یۆنانی وەك دیارترین تیۆریسیەن و باوکی حکوومەتی تێکەڵاو و دابەشکردنی دەسەڵات بناسین. چونکە لە مۆنتسکیۆوە بگرە هەتا ویلیام بلاکتسۆن و دامەزرێنەرانی ئەمریکا وەك تۆماس جفرسۆن و جەیمز مادیسۆن، لانیکەم لە بەشێك لە بۆچوونەکانی خۆیان، کاریگەری جیددییان لە ناوبراو وەرگرت. کتێبی شەشەم لە مێژووەکان(Histories)ی ناوبراو بە وردی باسی حکوومەتی تێکەڵاو یان (Mixed constitution) دەکا کە دەگوترێ زۆرترین کاریگەری جیهانی کۆن لە جیهانی مودێرن دابووە.[١٥]

پولی بیوس بڕوای بە تیۆریی قوناغەکان بوو لە مێژوو و تێپەڕبوون لە یاسایەکی بنەڕەتی (یان حکوومەت) بۆ یاسای بنەڕەتی دیکە کە ئەفلاتون لە یەکەمین بیرمەندانی ئەو تیۆرییە بوو، و هاوسەنگ نەبوون لە سیستمێکی سیاسی بە هۆکاری سەرەکی دەزانی.

پۆلی بیوس دەنووسێ کە حکوومەتێکی میراتی، دەوڵەت لاواز دەکا. کاتێك لە تەختی پاشایەتی، پشتاوپشت، بەشێوەی میراتی رادەگوێزرێ، چی دیکە شاکان بەهۆی لێوەشاوەیی لە رێبەری کردن، هەڵنابژێردرێن، بەڵکو بەهۆی لەدایکبوونی بە هەڵکەوت لە بنەماڵەیەکی پاشایەتیدا، دەبێتە رێبەری وڵات. کاتێك شاکان بە هۆی ئیمتیازی لەدایکبوونی بە هەڵکەوت، لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشن، هۆگری یەکیان بۆ خزمەت بە دەوڵەت نامێنێ، بەڵکو دەبنە خزمەتکاری ئارەزووەکانی خۆیان. هەر بۆیە، نزیکترین کەس بە شا لە بازنەی سەرۆکەکان واتە ئەریستۆکراتەکان، کە گەندەڵی شا دەبینن، ئەو لەسەر کار لادەبەن. مندالانی ئەم کەسانەش، هەمان رێگا دەگرنە بەر. لە ئاکامدا ئەرەستۆکراسی لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی دیکە بەرەو ئۆلیگاریشی دەڕوا، وەك چۆن شاکان بەرەو دیکتاتۆری

ڕۆیشتن. ئەوکات خودی ئۆلیگارەکان لەلایەن خەڵکەوە دەکوژرێن، کە ئەمجار، بەرپرسیارەتی حکوومەت کردن بەسەر خۆدا (واتە دیموکراسی) دەگرنە ئەستۆ. لە سەرەتادا رەنگە کە خەڵك حکوومەتی دڵخواز دامەزرێنن، تا کاتێك لە مرۆڤی چەوساوە ، رۆژەکانی چەوسانەوەی لەبیرە، خەڵك بە چنگ و ددان پارێزگاری هەرێمی ئازادییەکانی خۆیان دەکەن. بەڵام بە تێپەربوونی چەندین نەوە، ئەو کەسانەی کەڵك لە دیموکراسی وەردەگرن، چونکە رەنجیان بۆ نەکێشاوە، رێزی لێناگرن. سەرئەنجام، کەسانێك دێنە مەیدان کە بۆ وەدەستهێنانی پێگەیەکی تاکەکەسی خۆیان، باسی خزمەت بە کۆمەڵانی خەڵك دەکا. بەو هیوایەی کە سەرنجی ئەوان بۆلای خۆی راکێشێ. خەڵکیش کە نرخیان بۆ ئازادی نەداوە، هەرزان فرۆشی دەکەن. کاتێك خەڵك ئەم فێڵبازانەی قەبوول کرد، قۆناغی دیکتاتۆری و سەرەرۆیی، جارێکی دیکە دووبارە دەبێتەوە.[١٦]

پولی بیوس پێی وابوو کە کۆماری رۆم، لەبەرئەوەی تووشی ئەم سوورانە بێ کۆتاییە نەهات کە توانی حکوومەتێکی تێکەڵاو پێکبێنێ. واتە دەوڵەتێك کە سێ پێکهاتەی گرنگی حکوومەتی لە خۆیدا کۆبکاتەوە. کۆنسوڵەکان (یان دەسەڵاتی بەرێوەبەری) لە باتی فاکتەری پاشایەتی، سەنا لەباتی فاکتەری ئەریستۆکراسی و دیموکراسی لەباتی فاکتەری کۆمەڵانی خەڵك کە وەك کۆمەڵگای خەڵکی و دادگای گەل، خۆی دەردەخا. لە حکوومەتی تێکەڵاودا، هەر سێ دەزگای حکوومەتی، خاڵی بەهێز و لاوازی یەکتر کۆنترۆڵ دەکەن........ هیچ یەك لەم سێ دامەزراوە، دەسەڵاتی رەهایان نییە، بەڵکو لەودا شەریکن، کاریگەری دەسەڵاتی گەندەڵ لەنێو دەچێ و جۆرێك هاوسەنگی پێکدێ.[١٧]

پولی بیوس وێنەی سەرەکی خۆی لە یاسای بنەڕەتی ئیسپارت وەرگرتبوو. بۆیە راڤەی پراگماتیکی ناوبراو لە مێژوو و پێشکەشکردنی مودێلێکی گشتگیر، رازی بەردەوامی و سەقامگیری دەروونی لە دەوڵەتی رۆم بوو. پرۆفیسۆر فۆن فریتز(Von Fritz) دەنووسێ کە ئەوەی پولی بیوس دەبینێ، ئەمە بوو کە ئیمپراتۆری رۆم، دیاردەیەکی مێژووییە و



دەسەڵات و گەورەیی ئەو، شتێکە پەیوەندی بە سیستمی نێوخۆیی ئەوەوە هەیە. ئەم سیستمە نێوخۆییە، بە جۆرێك پەیوەندی بە بیرمەندانی پێشووی یۆنانی و پێش هەموو شتێك، لەگەڵاً یاسای بنەڕەتی یان سیستمی سیاسی تێکەڵاوبوو.[١٨]

پولی بیوس بە لێکۆلینەوەی مودێلی سیاسی حکوومەتی تێکەڵاو لە ئیمپراتۆری رۆم و هێنانی پێکهاتەی هاوسەنگی و کۆنترۆڵی بەرانبەر (checks and balances) جۆرێك مودێلی گشتی مێژوویی دروستدەکا کە لە قۆناغەکانی دواییدا، لە نووسینەوەی تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات، چ لە مۆنتسکیو، چ لە ویلیام بلاکتسۆن، هەروەها لە دامەزرێنەرانی ئەمریکا، کاریگەری بەرچاوی هەبووە. دەڵێن جان ئادامز، چەندین وەرگێڕانی لە نووسراوەکانی پولی بیوس لەبەردەستدا بووە و لە نووسراوەی خۆی "لە بەرگری لە یاسای بنەڕەتی حکوومەتی ئەمریکا" بەجۆرێك، بیروبۆچوونەکانی پولی بیوس دووبارە بووەتەوە.[١٩]

هەروەها جەیمز مادیسۆن، لە وتارەکانی خۆی سەبارەت بە دابەشکردنی دەسەڵات، لە ژمارە ٦٣، (Fedrealist Papers) بە تەواوی ئاماژەی بە وتەکانی ناوبراو کردووە: "کۆبوونەوەی تەواوی دەسەڵاتەکانی یاسادانان، بەرێوەبەری و قەزایی لەدەستی تاکەکەسێك، چەند کەس، یان ژمارەیەکی زۆرتر، چ لە رێگای میراتەوە، چ خۆی هەڵبژێرێ و چ هەڵبژێردرێ، رەنگە بە دروستی هەمان پێناسەی وردی سەرەرۆیی بێ".[٢٠]

دەبێ وە بیری بێنینەوە کە چەمکگەلی "دابەشکردنی دەسەڵات" و"هاوسەنگی و کۆنترۆڵ"، گەرچی پێوەندییان پێکەوە هەیە، بەڵام وەك یەك نین، چونکە دابەشکردنی دەسەڵات، پشت بە کارکردە جیاوازەکانی حکوومەت دەبەستێ و بە تێپەڕبوونی رۆژگار و بەدرێژایی چەندین سەدە دروستبووە. بەڵام "هاوسەنگی و کۆنترۆڵ"، ئاماژە بە پێویستییەکی دیکەیە.. ئەندێشەی هاوسەنگی و کۆنترۆڵ، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ تیۆری دەسەڵاتی یاسا هەیە. لەم روانگەیەوە، دەبێ بڵێین گەورەترین هاوکاری ئەندێشەی کۆن، لە پێ داگرییان لەسەر دەسەڵاتی یاسا بۆ پاراستنی هاوسەنگی و

کۆنترۆڵ لە سیستمی حکوومەتی بووە، یانێ دەسەڵاتی یاسا بەسەر کارکردنی فەرمانڕەوا، و پێداگرتن لەسەر پێویستی یاسای داڕێژراو کە دەبێ حاکم بێ بەسەر ژیانی دەوڵەتدا و سەقامگیری پێ ببەخشێ و "عەدالەت لەنێوان یەکسانەکان" بەرقەرار دەکا.[(٢١)]

لە دونیای کۆندا، کە حیزبە سیاسییەکان نەبوون، ئەم هاوسەنگی و کۆنترۆڵە، لە رێگای بەشداری راستەوخۆی چینە جۆراوجۆرە کۆمەڵاتییەکان لە پێکهاتەی دەوڵەتی و تەرخانکردنی هەریەك لەم کارکردە دەرونییانەی دەوڵەت یان هەریەك لەم دەزگایە بە هەر یەك لە چینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا، دەهاتە دی، هەرچەند کە دابەشکردنی دەسەڵات و دابەشکردنی کارکردە دەروونییەکانی دەوڵەت، وەك ئەمرۆ پێناسە نەکرابوو و دەتوانین بڵێین کە ئەندێشەی فەیلەسووفەکان و بیرمەندانی سیاسی، زیاتر لەڕووی پێویستی هاوسەنگی و کۆنترۆل لە حکوومەت دابوو. سەرەڕای ئەمەش ، پێداگرتن لەسەر یاسا، پێداگرتن لەسەر بوونی یاساگەلی داڕێژراو و بوونی میکانیزمی یاسایی دیارکراوی کە کارکردەکانی دەوڵەت دەخاتە ژێر چاودێرییەوە، لە ئەندێشەی یۆنانیدا گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. لەبەر ئەم هۆیە، نێوەرۆکی یاسای بنەڕەتی، کە جۆری پەیوەندی حکوومەت لەگەڵ هاووڵاتییانی دیاریدەکرد، پێگەیەکی گرنگی لە فەرهەنگ و ئەندێشەی یۆنانی بۆ خۆی تەرخانکردبوو. لایەنی پێداگرتن لەسەر دەسەڵاتی یاسا، چ لەنێوان یۆنانییەکان و چ لە ئەندێشەی رۆمییەکان، گشتی بوون و تایبەتمەندی گشتی خودی یاسا بوو. ئەم کارە لە ناوەرۆکی خۆیدا، بە جۆرێك، هەل و بواری دابەشکردنی دەسەڵات و کارکردە جیاوازەکانی دەوڵەتی بووە. چونکە سروشتی گشتی یاسایە کە بوونی دەزگای قەزایی و دادوەر بۆ تەفسیر و یەکسان کردنی بنەما گشتییەکانی یاسایی لە هێندێك حاڵەتی تایبەتیدا بە پێویست دەزانی . ئەرەستوو وتبووی کە یاسا دەبێ حاکمی هەموو شتێك بێ و دادوەر و هاووڵاتییان تەنیا دەبێ لە وردەکارییەکانی یاسا بڕیار بدەن".[(٢٢)]

ئەم بۆچوونە، لە بیروکەی یاسایی رۆمییەکانیش زاڵبوو، کە لە... دوازدەهەمی Tables یاساکانی رۆم، رەنگی داوەتەوە.[(٢٣)]



لە دونیای پێشکەوتوودا، لە کاتێکدا بەرانبەری یاسایی مرۆڤەکان سەلمێندرا و زنجیرە پلەی کۆمەڵایەتی جێگای خۆی بە هاووڵاتیی بەرانبەردا، بەشداری لە قەوارەی حکوومەتیش پێشوازی پێش سەرمایەداری خۆی لە دەستداوە. بەشداری لە قەوارە حکوومەتییەکان، چیدیکە نە بەشێوەی راستەوخۆی چین و توێژەکان یان زنجیرە پلەی کۆمەڵایەتی، بەڵکو "ناراستەوخۆ" وەك هاووڵاتی بەرانبەر، لەگەڵا کەسانی دیکەی بەشداربوو لە رێکخراوی حکوومەتی و لەرێگای پەیوەندی حیزبەکان بە چین و توێژەکان لەودا بەشداریدەکەن کە پێشوازی "نوێنەرایەتی" بەخۆوە دەگرێ و نە بەشداری راستەوخۆ.

لەراستیدا، ئەوەی مانا بە دابەشکردنی دەسەڵات چ لە نێوخۆی دەزگای حکوومەتی وەك سێ دەسەڵات یا هێزی جیاواز لە یەکتر، هەروەها بە دابەشکردنی ستونی یان ناوچەیی لە سیستمێکی فیدراڵ دەدا، تەنیا دابەشکردنی فەرمی دەسەڵات نییە، چونکە لە دونیادا حکوومەتێك نییە کە بەشێوەی رواڵەتی ئەم دەسەڵاتانەی لە یەك جیانەکرابێتەوە. ئەوەی بەم دابەشکردنە فەرمییە، ناوەرۆکی راستەقینە دەبەخشێ، ئازادی حیزبەکان و چاپەمەنییە لە کۆمەڵگا دا و بەبێ ئەوانە دابەشکردنی دەسەڵات، یان دابەشکردنی ستوونی ئەو بێ ناوەرۆکە. بە واتایەکی دیکە، کۆڵەکەی راستەقینەی دابەشکردنی دەسەڵات بۆ نێو کۆمەڵگا رادەگوازرێ کە لە رێگای بوونی ئازادی حیزبەکان و رێکخراوە جۆراوجۆرەکان کە پارێزەری بەرژەوەندی بەشە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکانن، چاودێری هاتنەدی ئەم دابەشکردنە رواڵەتییەن و هاوسەنگی و کۆنترۆڵی بەرانبەر بەکاردێنن. هەروەها، ئەو دابەشکردنە چینایەتییەی پێش سەرمایەداریش کە وەك ئامرازی کۆنترۆڵ و هاوسەنگی لە رێکخراوی حکوومەتی بەکاردەبرا، لە دەوڵەتی مودێرندا، بەتەواوی گۆڕانی بەسەر داهات. ئەگەر پێکهاتەی پاشایەتی (یان کۆنسولەکان لە کۆماری رۆم)، رۆڵی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و یا ئەریستۆکراتەکان رۆڵی یاسادانەریان لە ئەستۆ بوو، لە دەوڵەتی مودێرندا، نوێنەری چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی، دەتوانن هەریەك لەم رۆڵانە بگرنە ئەستۆ. هیچ یەك لەم دەسەڵاتانە تایبەت بە چینێکی دیارکراو نییە و کۆی ئەم دەسەڵاتانە رەوای خۆی لە چەمکی یاسایی هاووڵاتی بەرانبەر هەیە.

## قۆناغی پێکهاتنی تیۆریی

لە نێوان چەمکەکانی کارکردە جیاوازەکانی دەسەڵات، واتە دەسەڵاتی یاسادانان، بەڕێوەبەری و قەزایی، لەلایەك و تیۆرییە مودێرنەکانی پەیوەندیدار بە بیرۆکەی دەسەڵات لە لایەکی دیکە، پەیوەندییەکی زۆر نزیك هەیە. ئەندێشەی یاسادانانی سەربەخۆ، بۆخۆی بەستراوە بە سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە بوو کە یاسا دەتوانێ، لەلایەن مرۆڤەوە دابڕێژرێ. لە سەرتای سەدەی ناوەڕاست، ئەندێشەی داڕشتنی یاساکان لەلایەن مرۆڤەوە، پشت بەستوو بەم بیرۆکەیە بوو کە یاسا، دەربڕی دەسەڵات و ویست و ئارەزووی خودایە. مرۆڤ دەتوانێ بەکاری بێنێ و یان تەفسیری بکا، بەڵام ناتوانێ بیگۆڕێ و یا بۆخۆی یاسا دابڕێژێ. تا ئەو جێگایەی پەیوەندی بە "یاسادانەرەوە" هەیە، یاسادانەر، لەڕاستیدا زۆرتر خەریکی روونکردنەوەی ئەم ویستە خوداییە و بۆ خۆی ناتوانێ یاسا دابڕێژێ. چونکە یاسا، وەك رەنگدانەوەی یاسایی خودایی لە نەریت و ژیانی کۆمەڵگا چاو لێدەکرێ و ئەو یاسایانەی کە شا و پەڕلەمان رایدەگەیەنێ، لە حوکمی یارمەتی بە شیکردنەوە و دەربڕینی یاساکانی خوداییە. لەم قوناغەدا و بەگشتی لە تەواوی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست، دەسەڵاتی سیاسی، بە شێوازێکی هەمەلایەنەتر بڵاوببوەوە، هەر بۆیە دابەشکردنی دەسەڵات بێجگە لە دابەشکردنی ستوونی خۆی لە نێو ناوچە پرش و بڵاوەکاندا و دابەشکردنی گشتی دەسەڵات لە نێوان پیاوە ئایینییەکان و دەسەڵاتی زەمینی، خاوەنی بنەمایەکی دیاریکراو لە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێودەزگای حکوومەتیدا نەبوو. ئەمجۆرە لە دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات ... تایبەتمەندییەکانی پەیوەندی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی و لە لاوازی هەلی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی ناوەندی لەگەڵ ناوچە پرش و بڵاوەکان لە رووی جوغرافیاییەوە، هەروەها لە پشت بەستنی دەسەڵاتی ناوەندی لەروویماڵی و سەربازی بەسەر دەرەبەگەکانی خۆجێیی سەرچاوە دەگرێ، نابێ لەگەڵ سیستمە نوێیەکانی فیدراڵ بە هەڵە بگرین. شاکان، بەگزادەکان و خاوەن پلەکانی دیکە، تەواوی ئەرکی ئیداری، قەزایی، مەدەنی و سەربازییان بەڕێوە دەبرد و



ئەنجوومەنەکان یان کۆمەڵەی گشتی دەرەبەگەکان، لە هەمانکاتدا رۆڵی کۆمەڵەی یاسادانان و قەزاییان دەگێڕا. بە سەرنجدان بە ئەندێشەی مەزهەبی فەرمانڕەوا، لەسەر بنەمای ئەوەی کە مرۆڤ داڕێژەری یاسا نییە، بەڵکو تەنیا دەتوانێ یاسای خودایی تەفسیر بکا، یاسادانەر لەراستیدا رۆڵی دادوەر لە تەفسیر و بەکارهێنانی یاساکانی هەیە هەتا یاسادانان. بە واتایەکی دیکە، دەسەڵات تەنیا یەك "کارکردی" هەیە کە بریتییە لە کارکردی قەزایی، هەڵبەت نە بە مانای ئەمڕۆیی، کاروبارەکانی دیکەی حکوومەت، پەیوەندی بە تەفسیر و بەکارهێنانی ئەم یاسایانە هەیە. هەربۆیە هەموو روانینەکان بۆ حکوومەت کە ئەرکی جیاوازی تەفسیر و بەکارهێنانی یاسا لە کاروبارەکانی حکوومەتدا ئەوەی کە هۆکاری جیاوازی ئینسافی لەودابەشدارە، بنەمایەك بۆ تیۆری "بەشەکانی دەسەڵات" دادەڕێژێ کە بوار بۆ کارکردە بە تەواوی جیاوازەکانی حکوومەت و بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات دەرەخسێنێ.[٢٤]

رەگەکانی ئەم ئەندێشەیە، لەبیروبۆچوونی کلێسای کاتولیك و دابەشکردنی کار لە نێوان پاپا و ئۆرگانەکانی کلێسا و کارکردی جیاوازی ئەوان دایە و بۆخۆی دامەزراوەیەك بۆ دووکارکردی جیاواز لە دەسەڵات پاشایەتی، یانێ دەسەڵاتی حکوومەتی، دەسەڵاتی بێ سنووری بووە هەر بۆیە لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی قەزایی، دەبوایە خۆی گوێڕایەلی یاسا بێ. ئاسەواری ئەم جیاوازییە، سەرهەڵدانی ئەندێشەی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە روخساری شابوو. هێنانە بەرباسی دووکارکردی جیاواز لە دەسەڵاتی پاشایەتیدا، لە راستی هەولێك بوو بۆ بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی شا و ناچارکردنی شا بە لەبەرچاوگرتنی ئەو یاسایانەی کە خۆی دای نەڕشتوون. ئەم کارە بوار بۆ پێکهاتنی یاسا دانانی سەربەخۆ لە ئیرادەی شا دەرەخسێنێ. تەنیا لە ١٧٠١، واتە، ماوەیەك دوای شۆڕش لە بەریتانیا بوو کە دەسەڵاتی قەزایی لە دەزگای پاشایەتی جیاکرایەوە.[٢٥]

تا کاتی شەڕی نێوخۆیی لە بەریتانیا، مەسەلەی داڕشتنی یاساکان لەلایەن پارلمان، یان هەڵوەشانەوەی یاساکان، ببووە کێشەیەکی سەرەکی لە نێوان شا و پەڕلەماندا. بەم

شێوەیە، کاتێك لەسەدەی حەڤدەهەم، جیاوازی ئاشکرا لە نێوان "دەسەڵاتەکانی" یاسادانان و بەڕێوەبەری، لەراستیدا لە نێوان شا و پەرلەماندا پێکهات، لەراستیدا یاسادانان هێشتا وەك بەشێك لە کارکردی بنەرەتی حکوومەت، واتە کارکردی قەزایی ئەو و دابەشکردنی دەسەڵات بە دوو دەسەڵاتی قەزایی و بەڕێوەبەری چاوی لێ دەکرا.

پەرەسەندنی تیوری فەرمان لە یاسا، کە بەو پێیە، یاسا لە بنەڕەتدا دەربڕینی فەرمانێك یان بەربەستێکە نەك شتێکی نەگۆڕ، کە بە ئەندێشەی نوێی دەسەڵات گیانی تازەی وەبەرهاتبووەوە و دەسەڵاتدار سەرچاوەی دەرکردنی ئەم فەرمانانە بوو، جووڵەیەکی دیکەی بە چەمکی یاسادانانی سەربەخۆدا. بە پێی تیۆری فەرمان لە یاسا، یاسا دەبێ خاوەنی تایبەتمەندییەکی کاریگەربێ و مانەوەی حکوومەت و ژیانی سیاسی کە بتوانێ بەردەوام بێ پێویستە سەرنجی جیددی پێ بدرێ. لەم حاڵەتەدا، زۆر سرۆشتییە کە تایبەتمەندی زۆرلێکردن یان زاڵبوون، وەك نێوەرۆکی یاسا چاو لێدەکرێ. لەم رووەوە، یاسا خۆی وەك زنجیرەیەك فەرمان نیشاندەدا.[٢٦]

هەر بۆیە، سەرچاوەی ئەم یاسایە لە ژیانی دونیاییدا، خەڵك، یان زۆرینەی خەڵکن و پێویستی بە دەستێوەردان، یان تەئیدی سەرچاوەی سەرەوەتر نییە.

لایەنگرانی ئەرەستوویی تۆماس ئاکۆنیاس، لەوان ژان پاریسی(John of the Paris) و... هەر دوویان، پێویستی سەربەخۆیی حکوومەتەکان لە مەزهەب و دەستێوەرنەدانی ئەوانیان هێناوەتە بەرباس. هەر بۆیە رادیکاڵترینی ئەوانە لەم بوارەدا، مارسیلیوس پادوایی(Marsilius of Padua) بوو. لە روانگەی مارسیلیوس، سروشتی ژێربێژی و دەسەڵاتی ئەخلاقی مرۆڤ سەبارەت بە رەوتە سروشتییەکانی سیاسەتی دونیایی، بۆ خۆی هۆکارێکە کە پێویستی بە دەستێوەردانی پیاوە ئایینییەکان لە کاروباری دەوڵەتە سیکۆلارەکان نییە، بەڵکو دەستێوەردانی ئەوتۆ، حکوومەتە سیکۆلارەکان دەخاتە مەترسییەوە. خەڵك، کە هۆگرییان بە ژیانێکی ئاشتی خوازانە هەیە و دەڵێ ئیزن بدرێ ئەم خواستانە بێنە دی. بۆ ئەم مەبەستە، خەڵك دەبێ رەزامەندی خۆیان بەرامبەر بە دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان دەربڕن. لەوە گرنگتر، راوێژکردن و رەزامەندی کۆمەڵانی خەڵك بۆ دیاری



کردنی یاسایە و حکوومەتەکان دەبێ بەپێی یاساگەلی باسکراو لە لایەن خەڵکەوە هەڵسوکەوت بکەن. کاتێك حکوومەت و یاسا، بەمجۆرە پێکهات، ئەوانیش، لقە جۆراوجۆرەکانی حکوومەت، هەروەها پیاوە ئایینییەکان کۆنترۆڵ دەکەن و ئەمە بۆ بوونی بێ خەوشی کۆمەڵگا پێویستە. ئەگەر حکوومەتێك نەتوانێ لە بەڕێوەبردنی پەیامی خۆی سەرکوتوو بێ، یان پێ داگر بوو لەسەر هەڵەکانی خۆی، خەڵك مافی چاکسازی یان گۆڕینی حکوومەتەکانیان هەیە.[٢٧]

تیۆری دەسەڵاتی کۆمەڵانی خەڵك، دەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشەی سەدەکانی ناوەڕاست و پێیان لەسەر ئاشکراکردنی رۆڵی یاسادانان و گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا لە یاسا دەکردەوە. بە پێچەوانەی ئەندێشەی باو لە سەدەکانی ناوەڕاست، کە شا یان دەسەڵاتدار یاسا نەگۆڕەکانیان تەفسیر دەکرد، ژان بوودن (Jean Badin) بە داڕشتنی بیرۆکەی نوێی دەسەڵات، رایگەیاند کە فەرمانڕەوا، دەسەڵاتی دەرکردنی یاسایی نوێیان هەیە. ئەم کارە، یەکەمین وەرچەرخانی گەورە لە تیۆری نوێی دەسەڵات بوو کە بواری مێژوویی بۆ ململانێی دواتر لە سەر یاسا دانان دەرەخسێنێ. نووسراوەکانی مارسیلیوس پادوایی لە کۆتایی سەدەی چواردەهەم، حەلقەیەکی پەیوەندی لە نێوان چەمکەکانی دابەشکردنی ئەرکەکانی یاسادانان و بەڕێوەبەری و کۆتایی هێنان بە شێوەی بیرکردنەوەی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بەرانبەر بە یاسا پێکهێنا. بەر لە مارسلیۆس، تۆماس ئاکۆنیاس (Aquinas) راڤەوانی ناسراوی کلێسای کاتولیك، بە وەرگرتنی ئەندێشەکانی ئەرەستوو و سیسرۆ، بناغەی دابەشکردنی دوو رۆڵی جیاوازی فەرمانڕەوا لە داڕشتنی یاسا و ئیدارەی دەزگای سیاسی پێکهێنابوو. ئاکۆنیاس، بە پێڕەوی کردن لە ئەرەستوو، لایەنگیری لە حکوومەتێکی تێکەڵاو کرد، کە لەودا پێکهاتەی پاشایەتی، ئەریستۆکرات و دیمۆکراتیك، کۆی حکوومەت پێکدێنێ، بەڵام سنووری دابەشکردنی زۆر روون نەبوون. هەروەها لە حکوومەتی تێکەڵاوی ئاکۆنیاس، پێکهاتەی پاشایەتی، رۆڵی سەرکەوتووی دەگێڕا بەڵام مارسیلیۆس، هەنگاوێك بەرەو پێشەوە چوو و دەسەڵاتی یاسادانانی بە راشکاوی خستە چوارچێوەی دەسەڵاتی

خەڵکەوە مارسیلیۆس، دژی ئەم تیۆرییەی زاڵ لە سەدەکانی نێوەڕاستدا بوو کە یاساگەلی دارێژراو، یانێ یاساگەلێك کە لەلایەن هۆکاری مرۆڤییەوە نووسراو، دەبێ شوێنکەوتووی یاسای سەرەوتر (ئیلاهی) بێ.[٢٨]

بەمجۆرە، یاسادانان، بە دەسەڵاتی راستی لە داڕشتنی یاساکان و یاسا بە بڕیارەکانی دەسەڵاتی یاسادانەر گۆڕانی بەسەر دادێ. مارسیلیۆس دەنووسێ:"یاسادانەر، واتە یەکەمینی و گرنگترین سەرچاوەی یاسا، خەڵك یان هەمموو ئەنجوومەنەکانی هاوولاتییان و یان بەشێك لە دەسەڵاتداریەتی کە بە پێی ئاراستە و دەسەڵاتی خۆی کە کۆمەڵگای گشتی، بڕیاری بەڕێوەبردن یان تووش نەبوون بە کردەوەگەلێك لە پەیوەندی لەگەڵ کاروباری مەدەنی مرۆڤەکان دەردەکا یان دیاریدەکا، کە بە ئاگاهێنان یان سزای دنیایی لە خۆ دەگرێ.[٢٩]

یاساکان ، واتە دەسەڵاتی بڕیاری خەڵك، رەنگە بەپێی کات یان شوێن یان شتی دیکە کە بەرژەوەندی گشتی خەڵك رێگە بدا، پێویستی زیادکردنی یان لابردنی چەند بەشێکی یان گۆڕینی تەواوی یان تەفسیر، یان هەڵپەساردنی دەخوازێ. ئەم روانینی مودێرنە لە یاسا، مارسیلیۆس بەرەو دابەشکردنی نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا (دەسەڵاتی بەڕێوەبەری) پاڵ پێوە دەنێ. بەڵام دابەشکردنی ناوبراو لە نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، هێشتا لە چوارچێوە و لە پێشی سەدەکانی ناوەڕاستی خۆی دابوو. چونکە مارسیلیوس پێی وابوو ئەرکی سەرەکی حکوومەت ئەرکێکی قەزایی و چارەسەری ناکۆکییەکانە. بەڵام دابەشکردنی ناوبراو لە پەیوەندی لەگەڵ بەشە جیاوازەکانی دەوڵەت لە بیرمەندانی پێش خۆی بەربڵاوتر بوو. دابەشکردنی کارکردە جیاوازەکانی دەوڵەت لە راستیدا کۆڵەکەی ئەندێشەی مودێرنی پێکهێنا، بۆخۆی رەنگدانەوەی دابەشکردنی ئەرەستوو بوو لە کتێبی"ئەخلاق" بە کردەوە تا سەردەمی مۆنتسکیو، تووشی گۆڕانێکی ئەوتۆ نەهات.[٣٠]

دیاریکردنی ئەوەی کە یاسا چییە، سەرچاوەی یاسا چییە؟ ئەوەی کە خەڵك سەرچاوە و داڕێژەری یاسان و بەپێی چوارچێوەی یاسای نووسراو، بەڕێوەبردنی حوکمی



ئاماژەپێکراو دەخرێتە سەرشان فەرمانڕەوا(دەسەلاتی بەڕێوەبەری)، بۆ خۆی بازدانێکی مێژووی گەورە بوو لە پۆلێن بەندی رۆڵی پلەیەکی یاسادانان و رۆڵی لاوەکی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری. لایەنی گرنگی دیکەی تیۆری، سیکۆلاربوونی یاسا و دەسەڵاتی سیاسی و رزگاربوون لە ئیدعای کلێسا و مەزهەب لەسەر مافی تەئید و دەسەڵاتی زاڵی ئەو بەسەر حکوومەتی زەمینیدا. هەربۆیە هەتا دابەشکردنی نێوان کارکردنی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری حکوومەت و بەڕێوەبردنی یاساکان لە رێگای دادگاکان وەك لقێکی سەربەخۆ لە دەسەڵات کە هەریەك لەم ئەرکانە بە لایەنی جیاواز بسپێرێ، هێشتا مێژوویەکی دوور و درێژی لە پێش بوو. لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم کە کێبڕکێی نێوان شا و پارلمان لە ئینگلیز، چوو بووە قۆناغی شەڕ لە نێوان ئەو دووانە، تیۆری دابەشکردنی دەسەڵاتیش راشکاوییەکی زیاتر بەخۆوە بینی. کۆماریخوازانێك وەك جان میلتون (John Milton)، جەیمزهرینگتون و ئالجێرنوون سیدنی (Algernon Sidney)[٣١]، هەریەك لە گۆشەیەکەوە پێکهاتەی دڵخوازی حکوومەتی و پێویستی دابەشکردنی دەسەڵاتیان راقەدەکرد. سیدنی، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری ئەو بەشە لە پێکهاتەی حکوومەتی دەزانی کە ئەمرۆ پێی دەڵێین دەزگای قەزایی. ناوبراو پێکهاتەی حکوومەتی بە دوو بەشی، شمشێری شەڕ و شمشێری عەدالەت دابەشدەکا و شمشێری عەدالەت دەسەڵاتی یاسادانان و بەڕێوەبەری دەگرێتە خۆی کە ئەرکی یەکێکیان داڕشتنی یاسا و ئەوی دیکەیان قەزاوەت بەپێی ئەم یاسایانەیە. بەڵام جان میلتون پێی وایە کە بەڕێوەبردنی یاسا دەبێ لە لایەن دادگا خۆجێییەکان بەڕێوە بچێ هەتا خەڵك بتوانێ دەزگای عەدالەت بگرنە دەستی خۆیان[٣٢].میلتون، بیرۆکەی باو لە سەدەی حەڤدەهەم بەمجۆرە کورت دەکاتەوە:

"لە تەواوی نەتەوە بە تواناکاندا، دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی قەزایی، زۆرجار بەشێوەی سەربەخۆ بەڕێوە دەچێ. ئەگەر ئەرکی شا تەنیا بەڕێوەبردنی یاسایە و ئەم بەرزترین کارکردنی ناوبراوە، چی دیکە نابێ ناوبراو یاسا دابڕێژێ یان مەنعی بکا کە پەرلەمان لەسەری رێککەوتوون"[٣٣].

پرۆفیسۆر وایل دەنووسێ کە ئەم دابەشکردنەی دەسەڵات، هێشتا تایبەتمەندی زنجیرە پلەی (هێرارشی) لەخۆیدا پاراستووە و پێشی بە جیابوونەوەی دەسەڵاتی قەزایی لە بەڕێوەبەری و هاوتەریب بوونی لەگەڵ دوو دەسەڵاتی دیکە گرتووە. تا کاتی شەڕی نێوخۆیی، یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی تیۆری، یانی دابەشکردنی ئینتزاعی دەسەڵاتی حکوومەتی بە دوو یان سێ دەسەڵات، تاڕادەیەکی زۆر روون ببووەوە. بەڵام تا گەیشتن بە دابەشکردنی کامڵی سێ دەسەڵات، واتە سپاردنی کارکردە جیاوازەکانی حکوومەت بە دەستی کەسان یان گرووپێکی جیاواز لەیەك، هێشتا سەدساڵی دەویست.[٣٤]

لە نێوان بیرمەندانی ئاماژە پێکراودا، دەتوانین جەیمز هرینگتون وەك بەرچاوترین کۆماریخوازی ئەم قۆناغە ناوبەرین. ناوبراو سەرەرای ئەوەی کە خۆی ئەندامی بنەماڵەیەکی ئەریستوکرات بوو و دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ چارلز(شای ئینگلیز) هەبوو و هەتا بن داری هەڵواسین هاوڕێیەتی کرد، بەڵام کۆماریخوازبوو و یەکەم کەسە کە بنەمای تیۆریکی بۆ کۆمارێکی گەورە لەسەر بناغەی حکوومەتی نوێنەرایەتی پێشکەشکردووە. لەم روانگەیەوە دەتوانین ناوبراو بە پێشڕەوی جان لاك بزانین.[٣٥]

ئاراستە کۆماریخوازانەکەی جەیمزهرینگتون بوو کە لەلایەن مۆنتسکیۆ لە قۆناغی دواییدا کەوتە بەر رەخنە.[٣٦]

بە پێچەوانەی پۆلی بیۆس، کە کۆڵەکەی کۆمەڵایەتی حکوومەتی تێکەڵاوی بەسەر سێ بەشدا دابەشدەکرد، لە مودێلی کۆماری هرینگتون، حکوومەت لەسەر دووکۆڵەکە دامەزرابوو: ئەریستوکرات لەسەر بنەمای خاوەنداریێتی و دیموکراسی. لەم حکوومەتییەتەدا، سەڵتەنەت لە نێوەرۆك ئاسایی خۆی جیا دەبێتەوە، نە شا هەڵبژێردراو، نە ئەریستوکراتی میراتی و نە سەرۆکی حکوومەت جێگایەکیان نییە. لە بەرانبەردا، حکوومەتی پێکهاتوو لە ٤٩ ئەندام، بەڕێوە دەچێ کە بەڕێوەبەرییەك بە نۆبەی خۆی لە کۆمیتەکان پێکهاتوون و چالاکییەکانیان لەلایەن ئۆرگانەکانەوە هاوئاهەنگ دەکرێ کە پێی دەڵێن ئەنجوومەنی دەوڵەتی(Signoria). ئەریستوکراتی سروشتی یانی کەمایەتی خاوەن پارە نە ئەرستوکراتی میراتی، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری



(Magistrate) هەڵدەبێژێ و رێبەرایەتی حکوومەت دەگرێتە ئەستۆ کە لەراستیدا رەنگدانەوەیەك بوو کە پێکهاتن و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی چینی ناوەندی لە ئینگلیز، ئەم جۆرە لە دابەشکردنی دەسەڵات لە روانگەی هرینگتوون، پێشگیری لە سەرەڕۆیی کەمایەتی دەوڵەمەند و ستەمی زۆرینە بوو.[٣٧]

مودێلی کۆماری گەورە لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی، دواتر لە باسەکانی یاسای بنەڕەتی ئەمریکا بەتایبەت لە نووسراوەکانی جان ئادامز کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو. بەڵام یەکێك لە گرنگترین دەسکەوتەکانی فیکریی جەیمزهرینگتون، دانی کۆڵەکەی ئابووری بە کۆمارەکە پێی وابوو بەرهەمی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتییە و لە پرۆژەی حکوومەتی خۆی لە باسی بە تەواوی یاسایی سەبارەت بە دەسەڵات دێتە دەرەوە. ناوبراو بە وەرگرتنی ئەم بیرۆکەیەی ئەرەستوو کە شۆڕشەکان، ئاکامی نابەرانبەری لە خاوەنداریێتییە و بەکاریگەری وەرگرتن لە تیۆری ماکیاڤیلی کە ئەریستوکراتی بەهێز، لەگەڵا دەسەڵاتی کۆمەڵانی خەڵك نەگونجاوە دەنووسێ کە هاوسەنگی لە خاوەنداریێتی زەوی کلیلێکە ئەگەر بڕێکی زۆر لە زەوی لە دەستی ئەریستوکراتەکان کۆبێتەوە، کۆمەڵانی خەڵك لەڕووی ئابووری و سیاسییەوە، بەستراوە بەوان دەبن لە روانگەی ناوبراوەوە و دەسەڵات لە چەمکی مافی خۆیدا، وشەیەکی ئاشکراو شیکەرەوەی خۆی نییە کە بڵیین(مانگ دیارە چ پێویستی بە ئیشارەیە) بەڵکو پێویستی بە هێزی کۆمەڵایەتییە و پێویستی ئەویش بەنۆبەی خۆی، کۆنترۆڵی کەرستەی بژێوی ژیانە. بە واتایەکی دیکە، ئەوەی کە کۆنترۆڵی کەرستەی بژێوی ژیانی مرۆڤەکان دەگرێتە دەست، کۆنترۆڵی هێزی کۆمەڵایەتی یان دەسەڵاتیش دەکا. دروست لێرەدایە کە هرینگتون، لە تیۆری تۆماس هابس کە پەیوەندی دەسەڵات لەگەڵ خەڵکی لەسەر بنەمای جۆرێك گرێمانەی بەتەواوی یاسایی بەناوی "رێکەوتن" دانا، ئەولاوەتر دەچێ و بە چەمك و سەرچاوەی دەسەڵات، بناغەیەکی ئابووری دەدا:[٣٨]

"بەوجۆرە کە هابس وتویەتی، یاسا بەبێ شمشێر تەنیا لەتە کاغەزێکە. رەنگە ناوبراو بیر لەم شمشێرە کردبووەوە کە شمشێر بەبێ دەستێ کە گرتبێتی شتێك بێجگە لە

ئاسنێکی سارد نییە و دەستێك کە ئەم شمشێرەی راگرتووە، میلیشای نەتەوەیەکە.. بەڵام سوپا حەیوانێکە کە ورگێکی زلی هەیە و دەبێ تێربکرێ. ئەوەی کە خۆراکی ئەم حەیوانە لە کوێ دابیندەکرێ، بەمەوە بەستراوەتەوە کە ئێوە چ لەوەرگەیەکتان(بۆ تێرکردنی ئەم حەیوانە) هەیە و ئەوەی کە ئێوە چ لەوەرگەیەکتان هەیە بەستراوە بە هاوسەنگی خاوەندارێتی بێ، کە بەبێ ئەو، شمشێری کۆمەڵانی خەڵك، تەنیا دەبێتە ناوێك بۆ بۆقێك کە تەنیا واقواق دەکا".(٣٩)

لەم رووەوە، هرینگتون، پەیوەندی جیانەکراوەی نێوان چەمکەکانی یاسا، زاڵبوون و خاوەندارێتی دامەزراند و یاسای بەرتەسك کردنەوەی خاوندارێتی زەوی و سووڕانی شوێنی دەسەڵات لە رێگای دەنگەوە، بناغەیەك بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی دەزانی:

"کۆمارێك لەسەر بنەمای یەکسانی...... حکومەتێکە کە لەسەر بەرابەری لە خاوندارێتی زەوی دامەزراوە و لەسەر ئەودا سەرخانێك هەیە کە لەودا سەنا باس و پێشنیار دەکا، خەڵك سەبارەت بەو بڕیار دەدا و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، بەڕێوەی دەبا کە بە شێوەی سووڕان و لە رێگای دەنگەوە هەڵبژێردراون".(٤٠)

ئەگەر چی یاسای بنەڕەتی مودێرن، لە روانگەی سەرچاوەی فیکری سەرتای خۆی، قەرزداری بیرمەندانی یۆنانی و تیۆری حکومەتی تێکەڵاوی رۆمە، بەڵام بناغەکانی یاسای بنەڕەتی مودێرن و دابەشکردنی دەسەڵات لە قۆناغە یەك بە دوای یەکەکانی شەڕی نێوخۆی (١٦٤٢-١٦٤٨)، قۆناغی کۆماری یان ناسراو بە Interregnum (1649-1660) و قۆناغی "شۆڕشی بەشکۆ" (١٦٨٨-١٦٨٩) لە ئینگلیز شکڵی گرت کە دواتر وەك وێنەیەکی تیۆری کراو لەلایەن شارل مۆنتسکیۆ تیۆریزە کراو و بە سووڕانی تیۆرییەکی دیکە لە یاسای بنەڕەتی ئەمریکا و فەرەنسا، چوارچێوەی بنەڕەتی یاساکانی بنەڕەتی ئەمرۆکە و دابەشکردنی دەسەڵات پێکهاتن. لە قۆناغی شەڕی نێوخۆیی و قۆناغی کۆماری، تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات، دژکردەوەیەك بوو دژی ئەم ئەندێشە باوە کە بەریتانیا ئێستاش خاوەنی حکومەتێکی تێکەڵ نییە، پێکهاتوو لە پێکهاتەی سەڵتەنەت، ئەریستوکرات و دیموکراسییە کە لەودا سەڵتەنەت، پەرلەمانی لۆردان و پەرلەمانی عەوام، بە دوای یەکدا ئەوان نوێنەرایەتی دەکەن.



زیندووکردنەوەی سەرلەنوێی سەڵتەنەت و بەشداری شا لە پەرلەمان و دادگاکان، لە روانگەی (Whigs)، جیاوازییەکی بەرچاو لە نێو سیستمی مەشرووتەدا پێکهاتبوو. سەرەڕای تیۆری دەسەڵاتی پەرلەمان، کۆنترۆڵی دادگاکان لە لایەن سەڵتەنەتەوە، بۆ خۆی سەربەخۆیی دەسەڵاتی یاسادانانی دەخستە مەترسییەوە. بەبێ دەسەڵاتی قەزایی سەربەخۆ بۆ کۆنترۆڵ کردنی وەزیرەکان، دەسەڵاتی لابردنی لەلایەن پەرلەمان، تەنیا دەسەڵاتی کۆنترۆڵ کردنی سەڵتەنەت بوو.

لەوەی کە شاکانی بنەماڵەی ستوارت، دەستیان لە کاروباری دادگاکان و لە رێگای وەزیرەکانەوە لە هەردوو پەرلەمان وەردەدا، رەخنەگرانی سەڵتەنەت خوازیاری ئەمەبوون کە دەبێ بنەمایەکی نوێ بۆ بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی سەڵتەنەت دارێژن. لەلایەکی دیکەوە یەکسانی خوازەکان لە قۆناغی کۆماریدا، دژی دەسەڵاتی رەهای پەرلەمان بوون و پێیان وابوو کە دەسەڵاتی بێ مەرجی یاسا دانان، بۆخۆی مەترسییەکی وێکچووە بۆ ئازادی.

لە نێوان ١٦٨٨هەتا ١٧٠٠، بیرمەندانی یاسای بنەڕەتی لە بەریتانیا، بەم ئاکامە گەیشتن کە دابەشکردنی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە یاسادانان، بە تەنیایی ناتوانێ پێش بەوە بگرێ کە کەسانی پاوانخواز، حکومەتی مەشرووتە، دەسەڵاتی خەڵك، یان دەسەڵاتی یاسا لە نێو نەبەن.

لە روانگەی جان لۆکەوە، زاڵبوونی یاسادانان لە قەوارەی دەوڵەتی و چۆنیەتی بەڵێن هێنەری یاسا بۆ خۆی مەرجی گرەنتی کردن بۆ حکومەتێکی مەشرووتە نەبووە، مەگەر ئەوەی کە بە زنجیرەیەك ئیمتیازی تایبەتی بۆ سەڵتەنەت، هەروەها بە دەسەڵاتی فیدراڵی هاورێ بووبێ.

لاك لە هەمان کاتدا پێی لەسەر پێویستی دەزگای قەزایی سەربەخۆ بۆ بەڕێوەبردنی بێ لایەنانەی عەدالەت دادەگرت. بە دابەشکردنی کارکردی تەفسیری یاسا لە بەڕێوەبردنی یاسا، هەم سەڵتەنەت و هەم پەرلەمان، هەرکامەیان لە چوارچێوەی ئەرکەکانی خۆیان کە یاسای بنەڕەتی دیاریدەکرد، دەمێنێتەوە. یاسای ١٧٠١، لە ژێر

ناوی "Act of Settlement) ئەم کارەی بە فەرمی ناسی و یەکەمین ئەزموونی مرۆڤ لە دابەشکردنی تیۆری و بە کردەوە لەم چوارچێوەیەدا بوو.[٤١]

## یاسای راکێشانی نیوتون و تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات

زانستی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەمموو کاتێك بە شێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، کاریگەری لە پێشکەوتنەکان و گۆڕانکارییەکان لە چوارچێوەی زانستی سروشتی وەرگرتووە، پێشکەوتنی زانست لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم، جووڵەیەکی نوێی بە بیرۆکەی دابەشکردنی دەسەڵات و داڕشتنی قەوارەکانی سیاسی حکوومەتی بەپێی ئەودا.

بیرمەندانی سەدەی حەڤدەهەم لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە جیهان شوێنکەوتووی یاسامەندی گەلێکە کە بەوردی دەتوانین ئەم یاسامەندییانە بدۆزینەوە و پۆلێن بەندی بکەین. کاتێك بیردۆزان، چالاکییەکانی خۆیان لە بواری کۆمەڵایەتیدا پەرە پێدەدا، لە چوارچێوەی کۆمەڵگاشدا، بوونە خاوەن نەزمێکی سروشتی، نەزمێك کە لەگەڵ ئیرادەی ئازادی خەڵك دەتوانین رێکی بخەین و گۆڕانی بەسەردابێنین. چەمکی دابەشکردن و هاوسەنگی لە هێزە سیاسییەکانی حکوومەت، وێنەیەکی سیاسی لە مودێلی باسکردنی نیوتن لە جیهان و پەیوەندی ئەستێرەکان لەگەڵ یەکتری لێکەوتەوە. نیوتون، بە دۆزینەوەی یاسای راکێشان نیشانی دابوو کە شتە ئاسمانییەکان، لە رێگای راکێشانی بەرانبەرەوە، پێش بە گەڕانەوەی بۆ گەردوون دەگرێ. لەلایەکی دیکەوە، ئەوان بەهۆی جووڵەی خۆیان، لە راکێشانیان بۆ نێو خۆر و تواندنەوە لە نێویدا پێشی پێدەگرێ. دابەشکردنێك یان جیایی بنەڕەتی (Basic) لە نێوان ئەواندا و بوونی هاوسەنگییەکی ئالۆز لە راکێشان و دەربازبوون، ئەوان لە خولگەی خۆیدا رادەگرێ.

ئەنجامگیری سیاسی لە دۆزینەوەی یاسای راکێشانی نیوتون ئەمەبوو کە دابەشکردنی بنەڕەتی لە قەوارە سیاسییەکان لە حکوومەتیش دەتوانێ ببێتە هۆی



سەقامگیری سیاسی لە حکوومەت و بەهۆی پاراستنی سەربەخۆیی و پەیوەندی هاوسەنگ لە نێواندا، کە جۆرێك پەیوەندی کۆنترۆڵی بەرانبەر لەسەر یەکتر بەرێوەدەبەن، دەبێتە لەمپەر لە بەرانبەر تواندنەوەی دەسەڵاتێك لە دەسەڵاتێکی دیکەدا. لەم رووەوە، مەشرووتە خوازیی مودێرنی سەدەی هەژدەهەم لەگەڵ جیهان ناسی نیوتونی و قەبوولکردنی میکانیکی نیوتنی، گەیشتە ئەم گریمانەیە کە مرۆڤ دەتوانێ لە رێگا گەلێك وەك دابەشکردنی دەسەڵات، سیستمێکی سیاسی پێکبێنێ کە سەرکەوتنەکەی پێویستییان بەستراوە بە شکۆ و پاکی مرۆڤەوە... سیستمێکی ئەوتۆ، لە کارکردی خۆیدا، لەهەر جۆرە شانس و قەزا و قەدەرێك جیادەبێتەوە و سەربەخۆ دەبێ.[٤٢]

لە رووی مێژووییەوە، سەدەی هەژدەهەم، تەنیا سەدەیەك نەبوو کە ئەندێشەی فەلسەفی هەوڵیدا کە وێکچوون و پەیوەندییەك لە نێوان زانست و سیاسەت پێکبێنێ. هەروەك، بیرۆکەی حکوومەتی هاوشان یان هاوسەنگی لە قازانج و بەرژەوەندی چین و توێژە جیاوازەکانیش بۆ یەکەمجار لە سەدەی روشنگەری نەهاتە ئاراوە، بەڵکو بەقەدەر دەوڵەت شارەکانی یۆنان کۆنە. هارمونی و هاوسەنگی، بناغەی بیرۆکەی یۆنانییەکان سەبارەت بە دەوڵەت بوو. نزیکەی شەش سەد ساڵ پێش زایین، سولون[٤٣](Solon) مافناسی هەڵکەوتووی یۆنانی، یاسادانانی بەپێکهێنانی هاوسەنگی و بەرپاکردنی هارمۆنی لە نێوان دەوڵەمەندەکان و هەژارەکان رێبەری کردبوو.

وودرو ویلسون(Woodrow Wilson)، سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە قۆناغی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لە پەیوەندی لەگەڵ کاریگەری جیهان ناسی نیوتنی لەسەر یاسای بنەڕەتی ئەمریکا دەنووسێ:

" حکوومەتی ئەمریکا لەسەر بنەمای تیۆری دینامێکی سیاسی ویگەکان(Whigs) دارێژراوە، کە جۆرێك هەڵگرتنەوەی وێنە بە شێوەی ناوشیارانە لە تیۆری نیوتون سەبارەت بە جیهان بووە. ئێمە لە کاتی خۆیدا، هەر کاتێك سەبارەت بە قەوارە یان پەرەسەندنی شتێك قسەمان دەکرد، سەبارەت بە سروشت یان کۆمەڵگا بووایە، وشیارانە یان ناوشیارانە پێرەویمان لە داروین دەکرد. پێش لە داروینیش پێرەوی لە نیوتون کراوە... بە کورتی ،

مۆنتسکیۆ بە روونی دەریخستووە کە ئینگلیزەکان ناچار بوون کە بە دوای پێکهێنانی هاوسەنگی لە نێوان دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، یاسادانان و قەزایی لە بەرانبەر یەکتر لە ڕێگای چاودێری کردنەکان و دیاریکردنی باڵانس بگەڕێن کە نیوتن وەك میکانیزمی حاکم بەسەر شتە ئاسمانییەکانی سەلماندبووی. دامەزرێنەرانی ئەمریکا پێڕەوییان لە گەڵاڵەیەك کرد کە مۆنتسکیۆ بە دووروودرێژی باسیکردبوو...[٤٥]

ویلیام بلاکتسون، مافناسی هەڵکەوتووی ئینگلیزی لە سەدەی هەژدەهەمیشدا، روانگەیەکی هاوشێوەی پێشکەشکرد کە هەریەك سێ تەوخم یان سێ دەسەڵاتی حکوومەتی، یەکتری کۆنترۆڵ دەکەن و ئازادی بەرهەمی کردەوە و دژە کردەوەی ئەم سێ هێزە لەسەر یەکتر:

"وەك سێ هێزی جیاواز لە جیهانی میکانیکدا، ئەوان ئەگەر بەتەنیایی چالاك بن، بە شێوەی هاوبەش مەکینەی حکوومەتی بەرەو ئاراستەیەکی جیاواز لەیەکتر پاڵ پێوەدەنێ، بەڵام ئاراستەیەك کە دیاریدەکرێ بەرهەمی بەشدارییەکەی ئەوانە و لە تەواوی جووڵەی ئەوان پێکدێ، ڕێڕەوی راستەقینەی ئازادی و ژیانێکی ئاسوودە بۆ کۆمەڵگا پێکدێنێ.[٤٦]

ڕەنگە لە تەفسیری گشتگیری کاریگەری نیوتن بەسەر تیۆری دابەشکردن وهاوسەنگی لە قەوارە حکوومییەکان، تاڕادەیەك زۆر زیادەڕەوی کراوە، چونکە بەراوردێکی بێ واسیتە لە نێوان جیهانی میکانیك و کۆمەڵگادا نییە، بەڵام بێ گومان، دۆزینەوەی یاسای ڕاکێشان، یەکێك لە هۆکارەکانی پاڵ پێوەنانی فیکری زیاتر بوو لەم بوارەدا. هەرچەندە ڕەگەکانی فیکری ئەم تیورییە بۆ سەردەمانێك پێشتر لە نیوتون دەگەڕێتەوە.

## شارل مۆنتسکیۆ و گەڵاڵەی گەورەی ناوبراو

زۆربەی ئەو بیروبۆچوونانەی کە مۆنتسکیۆ لایەنگری لێدەکردن، بەرەبەرە لەڕوانگە و دامەزراوەی نەتەوە خاوەن شارستانییەکاندا جێی گرتووە. مۆنتسکیۆ پشتیوانی لە ڕەوایی (Constitutionalism)، پاراستنی ئازادییە مەدەنییەکان، هەڵوەشانەوەی



کۆیلەیی.. هاوپەیوەندی نێونەتەوەیی،.. ڕێزلێنان لە نەریتە نەتەوەیی و خۆجێییەکان دەکرد. بڕوای بە عەدالەت و دەسەڵاتی یاسا هەبوو و لە ئازادی بیروبۆچوون و کۆبوونەوە پشتیوانی دەکرد. ناوبراو لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە هاوسەنگی و دابەشکردنی دەسەڵات چەکێکە دژی دەسەڵاتی سەرەڕۆیی تاکەکان، گرووپەکان، یان زۆرینە لە (دەسەڵات). لایەنگری یەکسانی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام نە تا ئەو جێگایە کە ئازادیی تاکەکەس بکەوێتە مەترسییەوە. لایەنگری ئازادی بوو، بەڵام نە تا ئەو ڕادەیە کە کارکردی ئەرێنی حکوومەت توشی پشێوی بکا. سەدەیەك پاش مەرگی ناوبراو، زۆربەی حکوومەتەکان و خەڵکی خاوەن شارستانییەتی ئەورووپا لانیکەم لە تیۆریدا خۆیان بە شەریك لە بیرۆکەی ئەودا دەزانی.

### ئایزیا بەرلین"دژی ڕەوت"[٤٧]

لە مێژووی نوێی ئەندێشە سیاسییەکاندا، ناوی مۆنتسکیو زیاتر لە کەسی دیکە لەگەڵ تیۆری دابەشکردنی دەسەڵاتدا پەیوەندی هەیە. لە نێو بیرمەندانی سەدەی هەژدەهەمدا ڕەنگە تەنیا بتوانین ئاماژە بە ڕۆسۆ بکەین کە سیمایەکی دیارتر لە ناوبراوی هەیە. ئەوەی کە ناوبراو لەهەڵسەنگاندنەکانیدا لە دابەشکردنی دەسەڵات لە سیستمی حکوومەتی لەئینگلیزدا بە هەڵەدا چوو، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە کاردانەوەی ناوبراو لەسەر سیاسەتمەدارانێك کە دامەزراوەی حکوومەتەکانی چەرخی نوێیان دارشتووە، دانەناوە. دەتوانین بڵێین کە مۆنتسکیۆ، زۆرتر لە ڕێبەرە سیاسییە چالاکەکان، کاریگەری هەبووە لە قەوارەی یاسا سیاسییە بنەڕەتییەکان.

مۆنتسکیۆ، گەڵاڵەی تیۆری خۆی بە وێنەکردنێکی تاریك لە ناخی مرۆڤ دەستی پێکرد. مرۆڤ لەم گەڵاڵەی ناوبراودا، هۆگرییەکی گشتی بە شەڕەنگێزی هەیە، هۆگرییەك نەگریس کە خۆی لە خۆپەرستی، تەماح و گەڕان بە دوای دەسەڵاتدا دەردەخا. مرۆڤ ئەگەرچی حەیوانێکی خاوەن هۆشە، بەڵام هەوا و هەوەسەکانی، بەرەو کردارگەلێکی ناڕاست ڕادەکێشێ. ئەم ناخە تێکەڵبووە بە هەوەس، لە چوارچێوەی سیاسەتدا ئاسەوارێکی خراپ بەجێ دێڵێ:

"ئەزموونی دوورودرێژ نیشانیداوە کە دەسەڵات سپێردرا بە هەر کەسێك، هەلی کەڵکی خراپ لێوەرگرتن بووە و تا ئەو جێگایە کە دەسەڵات و ئیمکانی بووە، چووەتە پێشێ".[٤٨]

سەرەرای ئەمەش، ئەم هۆگرییە بۆ کەڵکی خراپ وەرگرتن لە دەسەڵات دەتوانین بەهۆی یاسای بنەڕەتییەوە بەرتەسك بکەینەوە و وەك فەیلەسووفە یۆنانییەکان لەسەر ئەم بڕوایە بوون کە یاسای بنەڕەتی دەوڵەت کاردانەوەی جیددی هەیە. لەبەر ئەم هۆیە ناوبراو بەرهەمی خۆی بە شیکردنەوەی سێ جۆر لە دەوڵەت یانی کۆماری، سەڵتەنەتی و ئیستبدادی دەستپێدەکا. لەکۆماریدا، خەڵك خاوەنی دەسەڵاتن. لە سەڵتەنەتدا، تاکەکەس بەتەنیایی لە ڕێگای یاساکانی دیاریکراو و پەسەندکراو حوکم دەکا و لە حکوومەتی ئیستبدادیدا، تاکەکەسێکی سەرەڕۆ، تەواوی کاروبارەکان بە پێی ئیرادە و حەزەکانی خۆی بەڕێوە دەبا. بەپێچەوانەی فەیلەسووفە سیاسییەکان کە لە باسە تیۆرییەکانی خۆیاندا، بەرەو ئاراستەیەکی بە تەواوی تیۆری دەرۆیشتن، مونتسکیۆ، وەك پۆلی بیوس، تیۆری سیاسی خۆی بەپێی خوێندنەوەیەکی وردی حکوومەتەکانی رابردوو و حکوومەتەکانی کاتی خۆی دارِشت. لە چوارچێوەی تیۆریدا و زۆرتر قەرزداری فەیلەسووفە یۆنانییەکان بەتایبەت ئەرەستوو و پولی بیوس و ماکیاڤیلی لە سەردەمی دواترە. کاریگەری فیکری ئەرەستوو و پولی بیوس لە پێشکەشکردنی چوارچێوەی فیکری بۆ حکوومەتێکی تێکەڵاو بوو و لە ماکیاویلی ئەم بیرۆکەی وەرگرت کە لە نێوان کۆماری ئەریستوکرات و کۆماری دیموکرات جیاوازی دابنێ. بە پێچەوانەی ئەرەستوو و پولی بیوس کە حکوومەتەکانیان بە شێوەی سەرەڕۆ، ئولگاریشی و دیموکراسی پۆلێن بەندی دەکرد، مۆنتسکیۆ بە کاریگەری لە ماکیاویلی، دیموکراسی و ئەریستوکراتی لە چوارچێوەی چەمکێکی بەربلاوتر لە کۆماری دانا. ناوبراو بە تێکەڵکردنی ئەریستوکراتی و دیموکراسی لە چەمکی بەربلاوتری کۆماری و جێگرکردنی باسی کۆماری دیموکراسی لە ڕیزی پێشەوە، لە راستیدا ئەنجامگیرییە کە لە گرنگی کۆماری دیموکراسی لە نێوان ئەم دوو شێوازە و دەڵێ کە هەرچی ئەریستوکراتی سنووری خۆی بۆ دیموکراسی ئاوەڵا دەکاتەوە، بە



هەمان رادەش بەرەو کەماڵ نزیکتر دەبێتەوە و هەرچی ئەریستوکراتی خۆی لە سەڵتەنەت نزیکتر بکاتەوە بەرەو کەم و کوڕی دەڕوا.[٤٩]

" هەر بۆیە بنەماڵە ئەریستوکراتەکان دەبێ هەرچی بۆیان بکرێ لە نێو کۆمەڵانی خەڵك بێنە دەرەوە ... و ناتەواوترین حکوومەتی ئەریستوکرات ئەوەیە کە بەشی هەرە زۆری فەرمانبەرانی نەتەوە، کۆیلە و لە لایەن فەرمانڕەوایانەوە کڕدرابن،[٥٠] کە بۆ خۆی وە بیرهێنەرەوەی دابەشکردنی ئەریستۆکراتە بە ئەریستوکراتی میراتی و ئەریستوکراتی سروشتییە لە تیۆری کۆماری جەیمز هرینگتون لە (oceania).[٥١]

باشترین کۆماری ئەریستوکراتیش لە روانگەی ناوبراوەوە ئەوەیە کە لایەنی وەلانراو لە دەسەڵات ئەوەندە بچووك بێ کە ئەریستوکرات، قازانجێکی ئەوتۆ لە چەوسانەوەی ئەوان دەست نەکەوێ. مۆنتسکیۆ، زۆرتر وشەگەلی ئەریستوکرات و دیموکراسی بەکاردەبرد هەتا کۆماری دیموکراسی یا کۆماری ئەریستوکراتیك. بەکارهێنانی ئەم وشانە بۆ پێشکەشکردنی وێنەیەکی تیۆریك بوو، ئەگینا بۆ خۆی دەیزانی کە لە جیهانی راستەقینەدا، حکوومەتەکان تێکەڵاون نە حکوومەتی ئەریستوکرات رووت و پەتی و حکوومەتی دیموکراسی رووت و پەتی.[٥٢]

بە سەرنج دان بەکاریگەری ماکیاویلی و مۆنتسکیۆ لەسەدەی هەژدەهەم، هەروەها تایبەتمەندی دژی ئەریستوکراتێکی خەلکی وڵاتانی موستەعمەرە لە شۆڕشی ئەمریکا، بیرۆکەی دوورە پەرێزی لە کۆماری ئەریستوکرات و پێکهێنانی کۆماری دیموکراسی، لەسەر ئەندێشەی کەسانێك کە لە کۆنوانسیۆنی یاسایی بنەڕەتی ئەمریکادا بەشدارییان کردبوو، زاڵبوو. مۆنتسکیۆ وەك ژانژاك رۆسۆ، پێی وابوو کە دیموکراسی یان ئەوەی کە ئاراستە سیاسییەکانی چەپ وەك دیموکراسی راستەوخۆ باسیان لێوە دەکرد، تەنیا لە چوارچێوەی دەوڵەت- شارێکدا جێبەجێ دەبێ و بۆ دیموکراسی لە پێوانەی گەورەی وڵاتێکدا یا سەرزەوییەك بە پانتایی کیشوەرێك، دەبێ بیر لە ئامرازی دیکە بکرێتەوە کە دەتوانین سێبەری تیۆری "حکوومەت لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی"ی جان لاك لەودا ببینن. ئەم گوتارە، چەند دەیەی دیکە بووە یەکێك لە

کێشە فیکری و سیاسییەکانی نێو فیدرالیستەکان و دژی فیدرالیستەکان لە نێوان دامەزرێنەرانی ئەمریکا.

**مۆنتسکیۆ دەنووسێ:**

"کۆماری، بەپێی نێوەرۆکی خۆی، پانتایی سەرزەوییەکی بچووك دادەپۆشێ. بێجگە لەم حاڵەتە، بە ئاسانی ناتوانێ درێژە بە تەمەنی خۆی بدا. لە کۆمارێکی گەورەدا، سەروەت و سامانێکی زۆر هەیە و لەبەر ئەم هۆیەشە لە زەینی مرۆڤەکان دەتوانین کەمێك راستی ببینین. سەرچاوەی کۆمارێکی گەورە، گەورەتر لەوەیە کە بگاتە دەست هاوولاتییەکی تەنیا. چونکە قازانج و بەرژەوەندی (ئەم کۆمارە) لەو حاڵەتەدا بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر، دەبێتە قازانجی تاکەکەس."[٥٣]

نزیك بە پەنجا ساڵ دواتر، جورج میسون (George Mason). نوێنەری هەرێمی ڤێرجینیا لە کونوانسیۆنی یاسایی بنەڕەتی ئەمریکا، کە بەڵگەی هێناوە دژی جەیمز مادیسون، هەمان ئەندێشەی مۆنتسکیۆی باس دەکرد کە:

" لە مێژووی ناسراوی مرۆڤایەتی، هیچ حکوومەتێك لە ولاتێکی پان و بەرین نییە کە ئازادیی خەڵکی لەنێو نەبردبێ. بەوجۆرە کە نووسراوەی هەڵکەوتووترین مێژوونووسان سەلمێنەری ئەم بۆچوونەیە، مێژوو نیشانی داوین کە سەڵتەنەت رەنگە بە حکوومەت لەسەر زەوی گەورە و حکوومەتی سەرەرۆ بە حکوومەت لە ولاتێکی پان و بەرین سازگاربێ، بەڵام حکوومەتی خەڵکی، تەنیا دەتوانێ لەسەرزەوی گەلێکی بچووکتر بوونی هەبێ". [٥٤]

به پێچەوانەی مونتسکیۆ کە پێی وابوو دوو شێواز لە ئازادیی لە دوو پێوەری جیاوازدا، یانی دیموکراسی راستەوخۆ لە پێوەری دەوڵەت- شار و دیموکراسی نوێنەرایەتی لە پێوەری ولاتێکی گەورەدا جێبەجێ دەبێ و دەیگوت کە ئەگەر دووشێواز لە ئازادی بوونی هەبێ، دەبێ دووشێواز لە دیموکراسی بۆ رێکخستن لەگەڵ ئەوانیش بێ، رۆسۆ، بەوردی لە رێگای لایەنگری لە دیموکراسی و ئەزموونی ئەو لە دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنان، بەتایبەت ئەزموونی شاری خۆی ... کە حکوومەتی



نوێنەرایەتی رەتکردەوە، لەبەرئەوەی حکوومەت پێی وابوو لە ئاستی ولاتێکی گەورەدا بەناچار لەگەڵ حکوومەتی نوێنەرایەتی پەیوەندی هەیە.

" ئەو کاتە کە خەڵك ئیزن بە خۆیان دەدەن کەکەسێك نوێنەرایەتییان بکا، چی دیکە ئازاد نین. ئازادییەك لە ئارادا نامینێ. هەربۆیە بە سەرنجدان بەو هەموو لێکۆڵێنەوانە کردوومە، پێم وانییە کە حاکم(Sovereign)}یانی خەڵك{بتوانێ لە نێو ئێمەدا، مافی خۆی بەکاربێنێ مەگەر ئەوەی کە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەو زۆر بچووك بێ". [٥٥]

تۆماس جفرسۆن لە بیرەوەرییەکانی خۆی سەبارەت بە مونتسکیۆ و بەرگەنەگرتنی کۆمار لە ئاستێکی گەورە، کە لە نامەی خۆیدا بۆ دستات دوتراسی (Destutt de tracy)[٥٦] رەخنە دەگرێ و دەڵێ کە نووسراوەکانی مۆنتسکیۆ وەك هەموو بیرمەندێك، جیاوازی و بنەمای نابەجێ کە بەکار بردووە، زۆرە و نووسراوەکانی پڕن لە هەڵە. جفرسۆن نووسیویەتی کە ئەم بۆچوونەی مونتسکیۆ کە کۆمار لەو دوڵەتانەی کە لە رووی جوغرافییەوە بچووکن دەتوانی مانا پەیدا بکا، لە کردەوەدا بە ئەنجام ناگا. [٥٧]

هەڵسەنگاندنی مۆنتسکیۆ لە دابەشکردنی دەسەڵات لە ئینگلیز و سیستەمە سیاسییەکەی بۆ خۆی هەڵەبوو و شێوازێکی ئیدەئالیزەی پێدا، کە دەگوترێ تەنانەت ویلیام بلاکستۆنیش توشی هەڵە کرد. سەرەڕای ئەمەش، مونتسکیۆ حکوومەتی ئینگلیز زۆرتر وەك کۆمارێك دەدی هەتا وەك حکوومەتی سەڵتەنەتی تێکەڵاو و بە چەند لایەنێك لە کۆماری. یانێ ئەوی وەك کۆمارێکی شاردراوە و داپۆشراو لە سەڵتەنەتدا دەدی.

ئەگەرچی لە کاتی ژیانی مونتسکیۆ، پارێزگارەکان هۆگرییەکی ئەوتۆیان پێ نەبوو، چونکە زۆر سەبارەت بە ئازادی و نەبوون یان کەم بوونی ئەو لە فەرەنسا قسەی دەکرد، بەڵام بیرمەندانی لیبراڵ وەك دیدرۆ، لە ئەندێشەکانی مۆنتسکیۆ، سەرچاوەیەك بۆچوونی رادیکاڵ دەدی.

بەڵام دستات دو تراسی، لە گۆشەی رادیکالیزمی کۆماریخوازی، لە بەرهەمەکەی خۆی بەناوی "Conmentary" لە دابەشکردنی سەڵتەنەت و سەرەرۆیی لە یەکتر،

بەوجۆرە کە مونتسکیۆ ئاماژەی پێ کردبوو، دستات دو تراسی، ڕەگی ئەو دوو دیاردەیە پێکەوە گرێدەدا و دەڵێ کە سەرەڕۆیی هەمان سەڵتەنەتە بە شێوازێکی درەندانەتر و پاشان دەڵێ کە "سەرەڕۆیی یانی حکوومەتی یەك کەس... یانی کۆکردنەوەی دەسەڵات لە دەستی تاکەکەسێك... و ئەگەر چەمکی ڕاستەقینەی وشە لەبەرچاو بگرین، سەرەڕۆیی یانی سەڵتەنەت".(٥٨)

ئەگەر نەوەیەك لە بیرمەندان، لە بۆچوونەکانی مۆنتسکیۆ ڕەگی ئەندێشە گەلی ڕادیکالیان دەدی، نەوەیەکی دیکە وەك دستات دو تراسی، مادام هلوتیوس، کندرسە و دوپون، لایەنگرانی ناوبراو لە سەڵتەنەتیان کۆنەپەرستانە دەزانی. سەرەڕای ئەمەش، ئەزموونی ئینگلیز، یەکێك لە سەرچاوە فیکرییەکانی مونتسکیۆ بوو نەتەنیا سەرچاوەی ئەو. دەتوانین بڵێین کە وینز، یەکێك لە سەرچاوەی گرنگی خوێندنەوەی ناوبراو بوو لەسەردەمی ئەودا و بەهۆی حکوومەتی تێکەڵاوی خۆی، هەروەها بەهۆی بوونی ئاسوودەیی ژیان لەودا، جێگای سەرنج بوو. لەڕاستیدا "وینز" پردێکی مێژوویی لە نێوان کۆماریخوازی کلاسیك و جیهانی نوێیدا پێکدەهێنێت.(٥٩)

لە سەرەتای سەدەی یازدەهەم دەسەڵاتی دەزگای بەڕێوەبەری لە وینز بەرتەسك ببووەوە و لە سەردەمی مۆنتسکیۆ، سەرۆکی دەزگای بەڕێوەبەری زۆرتر وەك زیندانییەك لە کۆشکی حکوومەتی دەچوو. ئەگەرچی حکوومەتەکەی تێکەڵاو بوو، بەڵام ئەریستوکرات لەودا قورساییەکی زۆری بوو و هەر لەم گۆشەیەوە بوو کە ناوبراو پشتیوانی لە دەسەڵاتێکی بەڕێوەبەری بەهێزتر لە بەرانبەر ئەریستوکراتەکان دەکرد. مۆنتسکیۆ بۆخۆی زۆرتر لایەنگری حکوومەتێکی ئەریستوکرات بوو تا دیموکراسی، چونکە پێی وابوو کە حکوومەتێکی ئەریستوکرات دەتوانێ سەقامگیری سیاسی پێك بێنێ، بە مەرجێك لە ڕێگای دابەشکردنی دەسەڵات و بوونی قورساییەکی بەرانبەر، دەسەڵاتی بەرتەسك بێتەوە. لە ئاکامدا ناوبراو گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە دابەشکردی دەسەڵات لە وینز، تەواو نییە، چونکە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و خەڵکی ئاسایی، ئامرازێکیان بۆ کۆنترۆڵ نییە و حکوومەتی تێکەڵاو، تەنیا ئەریستوکراتێکی



بەهێز و ئۆلیگارشی نوێنەرایەتی دەکا. ناوبراو دەنووسێ کە لە یاسای بنەڕەتی وینز، ئەگەرچی هەرسێ دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، یاسادانان و قەزایی لە یەکتر جیاوازن و دەسەڵاتی قەزایی لە نێو چەندین دادگا دابەشبووە کە یەکتر هاوسەنگ دەکەن، بەڵام کارەسات لەمەدایە کە ئەم دادگا جیاوازانە(ئەنجوومەنی گەورە، سەنا و ئەنجوومەنی چل کەسی) هەموویان لە دەستی هەمان گرووپی کۆمەڵایەتیدا کۆبووتەوە.(٦٠)

دابەشکردن لە دەسەڵاتی حکوومەتیدا، تەنیا تۆخمی دیارکەر لە فەلسەفەی سیاسی مۆنتسکیۆ نەبوو، بەڵکو دابەشکردنی لە باری دەسەڵاتی حکوومەتی لە نێو گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان بوو کە بەم دابەشکردنە، ڕووی ڕاستەقینەی پێ بەخشی:

" لە تورکیا کە ئەم سێ دەسەڵاتە لە دەست شادایە و لەشوێنێکدا کۆبووتەوە، سەروەرییەکی سەرسوڕهێنەر دەسەڵاتدارە... دەسەڵاتدارانی کە لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەری یاسان، دەسەڵاتی داڕشتنی یاساشیان هەیە... و لەبەرئەوەی خاوەنی دەسەڵاتی بڕیاردانان، بە بەڕێوەبردنی ئیرادە تایبەتییەکانی خۆیانیش دەتوانن خەڵك لە نێو بەرن. لە بارودۆخێکی ئەوتۆ، ئەگەر چی نیشانەکانی ڕواڵەتی سەرەڕۆیی کە دەرخەری شایەکی زاڵمە، نابینرێ، بەڵام بوونی سەرەڕۆیی هەستپێدەکرێ، چونکە تەواوی دەسەڵات لەشوێنێکدا کۆبووتەوە"یان" لە کۆماری ئیتالیا کە ئەم سێ دەسەڵاتە لە شوێنێکدا کۆبووتەوە، ئازادی کەمتر لە وڵاتانی سەڵتەنەتی ئێمەیە"(٦١) و هەر شایەك کە ویستویەتی سەرەڕۆیانە حوکم بکا، سەرەتا تەواوی ئیرادەکانی خستۆتە دەست خۆی".(٦٢)

دەتوانین بڵێین کە ئەم شێوە ڕووانینە بەرانبەر بە قەوارەکانی حکوومەتی بوو نە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتداری کە لە خولێکی دیکە، دامەزرێنەرانی ئەمریکا و داڕێژەرانی یاسای بنەڕەتی فیدراڵ، پشتیان بە مونتسکیۆ وەك یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکان بەستووە.

مۆنتسکیۆ وتبووی کە مرۆڤەکان مێژووی خۆیان دروستدەکەن و ڕابردوویان بەپێی هۆکارە گشتی و تایبەتییەکانی خۆیان دەتوانن ببینن. ناوبراو دەیویست پێش بە کەڵکی خراپ وەرگرتنی ئەوانە بگرێ کە پێیان وابوو کە قەزاوقەدەر یان خواستی

ئیلاهی بەسەر کردەوەی مرۆڤەکاندا حاکمە. فیدرالیستەکان لە مونتسکیۆ، نــە تــەنیا راڤەی حکوومەتە جۆراوجۆرەکانیان وەرگرت، بەڵکو دەستیان دایە گەڵاڵەکردنی قەوارە گەلێك لە دامەزراوەکان کە لە مێژوودا وێنەی نەبووە.[٦٣]

قورسایی مێژوویی دیاری کردنی هێڵ و سـنووری وردی قـەوارەکانی کۆمـاری لـە تەواوەتی خۆیدا، هەروەها خاڵی لاوازی تیۆریی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لـە کۆمـار لـە جیهانی مۆدێرندا بوو کە دەڵێ لە ئەستۆی کونوانسیۆنی یاسای بنـەڕەتی ئـەمریکا دانراوە هەتا خاڵی وەرچەرخانی نوێ لە روانگەی تیۆرێك پێکبێ.

## دابەشکردنی دەسەڵات و دامەزرێنەرانی ئەمریکا

نزیکـەی سـێ دەیـە دوای بڵاوبوونـەوەی"روح القـوانین"، راگەیەنـدراوی مـافی ڤێرجینیا" لە ١٧٧٦کە لەلایەن جۆرج میسون نووسرابوو و لەلایەن کۆمەڵی یاسـای بنەڕەتی ڤێرجینیا پەسەند کرابوو، شێوازی حکوومەتی هەرێمی ڤێرجینیایان دیاری کرد کە بەندە سەرەتاییەکانی ئەو، لە دارشتنی راگەیەندراوی سەربەخۆیی لە لایـەن توماس جفرسون رەنگی داوەتـەوە. زمـان و قـەوارەی نووسـینی ئـەو لـە دارشـتنی "راگەیەنـدراوی مـرۆڤ و هاوولاتییـان" لـە شۆڕشـی فەرەنـسا، هـەروەها لـە دارشـتنی"بەیاننامـەی مـاف" (Bill of Rights) لەلایـەن جـەیمز مادیـسون کاریگەرییـەکی بەرچـاوی هـەبووە. راگەیەنـدراو، بـە راشـکاوییەکی تـەواوەوە، رادەگەیەنێ کە "دەسەڵاتەکانی یاسادانان، بەڕێوەبەری دەوڵەت، هەروەها دەسەڵاتی قەزایی، لە یەکتر جیاوازن، هەتا هیچ یەك لەم دەسەڵاتانە، لە دەسـەڵاتی هێزێکـی دیکە کەڵك وەرنەگرێ و هیچ کەسێك لە یەك کاتدا، زیاتر لە یەکێك لەم دەسەڵاتانە بتوانێ بەڕێوەبەرێ".[٦٤]

ئەم راگەیەندراوە کە هەرێمی ویرجینیا ئەوەی وەك بناغـەی سیاسـی حکوومـەتی خۆی دانا، روونترین و بێ وێنەترین دەربڕینی تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات تا ئەو بووە کات لە مێژوودا.



پاش راگەیەندراوی سەربەخۆیی، هەرێمەکانی دیکەش بەرەبەرە، یاسای بنەڕەتی خۆیان پەسەند کرد و لەکاتی باسکردنی پەیوەندیدا بە یاسای بنەڕەتی فیدراڵ لـە دە ساڵی دواییدا، داڕێژەرانی یاسای بنەڕەتی ئەمریکا، کەرەستە و بەرژەوەندی فیکری و یاسایی جێگای سەرنجیان لە بەردەست دابـوو. زەینیـەتی زاڵ بەسـەر ئەندێـشەی سیاسـی خـەڵکی ئـەمریکا بەشـێوەی گـشتی، وێکـچوونی زۆری لەگـەڵ بیرۆکـەی حکوومەتی تێکەڵاو لە ئینگلیز هەتا نیوەی سـەدەی حەڤدەهـەم بـوو، چـی دیکـە وەڵامدەر نەبوو و وەڵامێکی نوێی دەخواست. ئەگەر حکوومەتی تێکەڵاو بـە نـاوی سەڵتەنەت وەك پـێش قـەراوڵی دەسـەڵاتی بەڕێوەبـەری پەیوەنـدی بـە تیۆرەکـانی پێشووی دابەشکردنی دەسەڵات بووایە، شۆڕشی ئەمریکا، تەنیا بەمانای پچڕانی لە ئیمپراتۆری بەریتانیا نەبوو،بەڵکو گرنگتر لەوە، پـچڕانی مێـژوویی حکوومـەت لـە سەڵتەنەتیش بوو و لە بەرانبـەر هـەرجۆرە بووژانـەوەی دام و دەزگـای سـەڵتەنەت، بەرگرییەکی جیددی لە ئارادابوو.

شۆڕشی ئەمریکا، تیۆری دابەشکردنی دەسەڵاتی کە لە جیهانی کۆن تا ئەو رۆژەی کە وەك حکوومەتی تێکەڵاو خـولی خواردبـوو، لـە دوایـین مەشـخەڵداری سـەردەمی خۆی، شارل مونتسکیۆ وەرگرت. ئیتر کـاتی ئـەوە هـاتبوو بـە خـودی مونتـسکیۆ و هەموو بیرمەندانی پێشووی مێژوو، بسپێردرێ بە یـادەوەری مێـژوو و تیـۆری لەسـەر بناغەی نوێ دابمەزرێ:

دابەشکردنی لە سیستمی حکوومەتی بەپێی کۆماری کە لەودا تیۆری دابەشکردنی دەســەڵات لەســەر بنــەمای ئەســڵی دەســەڵاتداریتی خــەڵك، بــەبێ ســەڵتەنەت و ئەریستوکراتی، یانی دوو توخمی سەرەکی لە بیرۆکـەی حکوومـەتی تێکـەڵاو، بـەڕێوە بچێ. بونیادەکان کە دامەزرێنەرانی ئـەمریکا پێکیـان هێنـابوو، زۆر جیـاوازبوو لـە هەڵسەنگاندنەکانی بیرمەنـدانی پێـشوو لەوانـە خـودی مونتـسکیۆ لـە دابەشـکردنی دەسەڵات. ئەگەر چی ئەندێشەی سیاسی ئەمریکا کاریگەری بەرچاوی لـە نووسـەرانی کلاسـیك وەرگرتبـوو، بـەڵام نووسـەرانی کلاسـیك، ترسـیان لـە دەسـەڵاتی گـشتی

حکوومەت نەبوو، بەڵکو ترسیان لە دەسەڵاتی بێ سنووری هەریەك لە سێ لقی سەڵتەنەت و ئەریستوکرات و دیموکراسی(خەڵك)بوو. ئەوان لە دەسەڵاتی تاکەکەسێك یان هەوڵی ئەو بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵاتی زۆرتر دەترسان نە لە ئیمکانی دەست درێژی حکوومەت بۆ سەر خەڵك. ئێستاکە دامەزرێنەرانی ئەمریکا دوو ئەندێشەی گرنگ لە ویکەکان لە ئینگلیز بە میرات بردووە: پێ داگرتن لەسەر مافی تاکەکەس و ئەو ئەندێشەیەی لەگەڵی دایە واتە ترسی هەمەلایەنە لە دەسەڵاتی حکوومەتی. لە ئاکامدا، هەلی کۆنترۆڵی ئەو لە لایەن هاوڵاتییان، یەکێك لە سەرەکی ترین باسەکانی نێوان دامەزرێنەران بوو.(٦٥)

تیۆری حکوومەتی تێکەڵاو و دابەشکردنی دەسەڵات کە لەراستیدا هێڵی فیکری سەرەکی لە سەردەمی ئەفلاتون و ئەرەستوو تا سەرەتایی شۆڕش لە ئەمریکا پێکدەهێنا لەسەر بنەمای هاوسەنگی چینەکان و توێژە کۆمەڵایەتییەکان هەڵکەوتووە، لەحاڵێکدا کۆماری نوێ کە شکڵی دەگرت، دابەشکردنی دەسەڵاتی لە سیستمی حکوومەتی لە پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ چینەکان و لەئاکامدا لە چەمکی هاوسەنگی چینەکان و بەشداری راستەوخۆی ئەوان لە نێو قەوارەی حکوومەت وەك ژێرخانی تیۆری دابەشکردن، جیاکردەوە و ئەوی بەپێی هاووڵاتی بەرانبەر دانا. دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، بەجێی میراتی بوون، بووە هەڵبژاردن و کۆنگرە(یاسادانان) و، لەسەر کار لابردنی بەدەست هێنا و دادگاکان دەسەڵاتی بەرچاویان سەبارەت بە کارکردی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و دەسەڵاتی یاسادانان و تەفسیری یاسا بە دەست هێنا.(٦٦)

شۆڕشی ئەمریکا لە بارودۆخێکدا بەڕێوەچوو کە چوارچێوەی سروشتی ئەمریکا، خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکانی لە حاڵەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی نالەبار راگرتبوو. هەریەك لە هەرێمەکان، زۆرتر بە شێوەی ستوونی لەگەڵا حکوومەتی ناوەندی لە ئینگلیزدا لە پەیوەندی دابوون هەتا کە لەگەڵ یەکتر. پەیوەندییەکی نیمچە فیدراڵی، ناوەندی ئیمپراتۆری لەگەڵ یەکەیەکەی هەرێمەکان، تێك گرێدەدا. ئەوان دادگا و پەرلەمانی خۆجێی خۆیان بوو و دادگای سەڵتەنەتی لە ناوەند وەك دادگای پێداچوونە



سەیری دەکرا. هەرچەند کە کۆمەکێك پەیوەندی، وەك تەسلیم کردنەوەی تاوانباران و کوێلە هەڵاتووکانی لە نێوان خەڵکی هەرێمە جۆراوجۆرەکان هەبووە، بەڵام پەیوەندی تاکەکەسی لە نێو خەڵك، پتەوتر بوو لە پەیوەندی ئاڵۆزی یاسایی هەرێمەکان. سەرەڕای ئەمانەش، ئیمپراتۆری بەریتانیا، خاوەنی سێ لایەنی گرنگ نەبوو کە بتوانێ بیکاتە حکوومەتێکی فیدراڵ خاوەنی یاسایەکی بنەڕەتی نووسراو کە دەسەڵاتی سیاسی، بەڕێوەبەرانی کاروبارەکان لەسەر بنەمای ئەو دابڕێژێ نەبوو. دووەم نەبوونی رۆڵی حکوومەتی خۆجێی لە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان، هەرچەندە کە بەشداری تێیدا دەکرد. سێیەم پەیوەندی لاوازی یاسایی لە نێوان هەرێمەکان، کە زۆریش دۆستانە نەبوو.

تا ١٧٦٠، سێزدە کۆمەڵگای هەرێمی، هەستیان بەوە دەکرد کە فەرهەنگی هاوبەش کە بە جێ ماوی ئیمپراتۆری بەریتانیا بوو، دەبێتە هۆی یەکگرتنیان، بەڵام جیاوازی سیاسی و ئابووری کە لەلایەن وڵاتی دایکەوە پەرەی پێ دەدرا، ئەوانی بەرەو جیایی پاڵ پێوە دەنا. لەم رووەوە، ئەزموونی دەسەڵاتی بەریتانیا، ئەم باوەڕەی دروستکرد کەتێکەڵکردنی ناوچە داگیرکراوەکانی هاوسنووری یەکتر، ئاکامەکەی حکوومەتێکی سەرەڕۆیە و ئەگەر ناوچەیەکی داگیرکراوی گەورە، دابەشبکرێ، نیشانەی حوکم کردنی خەڵك و ئازادی زۆرتر و یاسادانانی بەهێزی خۆجێی و کۆنترۆڵی لاوازیی ئیمپراتۆرییە.

مێژووی ئەمریکا لە راستیدا بە رووخانی ئەم پەیوەندییە نیمچە فیدراڵییەی ئیمپراتۆری لەگەڵ خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان دەستیپێکرد. پەرلەمانی بەریتانیا لە ١٧٧٠ بە پەسەند کردنی Declaratino Act ئەم ناوچە داگیرکردنانەی لانیکەم لەسەر کاغەز، پلە و پێگەیانی هەتا خوارتر لە شارەوانییەکان هێنایە خوارەوە کە ئیرادەی هاوبەشی لە نێو ئەواندا بوو شۆڕشی پێکهێنا.(٦٧)

بە سەرکەوتنی شۆڕش، دەسەڵات لەسەرەوە بۆ یەکەیەکەی هەرێمەکان گوازرایەوە و جووڵە لە دەسەڵاتی سێزدە هەرێم بۆ سەرەوە و حکوومەتێکی ناوەندی هێشتا پێك

نەهاتبوو. ترس لە مەترسی هاوبەش، زۆرتر لە هۆگری هاوبەشی ئەوان بە یەکتر، ببووە هۆی هاوکاری ئەوان لەگەڵاً یەکتر. ئەگەر مەسەلەی شەڕ، دەبووە هۆی نزیکی ئەوان، کۆتایی شەڕیش دەیتوانی کۆتایی بەم هاوکارییە بێنێ.

سروشتییە خەڵکێك کە چەك بە دەست دژی حکوومەتی ناوەندی ئیمپراتۆری شۆڕشیان کردووە، گومانیان بوو کە حکوومەتێکی ناوەندی دیکە لە جێی دابنێن و لە یاسای بنەڕەتی هیچ یەك لە هەرێمەکان ئاماژە بە پێویستی بوونی دامەزراوەیەك لە نێوان هەرێمەکان نەکراوە.

بە پەسەند کردنی ڕاگەیەندراوی سەربەخۆیی، گۆڕانێکی بەرچاو لە ئەسڵی دەسەلات پێکهات و دادگایی خودموختاری بەرتەسك، ئێستا بووەتە خواستی تەواوی دەسەلات کە لە یاسای بنەڕەتی هەریەك لە هەرێمەکان ڕەنگی داوەتەوە. هەربۆیە، سێزدە هەرێم کە ڕاگەیەندراوی سەربەخۆییان ئیمزا کردبوو، خاوەنی دەسەلاتی بەڕێوەبەری ناوەندی نەبوون و پەیوەندی نێوان هەرێمەکانی کۆنفیدراڵ، زۆرتر وەك کۆمیتەی پەیوەندی نێونەتەویی دەچوو هەتا حکوومەتێکی ناوەندی کە ڕاگەیەندراوی سەربەخۆیی گرەنتی بکا.[٦٨] لە بەرانبەردا هەرێمەکان سکالانامەیان دژی ماف و سنوورەکانی یەکتر تۆمار دەکرد و دژی یەکتر بەهەمان توندوتیژی دژی ئیمپراتۆری قسەیان دەکرد. زاڵبوون بەسەر ناوچەگەرایی، ئەندێشەیەکی دیکەی دەخواست: شێوازێکی دیکە لە دابەشکردنی ئاسۆیی دەسەلات لە دەزگای حکوومەتی و تێکەڵاوکردنی لەگەڵ دابەشکردنی ستوونی دەسەلات لە نێوان هەرێمەکان و حکوومەتی ناوەندی کە لەودا نەتەنیا دەسەلاتی هەرێمەکان حکوومەتی ناوەندی یەکتری کۆنتڕۆڵ بکەن، بەڵکو هەر هەرێمێك لە چوارچێوە گەلێك لە دەسەلات چاودێری بەسەر هەرێمەکانی دیکەدا بکا و ئەمە پێویستی بە داڕشتنی سیستمی نوێ و دابەشکردنی دەسەلات بەشێوەی نوێ لە مێژوودابوو: فیدرالیزم.

سەرەڕای ئەمانەش، دوو ئاراستەی گرنگی فکری لەم قوناغەدا لەبەرانبەر یەکدا ڕاوەستان: فیدراڵیستەکان لە ژێرناوی پابلیوس (Pablius) و دژی فیدراڵیستەکان بە



ئیمزای بروتۆس(Brotus)، بیروبۆچوونەکانی خۆیانیان باسدەکرد. هەم بنجامین فرانکلین و هەم پابلیۆس، پێیان وابوو کە داهاتووی ئیمپراتوری لە ئەمریکا، تەنانەت پێش لە شۆڕشی ئەمریکا دەستیپێکردووە کە دەبێ خۆمان لە بەرانبەریدا بپارێزین. نووسەرانی پابلیوس دڵنیابوون کە ئەمریکا لەڕووی شێوازی ماددی و مەعنەوییەوە، زۆر زیاتر لە دونیای کۆن گەشەی کردووە و زانستی سیاسی فێری کردووە کە مێژوو تێپەڕ بکەن[٦٩]. کۆنوانسیۆنی یاسای بنەڕەتی لەڕاستیدا پێکهاتبوو لە هەرێمە سەربەخۆکان کە یاسای بنەڕەتی خۆیان لە نێوان ساڵەکانی ١٧٧٦ـ ١٧٨٤ی هەرێمەکان، دارشتبوو و لەهەموویاندا ئۆرگییەکی ئاشکرا بۆ دابەشکردنی دەسەلات دەبینرا. لەحالێکدا خاڵەکانی پلاتفۆرمی کۆنفیدراسیۆن، هەڵگری دابەشکردنێکی ئەوتۆ نەبوو. چونکە بەپێی خاڵەکانی پلاتفۆرمی کۆنفیدراسیۆن( Confederation of Articles)، هەرێمەکان، دەسەلات، سەربەخۆیی و ئازادی، ماف و دەسەلاتی قەزایی لە چوارچێوەی هەرێمەکان دابوو. لە داڕشتنی بناغەی سیستمی فیدراڵ لە ئەمریکا، دەتوانین دوو تەوەری سەرەکی لێك جیابکەینەوە: پێکهێنانی سیستمی فیدراتیو لەسەر بناغەی دابەشکردنی دەسەلات لە دوو ئاستی هەرێمی و فیدراڵ و مەسەلەی هەلی دابەزاندنی دیموکراسی لە ئاستی وڵات بە پانتایی ئەمریکا.

ئەندێشەی زاڵی سیاسی تا ئەو کات ئەوەبوو کە حکوومەتێکی دیموکراسی و خەڵکی، بۆ ئەوەی بتوانێ کاریگەر بێ، دەبێ چوارچێوەیەکی بچووکی هەبێ و قورسایی و ئۆتۆریتەی بیرمەندانی سیاسی رابردوو، دژی بوونی حکوومەتی ئازاد لە حکوومەتێکی گەورەدا بوون. هەروەها لەسەدەی نوزدەهەمدا، بیرۆکەی زاڵ ئەمە بوو کە دیموکراسی یان حکوومەتی خەڵکی، وشەیەکی شوومە ماناکەی یانی هەرج و مەرج، توندوتیژی، ناسەقامگیری، حکوومەتی خەڵك و شۆڕشی خوێناوی.

ئەرەستوو وتبووی کە ئەگەر قەرار بێ هاووڵاتییانی دەوڵەتێك نێوبژیوانی بکەن و پلەوپایەی دەوڵەتی بەپێی لێوەشایی دابەشبکەن، دەبێ تایبەتمەندی یەکتر بناسن. چونکە لە دەوڵەتێکی گەورە دا، بڕیارەکان و هەڵبژاردەکان، بە ئاشکرا بەشێوەی

نارێکوپێك بەڕێوەدەچێ کە لەراستیدا نابێ وابێ و دڵخوازترین ژمارەی حەشیمەت لە گەورەترین دەوڵەت لە روانگەی ناوبراو ئەمەبوو کە مرۆڤ بەروانینی ساکار بتوانێ هەموویان ببینێ.(٧٠)

مۆنتسکیۆش کە پاش جان لاك، زۆرترین کاریگەری هەبووە لەسەر دامەزرێنەرانی ئەمریکا، بۆچوونێکی هاوشێوەی پێشکەش کردبوو:

" لە کۆمارێکی گەورەدا، قازانجی گشتی دەبێتە قوربانی هەزار و یەك روانگەی تاکەکەسی و شوێنکەوتووی هەلاواردن و رێکەوت دەبێ، بەلام لە کۆمارێکی بچووکدا، قازانجی گشتی ئاشکراتر و باشتر تێدەگەیەندرێ و ئاسانتر دەکەوێتە بەر دەست خەڵك، کەڵکی خراپ وەرگرتن لەو کەمتر روودەدا و کەمتر پشتیوانی لێ دەکرێ.(٧١)" لە نێو دامەزرێنەرانی ئەمریکا، کەسانێك وەك ئێلێکساندێر هامیڵتون، پێویستی یەکگرتن بەشێوەی نەریتی لە پێویستی کپکردن و زاڵبوون بەسەر قۆڵە نێوخۆییەکان، پاراستنی ئاسایش و بردنە سەری دەسەلاتی دەرەوەی خۆی، دەدی و لەم بوارەدا ئاماژەی بە مۆنتسکیۆ و کۆنفیدراسیۆنی لیسان دەکرد لەسەرکوتی شۆڕشی نێوخۆییدا. بۆچوونەکانی هامیڵتون، بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە بنەماکانی ژیانی ئازاد و کۆماریخوازی بوو. وەرنەدەگیرا، چونکە هۆکاری بوونی دەستە و قۆڵە جیاوازەکان لە کۆمەڵگادا لە روانگەی ئەوانەوە رەگی لە قازانجی دژ بەیەك و جۆراوجۆری لەکۆمەڵگادا لە روانگەی ئەوانەوە رەگی لە قازانجی دژ بەیەك و جۆراوجۆری کۆمەڵگەدا هەبووە. ئەو شێوازە لە یەکگرتن لەسەر بنەمای سەرکوت، یەکگرتنێکی ناسروشتی و دژی ژیانی ئازاد لە کۆمەڵگابوو.

بە نزیك بوونەوەی شۆڕش، مادیسون، بەڵگەی هێنابووەوە کە حکوومەتی فیدراڵ، تەنیا هۆکارێکە کە دەتوانێ بەشێوەیەکی لەبار داخوازیی دژ بەیەکی هەرێمەکان سەبارەت بە شەڕ و کاروباری ماڵی چارەسەر بکا، چونکە لە ئەنجوومەنگەلی بەربلاوترە کە قازانجی جۆراوجۆر دەتوانێ نوێنەرایەتی بکا.(٧٢)

بەلام سووڕانی کۆتایی لە فیدرالیزمی ژمارە (١٠) روویدا، کە لەودا جەیمز مادیسۆن نووسی کە بۆ لە نێوبردنی ئاسەواری خراپی دەستەبەندی لە کۆمەڵگەدا، دوو



رێگا هەیە: لە نێوبردنی هۆکار یان کۆنترۆڵی ئاکامەکانی ئەو. بۆ لەنێوبردنی هۆکاریش دوو رێگا هەیە: لەنێوبردنی ئازادی  و یان دابینکردنی ئازادیی یەکسانی بیروباوەڕ بۆ هەرهاولاتییەك.(٧٣) مادیسون دەنووسێ:

" هەرچی کۆمەڵگایەك بچووکتر بێ، ئەگەری ئەوە کەمە کە بەرژەوەندی و حیزبگەلێگ کە پێکی دێنن، لەیەکتر دووربن. هەرچی قازانج و حیزبەکان ژمێراوبن، ئەگەری زۆرە کە زۆرینە لە هەمان حیزب بێ... لە ئاستێکی بەربلاوتردا، حیزبەکان قازانجەکان لەبەرچاو بگرن، لەو حاڵەتەدا ئیحتمالی کەمی هەیە کە تەواوی زۆرینە، ئەنگیزەی هاوبەشی بۆ پەلاماردان بە مافی هاوولاتییان بێ. تەنانەت ئەگەر ئەنگیزەیەکی هاوبەشی ئەوتۆش هەبێ، دژوارە کە هەموو ئەو کەسانە کە ئەم ئەنگیزە هاوبەشە هەست پێدەکەن، دەسەلاتی خۆیان بدۆزنەوە و بە شێوەی یەکگرتوو پێکەوە بەکاربێنن.

نفووزی رێبەرانی تاقمەکان، رەنگە بەهۆی هەلکردنی ئاگر، بلێسەیەك لە نێو هەرێمێکدا لێ کەوێتەوە، بەلام دژوارە کە بلێسەی ئاگر هەرێمەکان بگرێتەوە. دەستەیەکی مەزهەبی رەنگە لە نێو ئەم یەکێتییەدا(confederacy) ببێتە دەستەیەکی سیاسی، بەلام جۆراوجۆری دەستە و تاقمە بلاوبووەکان لە تەواوی ئەم یەکێتییە، ئاسایشی ئەنجوومەنە نەتەوەییەکان لە بەرانبەر مەترسییەکی ئەوتۆ دەپارێزێ...

لە بەربەربلاوی و قەوارەی لەباری یەکێتی، ئێمە دەرمانی کۆماریخوازی لە بەرانبەر هەموو نەخۆشییە شاراوەکان لە نێو حکوومەتی کۆماری دا هەیە".(٧٤)

لەراستیدا، وەلام دانەوە بە لێڵی بیرۆکەیەك کە بەسەر ئەندێشەی سیاسیدا قورسایی دەکرد و دیمۆکراسی و کۆماری گەورەی وەك دوو دیاردەی نەگونجاو سەیر دەکرد،  هەروەها پێویستی بوونی دەستەگەل و بەرژەوەندی جۆراوجۆر، لەلایەن دەیوید هیوم و لە نامەی ناوبراو لە ژێرناوی "ئەندێشەی کۆمەڵگای هاوبەرژەوەندی" هاتبووە بەرباس و مادیسۆن لەم بەشە لە گەلاڵەی خۆیدا بۆ یەکیەتی فیدراتیوی ئەمریکا، کاریگەری لەو وەرگرتووە. هیوم لە گەلالەیەك کە بۆ کۆمەڵگای بەریتانیا ئامادەی کردبوو، بەمجۆرە نووسییەتی:

" ئێمە بێ بنەمابوونی ئەم بۆچوونە باوە دەبینین کە ناتوانین هیچ دەوڵەتێکی بچووك بەشێوەی کۆماری رێکبخەین، تەنیا شێوازی لەبار بۆ ئەو، دامەزرانی کۆماری لە شارێك یان سەروەرییەکی بچووکە. پێم وایە، پێچەوانەکەی ئەگەری بەرێوەبردنی هەیە، هەرچەندە کە رێکخستنی کۆماری لە وڵاتێکی گەورە، زۆر دژوارترە لە شارێك، بەڵام کاتێك پێکهات، لەودا هەلی زۆرتر دەرەخسێ کە بتوانی یەکگرتوو و بەردەوامی بکا و لە بەرانبەر کێشە و ئالۆزی گرووپەکان بپارێزێ... دیموکراسییەکان پڕ لە هەوراز و نشێون، چونکە خەڵك بەسەر حیزبی جیا لەیەکتردا دابەشدەبن و شاری بچووکی شوێنی نیشتەجێبوون یان نزیکتر بە ئەوان، دەسەڵاتی شەپۆلی کۆمەڵانی خەڵك هەست پێکراوتر دەکا... لەگەڵ ئەمانەشدا، لە حکوومەتێکی گەورەدا، کە لەسەر بنەمای هۆنەری لێزانانە داڕێژراوە، بۆشایی و پێگەیەکی گەورە بۆ جوانترکردنی دیموکراسی پێکدێ". (٧٥)

مادیسۆن کە لە ئەندێشەی کۆماری خوازیدا زۆرتر لەژێر کاریگەری فەرەنسییەکاندا بوو هەتا بەریتانیاییەکان، پێی وابوو کە خاوەن تیۆرییەکانی ئەورووپا لەوەی کە پێیان وابوو کۆماریخوازی تەنیا لە شارە بچووکە تیجارییەکاندا هەیە، بەهەڵەداچوون و نوێنەرایەتی لە کۆماری دەتوانێ رێگا چارەیەك بێ بۆ کێشەی بوونی دەستە و تاقمە جۆراوجۆرەکان لە کۆمەڵگادا. ناوبراو دەنووسێ کە ئەورووپا، نوێنەرایەتی دۆزییەوە، بەڵام ئەمریکا دەتوانێ شانازی ئەم داخوازییە ببێ کە دۆزینەوەی نوێنەرایەتی "کردە بناغەیەك بۆ کۆمارە بەربلاو و تێکەڵاونەکراوەکان". (٧٦)

ئەم تەفسیرە لە تیۆری کۆماری و نوێنەرایەتی، سووڕانێکی نوێ و لە هەمان کاتدا چونیەتی نوێ لە تیۆری حکوومەتدا بوو. مادیسۆن دەیویست نیشانیبدا کە توانایی دەوامی کۆماری، لە پلەی یەکەمدا لەسەر، سەرخانێك لە یاسای بنەڕەتی، بە سیستمێك لە نوێنەرایەتی گونجاو کە بتوانێ دەستدرێژی بۆسەر بەرژەوەندییە دژبەیەکەکان کۆنترۆڵ بکا، دابمەزرێ. ناوبراو سیستمی نوێنەرایەتی وەك "تەوەر"ی



سەرەکی کۆماریخوازی ناوبردووە کە لەو را حکوومەت بە پێی یاسای بنەڕەتی خۆی پشت بە سەقامگیری یاسادانان دەبەستێ کە لە رێگای تێکەڵاوکردنی ئەندێشەگەلی جۆراوجۆر هاوسەنگی لە نوێنەرایەتی بە دەست دێ. بەرزترین پلەی سازگاری حکوومەتی، مرۆڤی سەربەخۆی کە بە شکۆی کۆماریخوازی رازاوەتەوە و پشت بە پێگەی خۆی و ئەنگیزەی خزمەت بە کۆمار و بێ لایەنی دادوەرەکان دەبەستێ.

شۆڕشی ئەمریکا، بەناوی کۆماریخوازی روویدا و تیۆری کۆماریخوازی ئەو هەوڵێکی ژیرانە بوو و رەگی لە ئایدولۆژیای شۆڕشی سەدەی حەڤدەهەم لە فەرەنسادا بوو هەتا بەریتانیا، هەرچەند کە ناوبرا پێشرەوانی گەورەی ئەم، ئارمانجە پاك و لە مێژینەیە وەك ئالجێرنون سیدنی و جەیمز هرینگتۆنیشی ستایش دەکرد. (٧٧)

لەسەر تێگەیشتنێکی ئەوتۆ لە تیۆری دابەشکردنی دەسەڵات و کۆماریخوازی بوو کە دامەزرێنەرانی ئەمریکا، بناغەی کۆماری مودێرن و ئەندێشەیەکی نوێ لە فیدرالیزم کە لەودا جیاوازی و یەکبوون، تێکەڵاوی یەك دەکا، پێکهێنا.

## وانەیەك کە دەتوانین لە ئەزموونی رۆژگار فێری بین

تەواوی حکوومەتە دیکتاتۆرییەکان دژی دابەشکردنی دەسەڵاتی و ئەم مەسەلەیە سەبارەت بە وڵاتانی توتالیز لە رابردووشدا راستە. لەبەر ئەم هۆیە ئەگەر ئەمانە لە تیۆری خۆیاندا سیتمی فیدراڵی بوون، بەهۆی تایبەتمەندی کۆکردنەوەی لەرادەبەدەری دەسەڵاتی سیاسی لە ناوەند، نە دابەشکردنی راستەقینەی دەسەڵات لە دەزگای حکوومەتی دەیتوانی لەواندا بوونی هەبێ و نە دابەشکردنی ستوونی دەسەڵات لەنێو هەرێمەکان و ناوچەکان. ئەگەر ئەم وڵاتانە لە رێگای کێشەی نەتەوەییەوە پرش و بڵاوبوون، یەکێك لە هۆکارە بنەرەتییەکانی دەبێ تایبەتمەندی کۆکردنەوەی دەسەڵات لە ناوەند دا بێ. دەسەڵاتی کۆکراوە لە ناوەند نەتەنیا دژایەتی هەیە لەگەڵ دەسەڵاتی یاسا، دیموکراسی و پلورالیزم و دابەشکردنی دەسەڵات تەنانەت لە کۆمەڵگایەکی یەکسان لە روانگەی بنەمای قەومیی خۆی، زمان و مەزهەب، لە کۆمەڵگایەکی فرەنەتەوەییدا،

ئاستێکی دیکە لە سەرکوتیش بەو زیاد دەبێ کە بەش بە حاڵی خۆی پەرە بە هەڵاتن لە ناوەند لە گۆشەنیگا مەسەلەی نەتەوەییەوە دەدا. ئەگەر سۆڤیەت یان یوگسلاڤی سەرەڕای فیدراڵی بوونی خۆیان هەڵوەشانەوە، هۆکاری سەرەکی ئەو دیپلوماسی نێونەتەوەی نەبوو، هەرچەندە پلەیەك لە کاریگەری هەبوو. چونکە تایبەتمەندی نادیموکراسی و کۆبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەندی ئەم حکوومەتانە رۆڵی سەرەکی رووخان و سیاسەتگەلی نەیارانی نێونەتەوەیی رۆڵی هۆکاری پاڵپێوەنەری بوو.

نێوەرۆکی سیستمێکی فیدراڵ، لەسەر بنەمای دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و نەبوونی ئەو، حکوومەتێکە بەرواڵەت فیدراڵ کە لە نێوەرۆکی راستەقینەی ئەم رژێمانە، هەموو کاتێك لە ململانێیەکی بەردەوام دایە لەگەڵ شێوازی حکوومەتی خۆی. لنین لە دامەزرانی دەوڵەتی سۆڤیەت تایبەتمەندی حکوومەتی سۆسیالیستی لەتایبەتمەندی کۆبوونەوەی دەسەڵات و بەرتەسك کرانەوەی لە دونیای سەرمایەداری وەرگرتبوو و ئەم تایبەتمەندییە لەگەڵ دیموکراسی لە ناخی کۆمەڵگا، جیاکردنەوە و دابەشکردی دەسەڵات رووبەڕووی دەسەڵاتی یاسا و ئازادی حیزبەکان دەبوویەوە.

لەبەرئەوەی کە هەریەك لەم چەمکانە، پێکەوە گرێدراون و لە نەبوونی یەکێکیان، نەبوونی ئەوی دیکە دەبێ هەستپێبکرێ. کەسێك کە باسی پلۆراڵیزمی سیاسی و ئازادی پێکهێنانی رێکخراو دەکا، بەڵام دابەشکردنی دەسەڵات لە ژێر پەردەی بیروکەیەکدا، رەتدەکاتەوە، لەراستیدا دژی داخوازی پلۆراڵیزم و ئازادی سیاسی خۆی فتوا دەدا. چونکە ئەم چەمکانە هەرکامەیان نوێ یان رواڵەتی دیکەن لە بوونی یەکتر. رەنگە بەشێك لەگەڵ رادیکاڵیزمی سیاسی، دیموکراسی راستەوخۆ و یا لیبراڵی ناساندنی دابەشکردنی دەسەڵات قایل نەبن. دەبێ بڵێین کە دروستە کە لیبراڵیزم هاوشان لەگەڵ دیموکراسی نییە، بەڵام بێ پەیوەندیش نییە. دیموکراسی، توخمێك لە لیبراڵیزمی لەگەڵ خۆیدا هەیە. دابەشکردنی دەسەڵات، ئازادی حیزبەکان. دەسەڵاتی یاسا و پلۆراڵیزم لە کۆمەڵگادا، رواڵەتێك لە لیبراڵیزم و لەهەمان کاتدا رواڵەتێك لە دیموکراسیشن. ئەگەر یەکێك لەم چەمکانە هەڵگری، چەمکی دیکەش خۆبەخۆ



هەڵگیراوە. ئەگەر دەسەڵاتی یاسا هەڵگری، بتەوێ و نەتەوێ، ئازادی حیزبەکان و پلۆراڵیزم و دابەشکردنی دەسەڵاتیش لە نێو بردووە. بە پێچەوانەوە، مەرجی راستەقینەی دابەشکردنی دەسەڵات، ئازادی حیزبەکان و دەسەڵاتی یاسایە. دەسەڵاتی کۆبووەوە لە ناوەند، لەراستیدا بە پێچەوانەی ئاراستەی هەموو ئەم چەمکانە دەچێتە پێش کە ناوی گشتی ئەوانە دەتوانین دیموکراسی پێی بڵێین.

هەرچی دەسەڵات زیاتر کۆبببێتەوە، مەیل بەسەرکوت لەودا زیاتر دەبێ. بەداخەوە، تاعوونی دەسەڵاتی کۆبووەوە لە سەدەی ئێمە پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ لایەنەکانی دەست درێژی حکوومەتەکان بە مافی خەڵك هەیە. هەرچی دەسەڵاتی سیاسی لە دەست کەسێك( رێبەر، پێشەوا، ئیمام، ولی فقیە و ...) یان گرووپێك یان حیزبێك کۆبێتەوە، بە هەمان رادەش ئامادەگی دەست درێژی بۆ سەر مافی خەڵك و خولقاندنی جینایەت لەلایەن حکوومەتەکانەوە زیاتر دەبێ.

بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی بەڕێوەچوون. بە درێژایی ٨٨ساڵ سەرەتایی سەدەی بیستەم، ١٧٠ ملیۆن پیاو و ژن و منداڵ دراونەتە بەرگوللە، ئەشکەنجە کراون، لە ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێ و شێوازی جۆراوجۆرەکانی ستەمی حکوومەتەکان مردوون. ئەگەر خەساری مرۆڤی شەڕی پێ زیاد بکەین، ئەم رەقەمە دەگاتە٢٠٣ ملیۆن و بە ژماردنی هاووڵاتییانی بێ پەنا و کۆچبەر رەقەمی کوشتار دەگاتە ٣٦٠ ملیۆن کەس.[٧٨]

لە ماوەی کەمتر لە چوار ساڵ لە نێوان ١٩٧٥ هەتا ١٩٧٨، حکوومەتی کامبوج، ٣١٪ گەلەکەی خۆی کوشت. سیستمی هێزی کار کە لەلایەن لنینەوە داڕێژراو و ستالین بەوپەری خۆی گەیاند، حکوومەتی سۆڤیەت بە درێژایی حەفتا ساڵ تەمەنی خۆی، نزیکەی ملیۆنێك لە هاووڵاتییانی خۆی لەنێو برد.[٧٩] ئەم ژمارەیە، هاوسانە لەگەڵ دوو بەرانبەری تیجارەتی کوێلە لە ماوەی چوار سەد ساڵ لە داگیرکردن هەتا فرۆشتنی کوێلەکان لە بازارەکانی عەرەب، بازاڕەکانی رۆژهەڵات و بازاڕی جیهانی.

لە ساڵەکانی ١٩٣٠، پۆلیسی نهێنی سۆڤیەت، بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکانی سۆڤیەت، بەشی مردنی دیاریکردبوو، ئەم بەشانە، هاوڕێ بوو لەگەڵ کوشتارە بێ

جیاوازییەکان. هێندێك جار دایکێك بەدوای منداڵی خۆی سەردانی پۆلیسی نهێنی سۆڤیەتی دەکرد. بۆ تەکمیلی بەشەکان، دەسگیریان دەکردن و دەیانکوشتن.

هندێك جاریش منداڵانیان بە بوختانی تاوانی دایك و باوکیان دەکوشتن.

دۆسیەی ڕەشی چین و ئەڵمانی هیتلەری لە پلەکانی دوایی یەکەمین ولاتی شوارکان هەڵکەوتوون و ولاتانی دیکتاتۆری دیکە، هەریەك بە پێی دەسەلاتی کۆکراو لە دەستی تاکەکەسێك یان گرووپێکی بچووك، خزمەتکاری مەرگ و جینانەت لە سەری ئێمە دا بوون. تەواوی کوشتارەکان، زۆربەیان بە نهێنی و لە ژێر پەردەی زیرەکانەی فێل و تەڵەکە و درۆ لەلایەن کەسانێك کە دەسەلاتیان بە دەستەوە بووە، بەڕێوە چووە،[٨٠] کە بۆ خۆی شاهیدی حاشا هەڵنەگرە لەوەی کە:

دەسەلات دەکوژێ و دەسەلاتی ڕەها بەشێوەی ڕەها دەکوژێ.

## فرە جۆری لە فیدرالیزمدا

### بەراوردکردنی چەند سیستمێکی فیدراڵی

فیدرالیزم بە چەمکە گشتییەکەی بەو بنچینەیەی ڕێکخستنی کۆمەلایەتی دەگوترێ کە لە پەیوەندی دامەزراوەیی و سەقامگیری ئەو یەکانەی کە لەبنەڕەتدا خودموختارن و بە بەرپرسیارەتی سەربەخۆ، یەکەگەلی گەورەتر لەگەڵ ئامانجی هاوبەش دێنێتە ئارا. پێکهاتەی فیدرالیزم لە پێناوی پەیوەندی دان، پاراستن و بەرزراگرتنی ناسنامە جۆراوجۆرەکان لە چوارچێوەی یەکیەتییەکدا هەڵدەبژێردرێ.

**سیستمەکانی فیدرالیزم ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە لە خۆدەگرن:**

- بوونی (لانیکەم) دوو ئاستی حکوومەتی فیدراڵ و هەرێمایەتی کە لە ژێر چاودێری یەکتر نین و بەیەکەوە نەبەستراون، بەڵکو خاوەنی چەندین ئۆرگانی سەربەخۆن کە بە شێوەی سەربەخۆ و بەبێ نێوبژیوان ئەرکەکانی خۆی لە بەرانبەر هاوولاتییانیدا جێبەجێ دەکەن.



- دابەشکردنی یاسایی (اختیارات) دەسەلاتی یاسادانان و جێبەجێ کردن، هەروەها مافی دانان و وەرگرتنی باجەکان لە نێوان ئەم ئاستانەدا، بە جۆرێك کە هەر کام لەم ئاستانە خاوەنی بوار و چوارچێوەیەکی دیاریکراوبن کە لەواندا بەشێوەی خودموختار هەڵسوکەوت بکەن.
- نوێنەرایەتی کردنی ڕوانگەکان و بەرژەوەندی ناوچە جیاوازەکان لە ئاستی ناوەندا کە زۆرتر لە لایەن پەرلەمانی سەنا یان لقی دووەمی پەرلەمانی فیدراڵ بەڕێوەدەچێ.
- بوونی یاسای بنەرەتی نووسراوی فیدراڵ کە هیچ کام لە ئاستەکان نەتوانن یەك لایەنە بیگۆڕن (هەر بۆیە لە سیستمە فیدراڵییەکاندا ناتوانن بەو جۆرەی کە لە سیستمە ناوەندگەراکاندا بەڕێوە دەچێ، دەوڵەتە ناوچەییەکان لەلایەن دەوڵەتی ناوەندییەوە پێکبێ، گۆڕانی بەسەردا بێ، یان هەڵوەشێتەوە).
- بوونی " نێوبژیوان" ێك بۆ چارەسەری هێندێك کێشە لە نێوان ئاستە جۆراوجۆرەکاندا. ( ئەم "نێوبژیوانە" دەتوانێ دادگایەکی دەسەلاتدار و جێگای پەسەندی هەردوو ئاست بێ یان ریفراندۆم) و هتد...

لە حاڵی حازردا ٢٤ ولات خاوەنی ئەو تایبەتمەندیانەی سەرەوەن و بەمجۆرە دەتوانین وەك فیدراسیۆن ناویان بێنین (ئەویش بەبێ لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەوان سیستمی خۆیان لە یاسای بنەڕەتی پەیوەندیداردا فیدراڵی ناوناوە). ڕۆلاند ال. واتس ولاتانی خوارەوەی وەك فیدرالیزم ناساندووە.

- لە ئەورووپا: بەلجیکا، ئەڵمان، سربستان و مۆنتینیگرۆ، نەمسا، ئیسپانیا و سویسرا..
- لە ئەمریکا: ئەرژەنتین، بەرازیل، کەنەدا، مەکسیك و دورگەکانی سانکت کریستوفرونویس، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڤەنزیویلا..
- لە ئەفریقیا: ئەتوبیاو و کامیرۆن و نیجریا و ئەفریقیای باشوور.
- لە ئاسیا: هیند، مالیزیا، میکرونزی، پاکستان، رووسیا و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی و لە ئۆقیانووسییە، ئوسترالیا.

پێرستی سەرەوە دەری دەخا کە کۆمەڵگاکان بە تایبەتمەندی زۆر جیاوازەوە- گەورە و بچووك، دەوڵەمەند و هەژار، بە پێکهاتەی هاوچەشن یان هەمەجۆر- بینای دەوڵەتی خۆیان بە شێوەی فیدرالیزم رێکخستووە. ئەم نووسراوەیە هەوڵدەدا ئەم هەمەجۆرییە بە هێنانەوەی نموونە نیشانبدا. بۆ ئەم کارە پێویستە سەرەتا بە هاوکاری چەند نموونەی هەڵبژێردراو گرنگترین ئەنگیزەی دامەزرانی سیستمی فیدراڵی و هێزە سیاسییە هاندەرەکان یان رێگرەکان کە کاریگەرییان لە پرۆسە و دامەزرانی ئەم سیستمانە دا بووە بەکورتی بناسرێندرێن. پاشان چەند تایبەتمەندی گرنگی ئەم فیدراسیۆنە بەشێوەی سیستماتیك لەگەڵ یەك بەراوەرد دەکرێن. بەشی کۆتایی ئەم بابەتە باسێکی گشتی لە خۆ گرتووە لە پەیوەندی لەگەڵ گۆڕانگارییەك دەگەڕێتەوە بۆ هاوکاری نزیکی وڵاتە جۆراوجۆرەکان لە چوارچێوەی یەکیەتییە نێونەتەوەیی و ناوچەیییەکاندا.

## بنچینەی سەرهەڵدان و پرۆسە سیاسییەکان لە چەند سیستمی فیدراڵیدا

سەرەڕای تایبەتمەندی هاوبەش کە لە سیستمە فیدراڵییەکاندا دەبینرێ، پارامەتر گەلێك وەك بارودۆخی مێژوویی جیاواز، تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی- فەرهەنگی جۆراوجۆر و، هەروەها پرۆسەی سیاسی جیاواز بووەتە هۆی پێکهێنانی چەندین نموونەی جیاواز لە سیستمی فیدراڵیدا. لێرەدا تەنیا پێنج نموونە لە وانە بە کورتی دەناسێنین. بۆ ئەوەی کە هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم سیستمانەمان لەخۆگرتبێ، بەو جۆرەی کە لە خشتەی خوارەوە نیشاندراوە، چەندین کۆمەڵگا و وڵاتمان بە پێکهاتەی سیاسی، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆر جیاواز هەڵبژاردووە.[٣]

### ئەمریکا(١٧٨٩)

بەرابردووترین یاسای بنەڕەتی فیدراڵ، یاسای بنەڕەتی ئەمریکایە.[٤] لە کاتی شەڕەکانی سەربەخۆیی، ١٣ هەرێمی ئینگلیزی زمان لە باکووری ئەمریکا لە ساڵی ١٧٨١ کۆنفیدراسیۆنێکیان لە نێوان خۆیان پێکهێنا کە لەودا هەرکام لەو ناوچانە سەرەتا سەربەخۆیی خۆیان پاراست. ئەم یەکیەتییە نەیتوانی کێشەکان و ئاسەواری



دوای شەڕ چارەسەر بکا، شتێك کە بە بڕوای" فیدراڵیستەکان" لە پلەی یەکەمدا بۆ لاوازی حکوومەتی ناوەندی دەگەڕایەوە و هەر بۆیەش ئەوان خوازیاری بەهێزکردنی دەوڵەتی ناوەندی بوون. لەم پێناوەدا لە روانگەی تیۆری دیموکراسی و دەوڵەتەوە، بەڵگەیان دەهێنایەوە. بە میکانیزمی بەربەستکردن و دابەشکردنی ئاسۆیی دەسەڵات لە نێوان سەرۆك کۆمار، کۆنگرە، دیوانی بەرزی وڵات لایەنی ستوونی دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسیشیان پێ زیاد کرد. بەمجۆرە کۆسپێکی دیکە بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ پەرەگرتنی دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت پێکهات. بەڵام روانگەی فیدراڵیستەکان سەرئەنجام لە نووسینی یاسای بنەڕەتی ١٧٨٩ لەبەر چاوگیرا.

بیرۆکەی بەربەستکردنی دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت لە پرۆسەی پیادەکردنی فیدرالیزم لە ئەمریکادا گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە. بە تێپەڕبوونی رۆژگار رەشبینییەکی زۆر لە نێو خەڵکی ئەمریکا بەرانبەر بەهەموو جۆرە ناوەندگەرایی و کۆکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە ناوەند دروستبوو، بە پێچەوانەوە ئەڵمانیا کە لەودا یاسای بنەڕەتی" هاوسانکردنی بارودۆخی ژیانی خەڵك"ی وەك ئامانجێکی سیاسی دیاریکردبوو. زۆربەی خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستێوەردانی سانترالیستییان رەت کردۆتەوە، دەستێوەردانێك کە دەتوانێ لە سیستمێکی فیدراڵیدا دابەشکردنی سامان و داهاتەکانی نێوان تەواوی هاوڵاتییانیش بگرێتەوە. سەرەڕای ئەمەش لە ئەمریکا بە فیدرالیزم نەك وەك بایەخێك کە بەردەوام و لە هەموو هەلومەرجێکدا پشتیوانی لێ بکەن، بەڵکو لە رووی پراگماتیستی و ئامرازییەوە سەیری دەکەن کە دەبێ توناییەکانی لەگەڵ سیستمەکانی دیکە هەموو کاتێك بەراوورد بکرێ و پێداپچنەوە.

لەم سەدەیەی دواییدا لە ئەمریکا بەردەوام شاهیدی پرۆسەی ناوەندگەرایی و دابەشکردنی دەسەڵات بووین. سیاسەتی کۆکردنەوەی دەسەڵات لە ناوەند و بەهێزکردنی دەوڵەتی ناوەندی زۆرتر لە سەردەمی سەرۆك کۆماری دیموکراتەکان بەڕێوە دەچوو( بۆ وێنە لە دەیەی ١٩٣٠ بەدوای پرۆگرامی ((New-Deal-program

لەسەردەمی فرانكلین د. رۆزولْت، یان لە دەیەی ١٩٦٠ لەسەردەمی سەرۆك كۆماری جون ئێف. كەندی)، دوابەدوای ئەم پرۆسانە، بەردەوام پرۆسەگەلێكی ئاوەژووش لە پێناوی لاوازكردنی دەوڵەتی ناوەندی لە لایەن حیزبی كۆماریخوازەوە بەڕێوە چووە. سەرۆك كومارەكانی كۆماریخوازان هێرشەكانی خۆیان بۆ پرۆگرامەكانی دەوڵەتی كۆمەڵایەتی زۆرتر لە ژێر ناوی پشتیوانی لە قەوارەكانی فیدراڵیستی بەرەو پێش بردووە. بۆ وێنە سەرۆك كۆماری كۆماریخواز، رونالْد ریگان، كەمكردنەوەی تەرخانكردن و راگواستنی سەرچاوەی ماڵی بە هەرێمەكان بۆ دابینكردنی ماڵی پرۆگرامە كۆمەڵایەتییەكان لە دەیەی ١٩٨٠دا وەك" ریفۆرمی سیستمی فیدراڵی" ناساندووە. ناوبراو بەم كارەی بەشێوەی چاوەڕوان نەكراو بووە هۆی بووژانەوەی (رێنیسانس)ی سیاسەتی دەوڵەتە هەرێمییەكان: بەتایبەت ئەو هەرێمانەی كە لەڕووی ماڵی و ئابوورییەكی بەتوانا كە لە ژێر دەسەڵاتی حكوومەتی دیموكراتەكاندا بوون پرۆگرام و گەڵاڵەكانی خۆیان بۆ چاكسازی سیستمی دابینكردنی كۆمەڵایەتی پێشكەشكرد. بەمجۆرە سیستمی فیدراڵ سەقامگیری و توانایی خۆی بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی سیاسی زاڵ نیشاندا.

## خشتەی ژمارە ١

بە گشتی دەتوانین بڵێین كە سیستمی فیدراڵی ئەمریكا لە دەیەكانی دوایی تاڕادەیەك بەرەو ناوەندگەرایی رۆیشتووە. رۆڵی سەرەكی لەم پرۆسەیەدا دیوانی بەرزی وڵات گێراویەتی كە رێ و شوێنی یاسایی پەیوەندیدار بە دەسەڵاتەكانی زۆرتر بە قازانجی دەوڵەتی فیدراڵ (ناوەندی) تەفسیر كردووە. سەرەڕای ئەمەش دەوڵەتی فیدراڵ لەڕووی ماڵییەوە لە پێشترە لە دەوڵەتە هەرێمییەكان. زۆرتر داهاتی باجی لە دەستی دەوڵەتی فیدراڵ دایە و دەوڵەتە هەرێمییەكان كەم تا زۆر بەستراوە بە بودجەی دەوڵەتی فیدراڵن. نزیكەی سێ چوارەمی سەرچاوەی ماڵی كە دەوڵەتی فیدراڵ دەیداتە هەرێمەكان یارمەتی بەمەرجە كە دەبێ بۆ پرۆژە دیاریكراوەكان سەرفبكرێ، ئەمە میكانیزمێكە كە دەبێتە هۆی ئەوەی كە دەوڵەتی فیدراڵ بتوانێ بۆچوونەكانی خۆی لە



بەرانبەر هەرێمەكاندا بسەپێنێ (و بەناو ئەوان بە "هەوساری زێڕین" رێنوێنی بكا). بە درێژایی دەیەكانی دوایی سیستمی فیدراڵی لە ئەمریكا قۆناغی جۆراوجۆری بڕیوە- جۆری فیدرالیزم لە ئەمریكا سەرەتا سیستمێكی دووچەشن بە دەسەڵاتی جیاواز بۆ دەوڵەتی فیدراڵ و هەرێمەكان بووە، دواتر بووە بە "فیدرالیزمی كۆئۆپراتیۆ" {هاوكاری نزیكی هەردوو ئاست لەگەڵ یەكتر} و ئەمڕۆ جۆری فیدرالیزمی "زۆرە ملێی" لە ویدا هەیە.

## سویسرا (١٨٤٨)

رەگە مێژووییەكەی كۆنفیدراسیۆنی سویسرا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەهەم، ئەو كاتەی ١٤ كانتون و ناوچە بۆ خۆپاراستن لە هەڕەشەكانی دەرەكی هاوپەیمانییەكیان لە نێوان خۆیان پێكهێنا. ساڵێك دوای شەڕی ١٨٤٨ بە دژی ناوچە كاتولیكەكان، یاسایەكی بنەڕەتی كە ئەمڕۆش بنەڕەتی ترین رێبازەكانی بەجێماوە پەسەند كرا. یەكپارچەیی دەوڵەتی كە ئێستاش بەردەوامە تەنیا بە پاراستن و رێزگرتن لە خودموختاری ناوچە جۆراوجۆرەكانی ئەم وڵاتە دەستەبەركراوە. هەتا ئەمڕۆ فیدرالیزم بۆ سویسراییەكان وەك بایەخێك و توخمی سەرەكی كاروباری دەوڵەتی چاو لێ دەكرێ، دەوڵەتێك كە بە پێی یەك نەژاد، یەك مێژوو، یەك زمان و یەك ئایین لە ژێر ئاڵایەكی هاوبەش دانەمەزراوە. لێرەدا بەتایبەت رێزلێنان بۆ جۆراجۆری شێوازەكان و بارودۆخی ژیان، هەروەها رەخسانی هەل بۆ كۆنترۆڵی نوخبە سیاسییەكان وەك بەرهەمی فیدرالیزم چاوی لێدەكرێ. لەم رووەوە كانتۆنەكانی ئەم وڵاتە جیاوازییەكی زۆریان لەڕووی دامەزراوەكان، ئیدارەكان، مافی گەل، پێكهاتەی ناوچەیی و رێژەی باجەكان لەگەڵ یەكتر هەیە. هەر بۆیە نموونەی سویسرا بۆ لێكۆڵینەوەیەكی هەمەلایەنە لەمەڕ فیدرالیزم لەبارە، لەبەرئەوەی كە ئەم وڵاتە سەرەڕای بوونی چەند سنوور كە لەودا چەندین زمان، ئایین، شاری، لادیی و دەوڵەمەندی و هەژاری تێدایە، بە درێژایی دەیەكان لەڕووی سیاسییەوە سەقامگیری ماوەتەوە. لە پاڵ كەمبوونەوەی كاریگەریی نیگەتیفی هێندێك لەم سنوورە نێوخۆییانە ئەم مەسەلەیە كە ئەم هێلانە

لەسەریەك تێپەڕ دەبن، لە پتەوبوون و سەقامگیری ئەم سیستمەدا ڕۆڵ گێڕاوە. هەر بۆیە هاووڵاتییانی سویسری لەهەر ناکۆکییەکدا" سەر بە لایەنە جیاوازەکان نین". بەڵام بە پێچەوانەوە، سنووری زۆر ئاشکرا لە نێوان گرووپە زمانییە جۆراوجۆرەکان لە پەیوەندی لەگەڵ پەیوەندی دەرەوە و سیاسەتەکانی پەیوەندی دار بە دابینکردنی کۆمەڵایەتییە. بۆ نموونە خەڵکی فەرەنسی زمانی ڕۆژئاوایی سویسرا لە پەیوەندی لەگەڵا مەسەلە نێونەتەوەییەکان دڵاوەڵاتر و کراوەترن و زۆربەی ئەوانە ئەندامەتی لە یەکیەتی ئەورووپا قەبوولدەکەن، لە حاڵێکدا ئەم کارە بە هۆی دژایەتی سویسی ئەڵمانی زمانەکانەوە تا ئێستا لەگەڵ شکست ڕووبەڕوو بووە. سەرەڕای ئەمەش خەڵکی فەرەنسی زمان پێیان وایە کە دەبێ سیاسەت زۆرتر بایەخ بە هەژارەکانی وڵات بدا، مەسەلەیەك کە هەرچەند جارێك دەبێتە هۆی ئاڵۆزی لەگەڵ بەشی ئەڵمانی زمانەکانی سویسرا کە لەڕووی ماڵی و ئابوورییەوە بەهێزتر بە هۆی میکانیزمی هاوسەنگ کردنی کۆمەڵایەتی ( کەمکردنەوەی فشاری ئابووری کانتۆنەکانی لاوازتر لە ڕێگای یارمەتی ماڵیی کانتونە دەوڵەمەندەکان).

## ئەڵمانیا (١٩٤٩)

بۆ دامەزراندنی سیستمی فیدراڵی لە ئەڵمانیا کە لە ساڵی ١٩٤٩ لە یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتە دا گونجێندرا لە یاسای بنەڕەتی بیسمارکی رایش لە ساڵی ١٧٨١ ئیلهام وەرگیراوە و ئەم قەوارەیە- بەپێچەوانەی خواستی ئەو کاتی هێزە سەرکەوتووەکانی شەڕی دووەمی جیهانی- سانتراڵیستی داڕێژراوە.[٦] گرنگترین دەسەڵاتەکان بە دەوڵەتی فیدراڵ دراوە، چونکە ئەم بڕوایە زاڵبوو کە تەنیا بەمجۆرە دەتوانن وەڵامی شیاو بە پێداویستییەکانی سەردەمی دوای شەڕ (کەمکردنەوەی هەژاری کۆمەڵایەتی، نۆژەنکردنەوەی ئابووری و هتد...) بدەنەوە. بە پێی ویستی حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا شێوازی "هاوسەنگکردنی بارودۆخی ژیانی خەڵك" وەك ئامانجێك لە یاسای بنەڕەتی ئەڵمان گونجێندرا، هەتا دوایی بچێتە خزمەتی هەوڵەکانی یەکسانیخوازانەوە.



ئەمڕۆ سیستمی فیدراڵی ئەڵمان لە ئەدەبیاتی زانستی سیاسیدا زۆرتر وەك مودێلێك لە فیدرالیزم باسی لێدەکرێ، کە لەودا، جۆری " فیدرالیزمی یەکگرتوو یان لێککگرێدراو، واتە لێك ئاڵانی بوارە گرنگە سیاسییەکانی ئاستی فیدراڵ و هەرێمی، بە شێوەی گشتی بووەتە هۆی "ترافیکی ریفۆرم" (بەرەو پێش نەچوونی چاکسازی ئابووری). ئەنجوومەنی هەرێمەکان(کە لەودا هەرێمەکان ئەندامن و ئورگانیکەکە بەرژەوەندی ئەوان لە ئاستی فیدراڵدا تاقیب دەکا و چاودێری سیاسەتی دەوڵەتی فیدراڵ دەکا) ڕۆڵ و پێگەیەکی گرنگی لە قەوارەی فیدراڵی ئەم وڵاتە هەیە. ٦٠ لە سەدی تەواوی ئەو یاسایانەی کە لە پەرلەمانی فیدراڵدا پەسەند دەکرێن پێویستی بە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی هەرێمەکان هەیە. ئەم ئورگانە ڕۆڵێکی گرنگ لە بەربەستکردنی دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتی ناوەندی فیدراڵ دەگێڕێ و دەتوانێ ـ بەتایبەت ئەو کات کە ئۆپۆزسیۆن لەودا زۆرینە پێکدێنێ ـ گەورەترین مەبەستەکانی چاکسازی خوازانەی دەوڵەت و پەرلەمانی فیدراڵ بکاتە بلقی سەر ئاو ـ دانوستانی بەردەوامی دەوڵەتی فیدراڵ و هەرێمەکان ئاکامی دروستی بارودۆخێکی ئەوتۆیە. ئەم دانوستانانەش بە تایبەت ئورگانە سیاسییەکانی بەڕێوەبەریی بە ئەنجامی دەگەیەنن، میکانزمێك کە لەڕووی ڕەوایی دیموکراسی هەموو کاتێك ڕەخنەی لێ گیراوە. بە مەبەستی پەرەپێدانی هاوکاری ئاستە جیاوازەکانی سیستمی فیدراڵ و دابەشکردنی ئەرکە دەوڵەتییەکان لە ئەڵمان ـ بۆ وێنە بە پێچەوانەی ئەمریکا ـ بە جۆرێك لە نێوان ئاستی فیدراڵ و هەرێمەکان داڕێژراوە کە لانیکەم بوار و بابەتێك هەبێ کە بکەوێتە چوارچێوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی یان هەرێمەکان. هەڵبەت مودێلێکی ئەوتۆ بەردەوام پوتانسیلی کۆنترۆڵ کردنی هەرکام لەم دوو ئاستە لەلایەن ئاستی بەرانبەرەوە لە خۆیدا شاردووەتەوە. ڕەنگە بتوانین مودێلی فیدراڵیستی ئەڵمان بەشێوەی ساکار[٧] بەمجۆرە وێنا بکەین کە پەرلەمانی فیدراڵ بەرپرسی داڕشتنی یاسایە و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەم یاسایە دەکەوێتە سەر شانی هەرێمەکان. سەرەڕای ئەمەش دەبێ وەبیربێنینەوە کە دەوڵەتی فیدراڵ بە هۆی باشتربوونی باری ماڵی خۆی، لە دەیەکانی دواییدا بەشێوەی بەرچاو چەندین پرۆژەی

لەباری ماڵییەوە دابینکردووە کە لەبنەڕەتدا لە چوارچێوەی ئەرکی هەرێمەکاندا بووە. ئەم مەسەلەیە دوولایەنی هەیە: لەلایەك بەم یارمەتییەی دەوڵەتی فیدراڵ پرۆژە نیوە چڵەکان بەتەواوی بەڕێوەدەچن، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتی فیدراڵ هەڵسەنگاندنەکانی خۆی لە چەندین بواردا کە لە بنەڕەتدا پەیوەندییان بەوەوە بەسەر دەوڵەتە هەرێمەکان بسەپێنێ و ئەوان لەڕووی ماڵییە بەخۆی ببەستێتەوە. بە دوای ئەو هەوڵانەی کە بۆ ریفۆرمی فیدرالیزم لە ئەڵمان لە ئارادان، دەیانەوێ لە دەستێوەردان و لێك ئاڵانی سیاسی ئاستی فیدراڵ و ئاستی هەرێمەکان کەم بکرێتەوە و دەسەڵاتی ماڵی هەرێمەکان زیاد بکەن.

## بەلجیکا (١٩٩٣)

بەلجیکا دەیەیەك لەمەوپێش ( ١٩٩٣) یاسایەکی بنەڕەتی فیدراڵیستی پەسەند کرد. ئەم یاسایە بە تایبەت لەم ڕووەوە جێگای سەرنج بوو کە لە تەفسیری یەك پێکهاتە و دابەشکردنی وڵات بە شێوەی ناوچەیی بەرەو پێشتر چووە.(١٣) فیدراڵیزەکردنی ئەم وڵاتە کە لە ساڵی ١٨٣٠ وەك دەوڵەتێکی فەرەنسی زمان و ناوەندگەرا دامەزرابوو، بۆیە بوو بە پێویستییەك، کە کێبەرکێی نێوان دوو گرووپی گەورەی زمانی ئەم وڵاتە، واتە هۆڵەندی زمانەکان و فەرەنسی زمانەکان، لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠بەوپەڕی خۆی گەیشتبوو. هەرچەند هەردووی ئەم زمانانە بەشێوەی فەرمی وەك یەك جێگای ڕێزن، بەڵام لە کردەوەدا زیاتر لە زمانی فەرەنسی کەڵك وەردەگیرێ. ئەمەش پێش هەموو شتێك بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕێتەوە کە بەشێکی گەورە لە هۆڵەندی زمانەکان، فەرەنسیش قسەدەکەن، لەحاڵێکدا فەرەنسی زمانەکان زۆرتر بە یەك زمان قسەدەکەن. جیاوازی لە ئاستی گەشە و بنەمای ئابووری نێوان ناوچەی فلاندرییەکانی هۆڵەندی زمان لە باکووری وڵات (Flemish) کە لە حاڵی گەشەکردن دایە و ناوچەی لە ڕووی پێشەیی کۆن بووی ڤالۆنیاکانی فەرەنسی زمان لە باشوور کە نرخی بێ کاری لەسەرەوەیە، کێشەکەی زیاتر کردووە. هەردوو گرووپی زمانی گەلاڵەگەڵی ناوەندگەرایانەی تایبەت بە خۆیان تاقیب کردووە و دەیکەن. لایەنی فیلیمی پشتیوانی لە پەرەسەندنی " کۆمەڵگای زمانی " دەکەن کە وەك دامەزراوە گەلێك



لەڕووی فەرهەنگییەوە خاوەن ریشە لێك دەدرێتەوە، لە حاڵێکدا ڤالۆنییەکانی فەرەنسی زمان لەبەرهۆی ئابووری پشتیوانی لە بەهێزبوونی هەمەلایەنەی خودموختاری ناوچەیی دەکەن. فەرەنسی زمانەکان دەیانهەوێ بەم کارە کاریگەری دابنێنە سەر دەسەڵاتی بەکردەوە کە بۆ دەوڵەت پێویستە هەتا بەجۆرە بتوانن قەوارەی ئابووری کۆن بوونی ناوچەی خۆیان بگۆڕن. هەڵبەت ڕێگاچارەیەکی بە تەواوی ناوچەیی لە هەمان سەرەتادا جێبەجێ نەکراو دەهاتە بەرچاو، چونکە پایتەختی ئەم وڵاتە(برۆکسل) لە ناوچەی فلاندرییەکانی هۆڵەندی زماندا هەڵکەوتووە، لە حاڵێکدا ٨٥٪ حەشیمەتەکەی فەرەنسی زمانەکانی پێکیدێنن. سەرەڕای ئەمەش کۆمەڵگای ئەڵمانی زمانەکانی برۆکسل ـ هەرچەند لەڕووی چەندییەوە گەورە نین ـ تێکەڵی ناوچەی ڤالۆنییەکان دەبن.

لە بەلجیکا بۆ چارەسەری قەیرانی زمانی و قەومی، ڕێگای فیدرالیستیبیان گرتووەتە پێش، بە جۆرێك کە بەدوای چەندی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی(١٩٧٠، ١٩٨٠،١٩٩٣) ئەم وڵاتە لەئاکامدا بە سێ ناوچەی فلاندەرییەکان، ڤالۆنییەکان و برۆکسل و لە هەمان کات دا بە سێ کۆمەڵگای زمانی فێلیمی، فەرەنسی ئەڵمانی دابەشکرا. ئەم ناوچانە دەسەڵاتی پەیوەندیدار بە هەرێمی خۆیان پێدرا ( بۆ وێنە پەرەپێدانی شوێنەکان شارسازی، پاراستنی سروشت و شوێنی ژیان و بیناسازی). لە حاڵێکدا کۆمەڵگای زمانی ئەرکی پەیوەندیدار بە تاکەکانی گرتووەتە ئەستۆ (وەك فەرهەنگ، پەروەردە و فێرکردن، رایەڵگەی تەندروستی). بۆ هەر یەك لەم یەکانەی دابەشکردنی وڵات(ناوچەکان لەلایەك و کومەڵگای زمانی لەلایەکی دیکە) ئورگانەکان و دامەزراوەی جیاواز دامەزرێندرا.

( دامەزراوەکانی ناوچەی فێلیمییەکان تێکەڵ بە یەکبوون، لەحاڵێکدا ناوچەی ڤالۆنییەکان ئەم ڕێگایەیان نەگرتە پێش). دەوڵەتی ناوەندی ڕۆڵێکی گرنگی گرتە ئەستۆ، بەشێکی زۆری باجەکان دەچێتە خەزینەی دەوڵەتەوە. سەرەڕای ئەمەش دەوڵەتی فیدراڵ بەرپرسی دابینکردنی کۆمەڵایەتیش بووە. ئەو لەم ئەرکەیدا بودجەیەکی زۆر لە باکووری پەرە گرتووە دەستێنێ و دەینێرێتە باشووری کەم داهات

و هەژار، شتێك كە باسێكی زۆری لێكەوتەوە. كاتێك كە سیاسەتمەدارانی فێلیمی هۆڵەندی زمان كە لەڕووی ماڵییەوە بەهێزبوون خوازیاری خودموختاری بەربلاوتری ماڵی بۆ ناوچەی خۆیان بوون، سیاسەتمەدارانی ڤالۆنی فەرەنسی زمان كە لەڕووی ماڵییەوە هەژارن ئەوەیان بە هێرش بۆسەر توانایی ژیانی ناوچەی خۆیان دەزانی.

بەلجیكا نموونەیەكی فیدرالیزمی ناكۆجێ نیشاندەدا. بۆ لە چوارچێوە دانانی یاسایی و كۆنترۆڵ و ڕێنوێنی دیموكراسی ململانێ قەومی نێوان فێلیمییەكان و فەرەنسی زمانەكان، فیدراڵیزەكردنی سیستمی سیاسی كە پێشتر ناوەندگەرا بوو پێویست بوو، بێجگە لەم حاڵەتە هەڵوەشانەوەی ئەم وڵاتە مسۆگەر دێتە بەرچاو. هێشتاش ئەم ڕاستییە كە لەم وڵاتەدا تەنیا حیزبی نەتەویی ـ ناوچەیی هەن نە حیزبی سەرتاسەری ، سیستمی فیدراڵی لەگەڵ چەندین مەترسی ڕووبەڕوو كردووە. تەنانەت حكوومەتی ناوەندیش لەلایەن حیزبە ناوچەییەكانەوە پێكدێ. ململانێ زمانی و قەومی پێشتر لە چوارچێوەی حیزبە سەرتاسەرییەكان چارەسەر دەكرا، لەحاڵێكدا ئەمڕۆ ئەم ململانێیانە بۆتە هۆی ئاڵۆزی نێوان حیزبە ناوچەییەكان كە هاوپەیمانی سیاسی حكوومەتی پێكدێنن. بەم ئاماژەیە یەكپارچەیی خاكی وڵات (لانی كەم ئێستا) نەكەوتووەتە مەترسییەوە، كێشەی چارەسەرنەكراوی برۆكسل، پێشی بە هەڵوەشانەوەی وڵاتی بەلجیكا گرتووە.

## هیند(١٩٥٠)

یاسای بنەڕەتی فیدراڵی هیند(١٩٥٠) كە كەمێك پاش وەرگرتنی سەربەخۆیی ئەم وڵاتە لە كۆلۆنیالیزمی بەریتانیا(١٩٤٧) پەسەند كرا، كە بنەڕەتیترین ئەسڵەكانی خۆی لە "یاسای بنەڕەتی هیند"[٨] (١٩٣٥) ئیلهامی وەرگرتووە كە ئەمەش بە پێڕەوی لە " یاسای ئەمریكای باكووری ئینگلیز زمان" لە ساڵی ١٨٦٧ نووسراوە كە بوو بە بنەمای پێكهاتنی فیدارسیۆنی كەنەدا.[٩] بۆ زۆربەی پەرلەمانی دامەزرێنەران ئاشكرابوو كە وڵاتێكی ئەوتۆ بەربلاو، بە جۆراوجۆری زمانی و دینی بەرفراوان و بە ناوچەگەلێك كە خاوەنی ناسنامەی تایبەتی مێژوویی خۆیانن، تەنیا دەتوانن بە



سیستمێكی فیدراڵی لەسەر پێ ڕاوەستن. هیند خۆی وەك وڵاتێكی سیكولار(غەیرە دینی) ناساندووە و دەناسێ. ئازادی بەڕێوەبردنی ڕێ و ڕەسمی دینی لایەنگیرانی یەكەیەكەی ئایینەكان لە یاسای بنەڕەتیدا گرەنتی كراوە. لە مەودای نێوان ١٩٥٦ و ١٩٦٦ سنووری پارێزگاكان لەڕووی زمانییەوە نەگونجاوبوون كە ئاسەواری دابەشكردنی وڵات لە سەردەمی دەسەڵاتی داگیركەراندا بوو گۆڕانی بەسەردا هات و سنوورەكانی بەپێی ناوچەكانی زمانی كێشران، بە جۆرێك كە نیشتەجێبووانی هەر پارێزگایەك بەیەك زمان قسەیان دەكرد.

بەشێوەی فەرمی و ئاشكرا یاسای بنەڕەتی هیند زۆر سانترالیستی نووسراوە، تا جێگایەك كە هەندێك لە نووسەران باس لە سیستمی نیمچە فیدراڵی هیند دەكەن. بە "یەكیەتییەكان" واتە بە دەوڵەتی فیدراڵ، زۆرترین و گرنگترین دەسەڵاتی پێ بەخشراوە كە گرنگترینیان باجە. سەرەڕای ئەمانەش دەسەڵاتی تایبەتی سەرۆك كۆمار پێگەی دەوڵەتی فیدراڵی بەرانبەر بە دەوڵەتە هەرێمییەكان زۆر زەق كردۆتەوە. سەرۆك كۆمار بە پشت بەستن بەم مافە تایبەتییە ــ ئەگەر فەرمانداڕێك كە خۆی دیاریكردووە، ئاگاداری بكاتەوە كە ڕێوشوێنی یاسای بنەڕەتی لە هەرێمێكی دیاركراودا خراوەتەوە ژێر پێ ـ بە ڕاسپاردنی سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیران تەواوی ئۆرگانە دەوڵەتییەكانی ئەو هەرێمە (بێجگە لە دادگاكان) هەڵدەوەشێنێتەوە و دەسەڵاتی ئەوانە دەدرێتە ئۆرگانی دیكە وەك فەرماندار. هەتا كۆتایی ساڵی ١٩٦٠ ئەم مافە زۆر بە كەمی كەڵكی لێ وەردەگیرا، بەڵام ئەم حاڵەتە كاتێك گۆڕدرا كە حیزبی كۆنگرە كە تا ئەو كات هەم لە ئاستی فیدراڵ و هەم لەهەرێمەكاندا هێزی دەسەڵاتدار بوو، زۆرینەی خۆی لەدەستدا، بەشێوەی فەرمی ڕاگەیەندرا كە بۆ بەرەبەرەكانێ لە گەڵ مەترسی"پارچە پارچەكردن" و پێویستی پاراستنی یەكپارچەیی خاكی وڵات "، بەڵام لەڕاستیدا بە هۆی شكستی حیزبی كۆنگرە، سەرۆك كۆمار ـ بە پێشنیاری ڕەت نەكراوەی سكرتێری گشتی حیزبی كۆنگرە و سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئەوكات، ئیندرا گاندی ـ تەنیا لە نێوان ١٩٦٦تا ١٩٧٧، (٣٩) حكوومەتی

هەرێمی لەسەر کار لابران، ئەم ژمارەیەك تا ساڵی ١٩٩٥ گەیشتە ٩٥. بارودۆخی ئاڵۆزی سیاسی لە هێندێك لە هەرێمەکان بە دەستێوەردانی دەوڵەتی ناوەندی ئاڵۆزتریش دەبوو و پرۆسەی ئاسایی گەشەی حیزبەکان و سیستمی حکوومەتی ناوچەیی تووشی کێشە دەبوو.

ئێستا بە کردەوە سیستمی حیزبی لەم وڵاتەدا بووەتە ناوچەیی، دەسەڵاتی بێ سنووری حیزبی کۆنگرە لە ژمارەیەکی بەرچاو لە هەرێمەکان شکستی خواردووە، حیزبە ناوچەییەکان توانیویانە بۆ خۆیان بە دەسەڵات بگەن. تەنانەت کاستەکانی خوارەوەی کۆمەڵگاش دەستیان کرد بە ڕێکخستنی خۆیان لە رووی سیاسییەوە و شتێك کە زۆرجار بووەتە هۆی پێکهاتنی پێکدادانی توندوتیژیش. نموونەیەکی مەترسیدار پارێزگای پەنجابە کە گرووپێکی شەڕخوازی بەستراوە بە کۆمەڵگای دینی سیکەکان لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ سەربەخۆیی خەبات دەکەن، ئەم ململانێیە کاتێك بەوپەڕی خۆی گەیشت کە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئەم وڵاتە، ئیندرا گاندی، لە ساڵی ١٩٨٤ فەرمانی پەلامار بۆ سەر بنکەی ناوەندی تیرۆریستەکانی سیکی لە پرستگەی زێڕینی ئەمریستار دەرکرد. وێران کردنی پرستگەی سیکەکان، تیرۆری ئیندراگاندی کە دوابەدوای ئەو روویدا و کۆشتاری سیکەکان لەلایەن هیندوەکان و لەلایەن سیکەکانەوە نەفرەتی ئەم دوو گرووپە دینییەی زیاد کرد. هەندێك لە چاودێران لەم هەوراز و نشێوە سیاسییە کە لە هندێك لە پارێزگاکان روویدا پێیان وایە کۆتایی بەرەبەرەی سیستمی فیدراڵییە. لە حالێکدا هێندێکی دیکە لە خاوەن رایان پێیان وایە کە تەنیا سیستمێکی فیدراڵی دەتوانێ پارێزگا ئاڵۆزەکان لە پارێزگا سەقامگرتووەکان جیا بکاتەوە، بەمجۆرە یەکپارچەیی خاکی وڵات بپارێزێ.

وێکچوونەکان و جیاوازییە سەرەکییەکانی فیدراڵییە هەڵبژێردراوەکان. لایەنی دیاری سیستمە فیدراڵییەکان کە لە سەرەتای ئەم وتارەدا ئاماژەمان پێ کرد، لە هەرکام لە فیدراسیۆنە هەڵبژێردراوەکاندا جیاوازن. ئەم جۆراوجۆرییە لەم بەشەدا بە یارمەتی سێ پێوانەی گرنگی خوارەوە نیشاندەدرێ. دەسەڵاتی دیارکراو بۆ



هەرێمەکان، ئازادی بە کردەوەی ئەوان لەڕووی ماڵییەوە و رۆڵی نوێنەرایەتی ئەوان لە ئاستی فیدراڵدا. لە پەیوەندی هەریەك لەم چەمکانە ئاماژەیەکیش بە سیستمی فیدراڵی لە نەمسا دەکەین.

دابەشکردنی بەرپرسایەتییەکان لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵ و دەوڵەتە هەرێمییەکاندا نێوەرۆك و هۆکاری هەر فیدراسیۆنێك بریتییە لە دابەشکردنی ماف و ئەرکەکانی دەوڵەتی لە نێوان ئاستە جیاوازەکانی حکوومەتیدا، ئەو ئەرکانەی کە دەگەڕێتەوە بۆ قازانجی هاوبەشی تەواوی کۆمەڵگا، دەوڵەتی فیدراڵ بەڕێوەی دەبا، لە حالێکدا ئەو ئەرکانەی کە بۆ قازانجی ناوچە جیاوازەکان دەگەڕێتەوە هەرکام لە حکوومەتەکانی ئەم ناوچانەی بەڕێوە دەبەن. سەرەڕای ئەمەش، هێندێك لە یاسا بنەڕەتییەکانی وڵاتانی فیدراڵ، بۆ نموونە لە ئەمریکا، ئەڵمان و هیند(دیارە نە لە نەمسا) خاوەنی میکانیزمی " یاسادانانی کێبڕکێ"ن کە بەو پێیە هەرێمەکان دەتوانن ڕێ و شوێنی یاسایی داڕێژن، ئەگەر لەو پەیوەندییەدا یاسای فیدراڵ لە ئارادا نەبێ یان پەڕلەمانی فیدراڵ لە مافی خۆی بۆ داڕشتنی ئەم یاسایانە کەڵکی وەرنەگرتبێ و ئەوانە بخاتە ئەستۆی خودی هەرێمەکان. لە زۆربەی فیدراسیۆنەکان دا ئاستی فیدراڵ بەرپرسی یاسادانان لەوانە لە بوارەکانی پەیوەندی دەرەوە، دیفاع، ئابووری گەورە و ڕێگاوبانن و دەوڵەتە هەرێمییەکان مافی یاسادانان لە کاروباری کۆمەڵایەتی، پەروەردە و فێرکردنیان هەیە. بەراوەردێکی سیستماتیك نیشانیدەدا کە نەمسا لە پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی یاسایی هەرێمەکان لە فیدراسیۆنەکانی دیکە زۆر لە دواوەیە. ئەگەر ئاستی ئیداریش بخەینە ناو بەراوەردەکانی خۆمانەوە، لاوازیی دەسەڵاتی یاسادانانی هەرێمەکان لە سیستمی فیدراڵی نەمسا تاڕادەیەك قەرەبوو دەکرێتەوە، لە هێندێك لە فیدراسیۆنەکانی ئینگلیز زمان (بۆ وێنە ئەمریکا) هەر کام لە دوو ئاست، واتە هەم ئاستی فیدراڵ و هەم هەرێمەکان هاوکات هەم خاوەنی دەسەڵاتی یاسادانان بوون و هەم خۆیان بەرپرسیارەتی بەڕێوەبردنی ئەم یاسایانەیان لەسەر شان بووە، شتێك کە وەك فیدرالیزمی دوو

چەشن باسی لێ دەکرێ، بەڵام لایەنی دیاری فیدراسیۆنەکانی ئەورووپایی( سویسرا، ئەڵمان و نەمسا بێجگە لە بەلجیکا) ئەمەیە کە بەشێکی گەورە لە یاساکانی فیدراڵ لە لایەن ئیداراتی هەرێمی یان کانتۆنی بەڕێوەدەچێ. هەر بۆیە هەردوو ئاست ناچارن هاوکاری یەکتر بکەن کە "فیدرالیزمی کوپراتیو"(یان هاوکاری) پێ دەڵێین، لە کردەوەدا بەڵام جیاوازی لە نێوان ئەو فیدراسیۆنانەدا زۆر بەرچاو نییە، چونکە تەنانەت لە ئەمریکاش پێویستی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئاستە جۆراجۆرەکانی حکوومەتی ناچار بە هاوکاری دەکا.[١٠]

## سەربەخۆیی دارایی دەوڵەتەکانی ئەندام

بۆ هەمووان روونە کە پارە هەموو شتێك نییە، بەڵام بە بێ پارەش زۆر لە کارەکان ناچێتە پێش. ئەم مەسەلەیە لە فیدرالیزمیش دا راستە. بەخشینی دەست و دڵ ئاوەڵانەی بەرپرسیایەتییەکان و ئەرکەکان بە هەرێمەکان بێ مانا و بێ کەڵك دەبێ، ئەگەر سەرچاوەی دارایی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان لەبەردەستیاندا نەبێ. بەراووردی فیدراسیۆنەکانی هەڵبژێردراو جیاوازی زۆری لەڕووی مافی دارشتن و وەرگرتنی باجەکان، هەروەها لەڕووی بەستراوەیی ئەوان بە یارمەتییە دەوڵەتییەکان و قەبارەی ئەم یارمەتییانە بە وان (کە لە پێناوی پاراستنی هاوسەنگی ماڵی وڵات بەڕێوەدەچێ) ئاشکرا دەکا. بەراووردی ئەو وڵاتانەی ئاماژەمان پێکردووە دەری دەخا کە نەمسا زۆرترین رێژە لە یارمەتییەکانی فیدراڵ دەداتە هەرێمەکان و بەمجۆرە هەرێمەکانی ئەم وڵاتە بەزۆرترین رێژەش بەستراوە بە یارمەتییەکانی دەوڵەت (بڕوانە خشتەی هەڵکەوتی دارایی هەرێمەکانی وڵاتە هەڵبژێردراوەکان) ئەمە بۆ خۆی بە تەنیایی ئاماژەیەکە بۆ لاوازی سیستمی فیدراڵی لە نەمسا.



**هەڵکەوتەی دارایی ئاستە جیاوازەکانی فیدراڵیستە هەڵبژێردراوەکان**

| وڵات | بەشی تێچووەکانی دەوڵەتی فیدراڵ بە نیسبەت تەواوی تێچووەکانی وڵات | ڕێژەی یارمەتییەکانی دەوڵەتی فیدراڵ بە هەرێمەکان بە نیسبەت تەواوی داهاتی هەرێمەکان(٪) |
|---|---|---|
| ئەمریکا(١٩٩٤، ١٩٩٦) | ٦١,٢ | ٢٩,٦ |
| سویسرا (١٩٩٥) | ٣٦,٧ | ١٨,٩ |
| ئەڵمانیا (١٩٩٦) | ٤١,٢ | ١٨,٣ |
| هیند (١٩٩٤) | ٥٤,٨ | ٣٩,٤ |
| نەمسا (١٩٩٥) | ٦٨,٨ | ٤٣,٨ |

تێبینی: لە سەرچاوەی ئاماژە پێکراودا بۆ بەلجیکا ئامارێك نەنووسراوە(سەرنج بدەنە سەرچاوەی ژمارە(٢)

دیارە لێرەدا دەبێ بڵێین کە بەشێکی زۆر لەم یارمەتییانە بە مەرج و بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەگەلی دیاریکراو بەڕێوەدەچێ نەبۆ دابین کردنی هەزینەی (تێچوو)ی دەوڵەتە هەرێمییەکان. لە ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٦، ١٠٠ لە سەدی ئەم یارمەتییانە، لە سویسرا لە ساڵی ١٩٩٥، ١/٧٣ لەسەد، لە ئەڵمانیا لە ١٩٩٦، ٦٤/٥لە سەد رۆڵێکی وایان بووە. ئەمە بۆخۆی بووەتە هۆی کەمکردنەوەی ئاوازی کردەوەی ئەم هەرێمانە، هەرچەند ئەو هەرێمانەی کە بنەمای ماڵی و ئابووری لاوازیان هەیە رێگایەکی دیکەیان نییە.

## پێکهاتە و پێگەی نوێنەرایەتی هەرێمەکان لە ئاستی فیدراڵدا

"پەرلەمانی دووەم" وەك نوێنەرایەتی هەرێمەکان لە ئاستی فیدراڵدا، تایبەتمەندییەکی سیستمەکانی فیدراڵە کە لە رێگای ئەوەوە بەرژەوەندی ناوچە و هەرێمە جیاوازەکان لە هەمان سەرەتای نووسینی یاساکانی فیدراڵ

لە بەرچاو بگیرێ.[١١] لەنێوان ٢٤ وڵاتی ئاماژە پێکراو ( بێجگە لە دورگەکانی سانکت کریستۆفرونویس، میکرونزی و ئیماراتی یەکگرتوی عەرەبی) فیدراسیونەکانی

دیکه خاوەنی پەرلەمانێکی ئەوتۆن. بەپێی ئەندێشەی بەناوبانگ ئابەسییە[١٢]، لە ڕۆژەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا، ئەگەر پەرلەمانی دووەم"(کە نوێنەری ناوچە جیاوازەکانی وڵاتە) لە گەڵ "پەرلمانی یەکەم" پەرلەمانی فیدراڵ کە نوینگەی ئیرادەی تەواوی خەڵکی وڵاتە، جیاوازی زۆربێ، لەڕووی دیموکراسیەوە زیانی هەیە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەکتر بەتەواوی هاوڕابن، زیادییە. پێکهاتە و پێگەی پەرلەمانی دووەم لەم وڵاتە بۆ ئەو وڵاتە جیاوازە و ئەمە ڕێژەی وەرگرتن و کارابوونی کۆڵەکەکانی سیستمی فیدراڵی لەم وڵاتە ئاشکرا دەکا. ئەگەر ئەم وڵاتە هەڵبژێردراوە لەم بوارەوە بخەینە ژێر زەرەبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەندامانی پەرلەمانی دووەم لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە هەڵبژێردراون: لە سویسرا و ئەمریکا ئەوان ڕاستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن، لە نەمسا و هیند ئەوا پەرلەمانە هەرێمییەکانن کە ئەوان هەڵدەبژێرن، لە ئەڵمان ئەم ئەندامانە لە لایەن حکوومەتە هەرێمییەکانەوە دەنێردرێنە ئەم ئۆرگانانە، بەلجیکا مودێلێکی تێکەڵاوی هەیە. تەنیا لە ئەمریکا و سویسرا هەرکام لە هەرێمەکان و کانتونەکان وەك یەك نوێنەر دەنێرنە ئورگانی ئاماژە پێکراو، لە حاڵێکدا لە فیدراسیۆنەکانی دیکە حەشیمەتی هەرکام لە هەرێمەکان بۆ دیارکردنی ژمارەی ئەندامانی چارەنووسسازە. تا ئەو جێگایە بۆ پێگەی یاسایی پەرلەمانی دووەم دەگەڕێتەوە، تەنیا لە ئەمریکا و سویسرا کە ئەم پەرلەمانە هاوشانی پەرلەمانی فیدراڵە، بەم مانایە کە تەنانەت کاتی پەسەندی یاسای ساکاریش، وەرگرتنی ڕەزامەندی هەردوو پەرلەمان پێویستە. لە سێ فیدراسیۆنی دیکە پەرلەمانی دووەم تەنیا کاتی پەسەند ڕێ و شوێنی یاسایی بنەرەتی و بەشێك لە یاسای ساکاری فیدراڵ مافی ڤیتۆی هەیە و لە باقی حاڵەتەکاندا تەنیا مافی ڤیتۆی بۆ وەدواخستنی پەسەندی یاساکان هەیە. ئەنجوومەنی هەرێمەکانی نەمسا تەنیا خاوەنی مافی ڤیتۆ بۆ وەدواخستنی پەسەندی یاسایە، بەجۆرە لە نێوان وڵاتانی ئاماژە پێکراو ئەم وڵاتە لاوازترین پێگەی سیستمی فیدراڵی هەیە. شتێك کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لێرە و لەوێ دەنگگەلێك بۆ بردنەسەری پێگەی ئەم ئورگانە، یان هەڵوەشانەوەی بەرزبێتەوە.



## سیستمە فیدراڵییەکان لە بواری نێونەتەوەییدا

تێکەڵبوونی فیدراسیۆنەکان لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا بە ئاڵۆزی پەیوەندی ئاستە جۆراوجۆرەکانی فیدراڵ لە نێوخۆی وڵاتانی فیدراڵدا زیادکردووە. ئەڵمان، بەلجیکا و نەمسا ئەندامانی یەکیەتی ئەورووپان، ئەمریکا هاوڕێ لەگەڵ مەکزیك و کەنەدا لە ساڵی ١٩٩٢ ناوچەی ئازادی بازرگانی باکووری ئەمریکا، "نافتا" یان پێکهێنا، هیند پەیوەست بە یەکیەتی باشووری ئاسیا بۆ هاوکاری ناوچەیی (SAARC) کە لە ساڵی ١٩٨٥ پێکهاتووە. دیاریکردنی دەسەڵاتی هەرێمەکان و فیدراڵ بەم ڕێکخراوە ناوچەییانە، هەروەها بوونی هەلی پەیوەندی هەرێمەکان و ناوچەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە ناوچەییانە (بۆ نموونە لە ئەڵمان و نەمسا) بووەتە هۆی هاتنە گۆڕێ باسگەلێك لە پەیوەندی لەگەڵ دابەشکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی لەنێو وڵاتدا. سویسرا بەهۆی نیگەرانی لە کەوتنە ژێرگاریگەریی پێکهاتەکانی فیدراڵی خۆی لە چوونی بۆ یەکیەتی ئەورووپا خۆی پاراست. لە هەمان حاڵدا یەکیەتی ئەورووپا مەیلی فیدراڵیستی لە خۆی نیشاندەدا. ڕێکەوتنی پێشووی حکوومەتە نەتەوەییەکان ـ بەتایبەت لە بواری سیاسەتی پێکهاتەیی و ناوچەیی ــ جێگای خۆیان لەم یەکیەتییەدا بە سیستمی چەند ئاستی غەیرە هەرەمی، گونجاو و سەقامگیردا. بەپێی ئەسڵی "هاوکاری"(PARTNERSCHAET) بۆ ئامادەکردن و بەڕێوەبردنی پرۆگرامەکانی یەکیەتی ئەورووپا، هەروەها کاتی بڕیاردانەکان، بەتایبەت نوێنەرانی ناوچە هەرێمە جیاوازەکان دەنگیان هەیە و هەر ئەمە دەبێتە هۆی چوونە سەری پێگەی ئەوان لە قەوارەی فیدراڵیستی وڵاتانی پەیوەندیدار.

# دەرەنجام

فیدراڵ هاوسانی فیدراڵ نییە. جۆراوجۆری سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەم سیستمانە، هەمەچەشنی بارودۆخی سیاسی ـ فەرهەنگی رەوتی ئەم سیستمانە و جۆرە جیاوازەکانی ئەم سیستمە فیدرالیستیانە پۆلێن بەندی جێگای بایەخ و پەسەندی هەموولایەکی ئەم سیستمانە ئاڵۆز دەکا ـ وڵاتێك کە پەیوەندی لەگەڵ پێوانەیەکی دیارکراودا لە "پێشەوە"ی رێزدایە، رەنگە بە لەبەر چاوگرتنی پێوانەیەکی دیکە بە تەواوی لە "دواوە" بێ.[13] بە هەمان ئەندازە هەڵەیە ئەگەر ئەو هەڵسەنگاندنانە کە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکان، خاڵی لاواز و بەهێزی وڵاتێکی دیارکراوی فیدراڵیستی هەیە پەیوەندی بە هەموو وڵاتانی فیدراڵیستی بدەینەوە. بەڵکۆ دەبێ بە پێی ئەم رێکەوتننامەیە کە خاڵی بەهێز و لاواز دەگرێتەوە بۆ جۆرێ سیستمی فیدرالیزم لەو وڵاتەدا نە بەخودی فیدرالیزم.

سەرەڕای ئەمانەش نابێ سیستمی فیدراڵی وشك و نەگونجاو تێبگەین، بەڵکو وەك سیستمێکی سەقامگیر و راوەستاو چاولێبکەین کە توانایی خۆ رێکخستنی لەگەڵ بارودۆخی زاڵدا هەیە. جۆرێکی تایبەت کە لەم سیستمە پیادەبووە و رێژەی فیدراڵییەکەی لە هیچ وڵاتێکدا هەموو کاتێك یەکسان نەبووە، بەڵکو بەسەرنج دان بە جۆر و هاوسەنگی هێزە سیاسییە دەسەڵاتدارەکان دەگۆردرێ. ئەگەر بمانەوێ بەو جۆراوجۆرییە لە کۆمەڵگادا و بە پێناسەی ناوچەییەکەی هەڵوێستی شیاومان هەبێ، فیدرالیزم ئەسڵی لە باری رێکخستنی کۆمەڵگا و دەوڵەتە. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوەی کە وتراوە، فیدرالیزم لە پلەی یەکەمدا وەك کۆسپی ئیرادەی سیاسی زۆرینەی کۆمەڵگا یان هۆکارێك بۆ کەمکردنەوەی کار لێهاتوویی کردەوە سیاسی و ئابوورییەکان (٢٤) چاو لێ بکەین، پێکهاتەکانی فیدراڵیستی بەرەو دواوە پاڵ پێوەدەنرێ.



**خشتەی ژمارە ١**

دانیشتوان، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و دابەشکردنی وڵات لە چەند فیدراسیۆندا

| وڵات | پانتایی (بەکیلۆمەتەری چوارگۆشە) | دانشتوان(بەملیۆن) | زمانەکان | ئایینەکان | دابەشکردنی وڵات |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەمریکا | ١٥٥ | ٢٦٧,٦ | ئینگلیزی، ئیسپانیایی | ٢٦,٠٪ کاتۆلیك<br>١٦,٠٪ باپتیست<br>٦,٠٪متدیستەکان<br>٣,٧٪لوتری<br>٢و٢٪جولەکە | ٥٠ هەرێم ٧ بەشی تایبەتی ١٣٠ ناوچەی سوورپێستەکان |
| سویسرا | ٤١,٢٨٤ | ٧,١ | ٦٣,٧٪ئەڵمانی<br>١٩,٢٪ فەرەنسی<br>٧و٦٪ئیتالیایی<br>٠,٦٪ تورومانی | ٤٦,١٪کاتۆلیك<br>٤٠,١٪ پرۆتستان<br>٢و٢٪موسلمان | ٢٠ کانتۆنی تەواو<br>٦ نیوە کانتۆن |
| ئەڵمان | ٣٥٧,٠٢٠ | ٨٢,١ | ئەڵمانی | ٣٤,١٪پرۆتستان<br>٣٣,٤٪ کاتۆلیك | ١٦ هەرێم |
| بەلجیکا | ٣٠,٥٢٨ | ١٠,٢ | ٥٧,٠٪هۆڵەندی<br>٤٢,٠٪فەرەنسی<br>٠,٦٪ ئەڵمانی | ٨١,٥٪کاتۆلیك | ٣ ناوچە<br>٣کۆمەڵگای زمانی |
| هیند | ٣,٢٨٧,٣٦٥ | ٩٦٢,٤ | ٣٦٪هیندی<br>١٧ زمانی فەرمی دیکە | ٨٠,٣٪هندو<br>١١,٠٪ موسلمان<br>٢,٤٪ مەسیحی<br>١,١٪سیك | ٢٥ هەرێم<br>٧ یەکیەتی ناوچەیی |
| نەمسا | ٨٣,٨٥٨ | ٨,١ | ٩٢,٣٪ ئەڵمانی | ٧٨,٠٪کاتۆلیك<br>٥,٠٪پرۆتستان<br>٢,٠٪موسلمان | ٩ هەرێم |

1- WEBER, KAARL: KRITERIEN DES BUNDESSTAATES EINE SYSTEMATISCHE, HISTORISCHE AND RECHTSVERGLEICHENDE UNTERSUCHUNG DER BUNDEESTAATLICHKEIT DER SCHWEIZ, DER BUNDESREPUBLIK DEUSTSCHLAND UND OSTERREICH. 1980,5.26

2- WATTS.RONALD L: COMPARING. FEDERAL SYSTEMS. KINGSTON ONTARIO 1944.5.7

3- SCHULTZE, RAINER- OLAF: FODERALISMUS IN: NOHIEN. DIETER(HG): LEXIKON DER POLITIK. BD.3.DIE WESTLICHEN LANDER(HG.VAN MANFRED .SCHMITT), MUNCHEN 1992, S.95-110

4- LASLOVICH MICHL J: THE AMERICAN TRADITION: FEDERALISM IN THE UNITED STATESIN: BWGESS, MICHAEI/GAGNON ALAN G (HG) COMPARATIVE FEDRALISM AND FEDRATION. COMPTING TRADITIONS AND FUTURE DIRECTIONS. NEW YORK V.A1993.S 187-202 WALTS, WOLFANG.DIE BUNDESSTAATLICHE STRUKTUR. IN:JAGER S:WALFGANG/ WELZ, WOLFGANG (HG): REGIERUNGEEYSTEM DER USA. LENR-UND HAND BUCH MUNCHEN-WIEN 1998.S.80-108

5- F REIBURGHAUS. DIETER: DIE SCHWIZ- EIDUENOSSISCHER FODERALISMUS ODER DIE UNGLEICHHEIT DER LEBENSVER HALTNISSE IN: EUROPAISCHES ZCHTRUM FUR JOURNLISUS FORSCHUNG TUBINGEH (HY): JAHRBUCH DES FODERALISMUS 2000 FODERALISMUS. SUBSIDIARITAT UND REGIONEN IN EUROPU. BADEN- BADEN 2000,S. 292- 307



6 – MUNCH, URSULA: ENTWICKLUNG UND PERSPEKTIVEN DES DEUTSCHEN FODERSLISMUS. IN: AUS POLITIK UND ZEITGESCHHS\CHTE. BELAGE ZUR WOCHENZEITUNG DAS PARLAMENT. B 13/99,26.

7- DESCHOUWER. KRIS: BELGIEN- EIN FODERLISTAAT AUF DER SUCH RACH STSBLIITAT. IN EURAPISCHES ZENTRUM FUR FODERALISMUS- FORSCHUNG TUBINGEN (HG):JAHRBUCH DES FODERALISMUS 2000, FODERALISMUS, SUBSIDIARITUT UND REGIONEN IN EUROPA BADEN 2000,S.97-119

8- GOVERNMENT OF INDIA ACT.

9- CHARITON, SUE ELLEN M: COMPARING ASIAN POLITIS.INDIA AND JAPAN. BOULDER/ COLORADO 1997,S.168PP, 206PP, RAJASHEKARA, H.M: THE NUTURE OF INDIAN FEDRALISM.A. CRITIQUE. IN:ASIAN SURREY37 (1997),3.S.245- 253

10- HAGU, ROD/ HARROP, MARTIN/BRESLIN. SHAUN: COMPARATIVE GOVERNMENT AND POLITIS. AN INTRODUCTION HOUND MILLIS/ BASINGSTOCKE 1998.S.173.

11- WATTS, RONALD L:COMPARING FEDERAL SYSTEMS. KINGSTON/ONTARIO 1992,S.92 PP; RIESCHER. GISELA/ RUB, SABINE/ HAAS, CHRISTOPH M. (HG): ZWEITE KAMMERN. MUNCHEN WIEN 2000.

12- ABBE SIEYES

13- Lane, Jan-Erik/Ersson, Politics and Society in western Europe. London/Thosend oaks / New Dehli 1999,s. 171 pp 187 p.